ژماره

46

ISSN: 2520 - 4106




# گۆڤاری ئەکادیمیای کوردی

گۆڤارێکی ئەکادیمی و زانستیی وەرزییە

٢٧٢٠ کوردی ٢٠٢٠زاینی

باس و توێژینەوە بڵاوکراوەکان لە گۆڤاری ئەکادیمیای کوردی
دەربڕی بیر و بۆچوونی توێژەرانن نەک دەستەی نووسەرانی گۆڤار


- گۆڤاری ئەکادیمیای کوردی.
- بەرگ و سەرپەرشتیی هونەری: عوسمان پیرداود کواز.
- نەخشەساز: عیسام موحسین نادر.
- هەڵەچن: شێرزاد فەقێ ئیسماعیل، شیلان جەلال، ئیمان نەجات.
- ئیمیل و پەیوەندی: شیلان جەلال – موبایل: ٠٧٥٠٤٩٠٢٠٧٥
- ئیمیل: govary.ak@gmail.com
- چاپ: چاپخانەی زانکۆی سەلاحەددین – هەولێر.

**لەم ژمارەیەدا**

**بەشی کوردی**



**بەشی عەرەبی - القسم العربي**

## ڕێنمایی بڵاوکردنەوە لە گۆڤاری ئەکادیمیای کوردی

- گۆڤـاری ئـەکادیمیای کـوردی، گۆڤـارێکی زانسـتی وەرزییـە، بـاس و توێژینـەوەی زانستی تایبەت بە مەسەلەکانی کـورد و کوردسـتان بـڵاو دەکاتـەوە، بەمـەرجێك لـە هیچ شوێنێکی دیکە بڵاو نەکرابێتەوە یاخود بۆ بڵاوکردنەوە وەرنەگیرابێت.
- زمانی بڵاوکردنەوەی باس و توێژینەوەکان لە گۆڤارەکەدا کوردی و عەرەبییـە، ئـەو باس و بابەتانەش کەوا سەروکاریان لەگەڵ مەسەلەکانی کورد و کوردستان هـەبێت، ئەگەر بە زمانی دیکەش بن، بڵاودەکرێنەوە.
- پێویستە توێژەر لە لاپەڕەی یەکەمی توێژینەوەکەیدا، ناونیشـانی باسـەکەی، نـاو و ناسناوی زانستی، شوێنی کارەکەی، ئیمێڵ و ژمارەی تەلەفۆنی خۆی بنووسێت.
- لــە هەڵبــژاردنی ناونیشــان و نووســینەوەی توێژینەوەکانـدا، پێویســتە ڕەچـاوی بنــەماکانی میتــودی زانسـتی بکرێـت. لەمەسـەلەکانی پەیوەسـت بـە ڕێکخسـتنی سەرچاوە و چۆنیەتی سوودوەرگرتن لێیان، وەکو چۆن پێویسـتە نووسـینی بـاس و بابەتـەکان بـە زمـانێکی زانسـتی شـیاو بێـت، بـە پێچـەوانەوە هـەر توێژینەوەیـەك پێڕەوی لەم بنەمایانە نەکات لە لایەن دەستەی نووسەرانەوە وەلادەندرێت.
- پێویسـتە توێـژەر پوختـەی توێژینەوەکـەی بـە دوو زمـانی دیکـە، جگـە لـە زمـانی نووسـینی دەقەکـەی لـە کۆتـایی توێژینەوەکەیـدا بنووسـێت، بەمـەرجێك لـە یـەك لاپـەڕەی A4 زیـاتر نـەبێت و تیایـدا گرینگـی باسـەکە و ئەنجامـە سـەرەکییەکانی توێژینەوەکەی بخاتە ڕوو.
- هــــەر بــــاس و بابــــەتێك لــــەبارەی ســــاغکردنەوەی (پەیــــدۆزی، تحقیــــق) ی دەستنووســەکانەوە بێـت. پێویسـتە پەیدۆزییەکـە بـە گـوێرەی بنـەما زانسـتییە کارپێکراوەکانی ئەو بوارە ئەنجام بدرێت. هەروەها چەند لاپەڕەیـەکی کۆپیکراو و، زانیاری تەواو سەبارەت بە دەستنووسەکە و شوێنی هەڵگرتنی بخرێتە ڕوو.
- دەبـێ بـاس و بابەتـەکان بـەجۆری فـۆنتی یونیکـورد بنووسـرێن. لەمەسـەلەی بـەکارهێنان و ڕێکخسـتنی سەرچـاوەکان پێـڕەوی لـە شـێوازی هارفـارد بکرێـت. ناونیشـانی بـاس و توێژینـەوەکان بـە فـۆنتی قـەبارە (١٥) بێـت، نـاوی توێـژەر و توێژەران لەگەڵ ناونیشانە لاوەکییەکان بە فۆنتی (١٤) و دەقی باسەکەش بە فۆنتی (١٣) بێت.

- لەکاتی سوود وەرگرتن لەو باس و بابەتانەی کە لە گۆڤارەکاندا بڵاوکراونەتەوە، بەم شێوەیە ئاماژە بە سەرچاوەکەی دەکرێت: ناسناو و ناوی نووسەر، ڕێکەوتنی دەرچوون، ناونیشانی باسەکە، ناوی گۆڤارەکە (لەنێوان دوو کەوانەدا)، ژمارەکەی، شوێنی دەرچوون.
- هەموو باس و بابەتێك بە (٣) دانەی سەرکاغەز و دانەیەکی سەر (CD) پێشکەش دەکرێت، بەمەرجێك ژمارەی لاپەڕەکانی، بە هەموو وێنە و خشتە و سەرچاوەکانەوە لە (٢٥) لاپەڕە تێپەڕنەکات.
- دوا بەدوای پەسەندکردنی هەر توێژینەوەیەك لەلایەن هەڵسەنگێنەرانی پسپۆڕەوە، توێژەر دانەیەك لە نووسراوی پەسەندکردنی توێژینەوەکەی لە لایەن دەستەی نووسەرانەوە پێدەدرێت. لەدوای ئەوە توێژەر بۆی نییە باسەکەی پێشکەش بە هیچ لایەنێکی دیکە بکات، بە بێ نووسراوێکی ڕەزامەندی لە لایەن سەرنووسەری گۆڤارەکەوە.
- دەستەی نووسەران ئەو مافەی دەبێت کەوا هەندێك برگەو دەستەواژەی توێژینەوەیەك لابدات، یا بگۆڕێت و دووبارە دایبڕێژێتەوە تاوەکو لەگەڵ ڕێنماییەکانی بڵاوکردنەوە لە گۆڤارەکە دا بگونجێت.
- چۆنیەتی ڕیزکردنی باس و بابەتەکان پەیوەندی بە ڕێبازی بابەتبەندی گۆڤارەکەوە هەیە نەوەکو بابەت و بایەخی توێژینەوەکان، یاخود پلەو پایەی زانستی توێژەرەوە.
- گۆڤاری ئەکادیمیا ئەو باس و توێژینەوانەی کەوا لە نامەکانی ماستەر و دکتۆرا وەردەگیرێن، واتە (مستل) ن، بڵاوناکاتەوە.
- هەرباس و بابەتێك کە ڕەزامەندی لەسەر بڵاوکردنەوەی نادرێت، بۆ خاوەنەکەی ناگەڕێندرێتەوە.

# پڕاگماتیکی ئیدیەم
# لە زاری کوردی ناوەڕاستدا

**م. ی. ڕزگار ئیسماعیل کەریم**
بەشی زمانی کوردی– کۆلێژی زمان
زانکۆی سەلاحەددین-هەولێر

**م. ی. تەڵعەت محەمەد عەزیز**
بەشی زمانی کوردی- کۆلێژی پەروەردەی ئاکرێ
زانکۆی دهۆك

پێشەکی

**٠-١ : ناونیشانی توێژینەوەکە و بوارەکەی:**

تـوێژینەوەکە بەناونیشـانی "پڕاگماتیکـی ئیـدیەم لە زاری کـوردی ناوەڕاسـت" دایە، واتـە لێـرەدا تـوێژینەوەکە تێڕوانینـی ئیـدیەم لە ڕوانـگەی بوارەکـانی زانسـتی پڕاگماتیک تاوتوێ دەکات .

**٠-٢ : ڕێبازی توێژینەوەکە:**

ئەم توێژینەوەیە لەبەر ڕۆشنایی ڕێبازی (وەسفی- شیکاری) ئەنجامدراوە.

**٠-٣ : سنوور و کەرەسەی توێژینەوەکە:**

سنووری توێژینەوەکە لە چوارچێوەی (زاری کوردی - ناوەڕاست)دایە، تیایـدا لە سـنووری ئاسـتی پڕاگماتیـک و بوارەکـانی ئیـدیەم ڕوونـدەکاتەوە، نمـوونە و کەرەسەکانیش زۆربەیان بریتین لەو ئیدیەمانەی، کە لەنێو ئاخێوەرانی ئەم زارە ڕۆژانە بەکاردێت و هەندێکیشیان لە فەرهەنگدا وەرگیراون .

**٠-٤ : گرنگی و ئامانجی توێژینەوەکە:**

گرنگی توێژینەوەکە لەوەدا خۆی دەبینێتەوە، کە بەشێوەیەکی سەربەخۆ، دوور لەپێکهاتەی ڕێزمانی و سیمانتیکی، لە ئیـدیەم دەڕوانـێ، ئەم ڕوانیـنەش لە ڕوانـگەی بوارەکانی پڕاگماتیک تاوتوێ دەکرێ و لەگەڵ واتاکانی ئیـدیەم یـەك دەگـرنەوە، کە ئەمەش ئامانج و مەبەستی سەرەکی توێژینەوەکە دەردەخات، چونکە توێژینەوەکانی پێشوو لەم بارەیەوە زیاتر بەگشتی لە چوارچێوەی پێکهاتەی ڕێزمان لێی کۆڵراوەتەوە.

**٠-٥ : هۆی هەڵبژاردنی توێژینەوەکە :**

١- بوونی واتای خوازەیی و نـافەرهەنگی لە ئیـدیەم و تێڕوانینـی لە ڕوانـگەی پڕاگماتیکدا .

٢- ڕۆڵ و گرنگی دەوروبەر لە ڕوونکردنەوەی واتاکانی ئیدیەمدا .

**٠-٦ پرسیاری توێژینەوەکە:**

گرنگترین پرسیارەکانی نێو توێژینەوەکە بریتین لەمانەی خوارەوە:

١- ئایا دەتوانرێ پڕاگماتیکییانە لە ئیدیەم بکۆڵدرێتەوە یان نا ؟ چۆن ؟

٢- ئیدیەم وەک ئەرکێکی کۆمەڵایەتی، چۆن لەناو بەکارهێنانی زمان واتاکـانی ڕەنگڕێژ دەکات؟

٣- ماناکانی دەوروبەر چ پەیوەندییەکیان بە چەمکی ئیدیەم و واتاکانی هەیە ؟

**٠-٧ : پلان و پێکهاتەی توێژینەوەکە :**

توێژینەوەکە جگە لە پێشـەکی و ئەنجـام و لیسـتی سـەرچاوەکان، لە دوو بەش پێکهاتووە :

**بەشی یەکەم** : ئەم بەشە تایبەتە بە پەیوەندیی ئیدیەم و واتا ، تیایدا دابەشی سەر ئەم سەردێڕانە کراوە : ( سەرەتا ، چەمک و ناساندنی ئیدیەم، ئیدیەم وەک دانەیەکـی واتایی، سەرچاوەکانی دروستبوونی ئیدیەم، جۆرەکانی ئیدیەم) .

**بەشی دووەم** : ئەم بەشە تەرخانکراوە بۆ چـۆنییەتی پڕاکتیزەکـردنی بوارەکـانی پڕاگماتیـک لە ئیـدیەمی کوردیـدا، لەم ڕوانـگەیەوە بەشـەکە بـۆ سـەر ئەم بـابەت و تەوەرانە دابەشکراوە : (سەرەتا، ئیدیەم و پڕاگماتیک، ئیـدیەم و دەوروبەر، ئیـدیەم و بوارەکانی پڕاگماتیک) ، لە کۆتاییدا پوختەی توێژینەوەکە بە هەردوو زمـانی عەرەبی و ئینگلیزی خراوەتەڕوو .

## بەشی یەکەم
## ئیدیەم و واتا

**١-١ : سەرەتا**

ئاخاوتن وەکو ڕەهەندێکی کۆمەڵایەتی تەنها لە وشەی دەربڕاو و ڕستەی ئاسایی ، کە لەکاتی قسەکردن و گفتوگۆ ڕیزدەکرێن و دەردەبڕێن، پێکنایەت، بەڵکو زۆرجاران بۆ دەوڵەمەندکردن و دەرخستن و لێهاتوویی بەکارهێنانی زمان لەکاتی گفتوگۆکردن و تەنانەت هەندێ جار نووسینیش ، بەمەستی گەیاندنی چڕو قووڵترین مەبەست بە کەمترین یەکەمی زمانی ، پەنا دەبرێتە بەر دەربڕاوی ئامادەکراو لە زمانیدا، کە بە (ئیدیەم) ناسراون (شۆخان عەزیز عومەر: ٢٠١٤ : ٩). واتە، دەکرێ ئاخاوتن بەیەکەی ڕێزمانی جۆراوجۆر، گرینگترینیان (میتافۆر، ئیدیەم) دەوڵەمەند بکرێ و کاریگەری و ڕەنگدانەوەی لەسەر گەیاندنی پەیام بۆ بەرامبەر دروست بکات، جگە لەوەش ئابووریکردن دەهێنێتە کایەوە و فەرهەنگی زمان دەوڵەمەند دەکرێن، ئەمەش لە ڕێگای ئەو واتا تایبەت و شاراوانەی تێیاندا دەردەکەوێ .

**١-٢ : ئیدیەم ( چەمک و ناساندن ) :**

لەبارەی چەمک و ناسینی زاراوەی ئیدیەمەوە،[1] زمانەوانەکان هەریەک لە ڕوانگە و تێڕوانینی جیاوازەوە پێناسەیان کردووە، بەگشتی زۆر لەپێناسەکان لەیەکەوە نزیکن و خاڵی هاوبەشیان زۆرە، بەڵام هەندێ جاریش جیاوازی لە پێناسەکان بەدیدەکرێت ، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی، کە چەمکی ئیدیەم و واتا و ڕەهەندەکانی بەئاسانی خۆی بەدەستەوە نادات. لە خوارەوەش هەندێ لەو بۆچوون و پێناسانە دەخرێتە ڕوو .

سەرەتا پێویستە ئەوە بخرێتە ڕوو، کە لێکدانەوەی ئیدیەم دوو ڕەهەندی هەیە : یەکەمیان بریتییە لە پێکهاتەی زمانی، دووەمیش بریتییە لە پێکهاتەی واتایی. ( زوبێر عەلی قادر : ٢٠١٢: ٢٩). ئەوەی لەم توێژینەوەیە مەبەستمانە لایەنی دووەمە، واتە لە ڕووی واتاییەوە لە ئیدیەم دەکۆڵینەوە، لە نێوانیشیاندا واتای (پڕاگماتیکی).

"دێڤید کریستاڵ" پێی وایە (ئیدیەم) : ((چەمکێکە واتایەکی تایبەتی هەیە، لە ڕێزمان و لێکسیکۆلۆجی بەکاردێت و دەگەڕێتەوە بۆ ئاماژەکردن بە زنجیرەی

وشەکان، کە لە ڕووی سیمانتیکی و سینتاکییەوە سنووردار دەکرێن، بۆ ئەوەی وەک یەک یەکە ئەرک ببینـــین)) (Crystal.D::2008:236) . واتە، لەم ڕوانـــگەیەوە چەمکـــی ئیدیەم لە زنجیرەیەک وشە پێکهاتووە، واتاکانی ئەم زنجیرە وشانەش لە واتـای کەرتە پێکهێنەرەکانندا نییە و واتای تایبەتی خۆی بەپێی بەکارهێنان وەردەگرێ .

"ئەورەحمانی حاجی مارف" هەنـدێ جـار زاراوەی فرێزیۆلـۆجی بەرامـبەر بە (ئیدیەم) بەکارهێناوە و بەم شێوەیە پێناسەی کـردووە : ((کـاتێ لەیەکگرتنـی هەنـدێ وشەدا واتـای تـایبەتی پەیـدادەبێ، ئەوا بەوجـۆرە فرێزانـە دەوترێـت فرێزیۆلـۆجی)) (ئەورەحـمانی حـاجی مـارف : ١٩٨٠ : ٥٧ ) . لێـرەدا واتـای تـایبەتی ئامـاژەیە بـۆ واتـای خوازراو، کە لەدەرەوەی فەرهەنگدا دەبینرێت .

"محەمەد مەعروف فەتاح" یـش لە پێناسـەی ئیدیەمـدا دەڵێـت : ((بـریتییە لەو تێکەڵی و تێکچڕژانەی کە ئاسایی دوو وشە یان زیاتر پێکی دێـنن . ئەو واتـایەی کە دێتە کایەوە لە ئەنجامی ئەو تێکەڵییەوە لە واتای کەرتەکانەوە یان پەیوەندیی ڕێزمانی ئەم کەرتـانە پێشـبینی ناکرێـت (مـحەمەد مەعـروف فەتـاح :١٩٨٦: ٦٢) . واتە؛ ئیـدیەم واتایەکی تێکەڵ و ئاڵۆزی هەیە، ئەم واتایەش لە پەیوەندیی ڕێزمـانی و فەرهەنـگ و کەرتە پێکهێنەرەکـانی بەدی ناکرێـت، بەڵکـو پەیوەسـتە بەواتـای نـافەرهەنگی و دەوروبەر .

هەروەها "فەتاح مامە" لە نامەی دکتۆراکەیـدا بەم جـۆرە ئیـدیەم دەناسـێنێت و دەڵێت : (( بـریتییە لەو دەربڕینـانەی کە لە ڕواڵەتـدا دانەی ڕێزمـانین، بەڵام لەژێـرەوە زڕدانەی واتاسازین، لەسەری ڕێکەوتوون و خۆیان لە زمانـدا چەسـپاندووە)) (فەتـاح مامە: ١٩٩٨: ٣٨). لەم ڕووەوە ئیدیەم لە شـێوەی دانەی ڕێزمـانی وەک : (وشـە ، گـرێ، ڕستە) خۆی دەنوێنێ، بەڵام ئەم دانە ڕێزمانییانە لە ناوەڕۆکدا واتـایین و، واتاکانیشـیان پەیوەستە بە کەلتوور و دەوروبەر و ڕێکەوتنی تاکەکان، کە لەم ڕوانگانە سـەرچاوەی گرتووە .

ئەگەر سـەیری ئەو پێناسـانەی سـەرەوە بکەیـن، دەبینـین زۆربەی پێناسـەکان لەیەکەوە نزیکن و جەخـت لەو ڕەهەنـدە دەکەنەوە، کە (ئیـدیەم) واتاکـانی لەواتـای کەرتە پێکهێنەرەکانی نییە، بەڵکو پەیوەستە بەواتای نافەرهەنگی، ئەمەش لەسروشـتی توێژینەوەکەمان نزیکە.

بەم شێوە دەتوانین بڵێین: ئیدیەم بریتییە لەو دەربڕاوە زمانییەی ، کە لە شێوەی وشەی لێکدراو و گرێ و ڕستە دەبینرێت، هەڵگری پێکهاتەی ڕێزمانی و واتاییە، واتاکەشی لە فەرهەنگ و کەرتە پێکهێنەرەکانی نییە، بەڵکو لەنێو کەلتوور و دەوروبەر و نافەرهەنگی بەدی دەکرێ، ئەم لایەنانەش دەچنە ناو واتای پڕاگماتیک و ڕەهەندی پڕاگماتیکی لە ئیدیەم نیشان دەدەن ، ئەمەش خۆی لەمەبەستی توێژینەوەکە دەردەخات . لەم ڕوانگەیەوە ، ئەگەر تەماشای ئیدیەمەکی وەک (زمان درێژ) بکەین، دەبینین بەمانای ئەوە نایێ، کە کەسێک (زمانی درێژە) ، بەڵکو بەواتای ئەوە دێت، کە ئەو کەسە (زۆربڵێیە)، ئەم واتایەش لە دەوروبەر هەڵێنجراوە .

**١-٣ : ئیدیەم وەک دانەیەکی واتایی:**

ئیدیەم بۆ شیکردنەوەی لایەنی واتا بابەتێکی گرنگە، چونکە واتاکەی بەناڕاستەوخۆیی دەردەبڕدرێت، کە ئەم واتایە لە تۆخمە بنچینەکانییەوە نەهاتووە و زۆر بەهێزە و چەند واتایەک بەپێی بەکارهێنانی بارودۆخی جیاواز لەخۆیدا کۆدەکاتەوە، جگە لە ڕووی واتاییەوە لە بەرامبەر وشە دەوەستێ و یەک یەکەی واتاییە و دەبێتە هێما و ئاماژە بۆ چەمکی نوێ (شیلان عومەر حوسێن :٢٠٠٩ : ٤٩ ) .

بەگشتی واتاکانی ئیدیەم دابەشی سەر دوو جۆر دەبن : واتای بنجی و واتای خوازراو ، ئەوەی کە واتاکەی خوازراوە دوورە لە واتای کەرتەکانییەوە ، ئەوەشی کە شێوەی پیتی هەیە واتاکەی لە کۆی واتای کەرتەکانییەوە دێ (محەمەد مەعروف فەتاح : ٢٠١٠ : ٧٩)[٢] . بۆ نموونە ئیدیەمەکی وەک: (دەستپاک) دەبینین هەر دوو بەکارهێنەری هەیە :

(١) **کوڕم کاتی نان خواردنە دەستت پاک بشۆ** . (واتای بنجی).

(٢) **شنۆ کچێکی دەستپاکە و فێڵ لە کەس ناکا** . ( واتای خوازراو – واتە کەسێکی ئەمینە).

لێرەدا بۆ دەرخستنی لایەنی ئەوەی ، کە ئیدیەم دانەیەکی پڕاوپڕ واتاییە، شیکردنەوەی واتایی هەریەک لە فۆڕمەکانی (ڕستەیی، فرێزیی ، وشەیی ) بۆ ئیدیەم بە پێویست دەزانرێت، جگە لەمەش ئاماژەکردن بە واتایی نێو ئەم فۆڕمانە .

ئیـدیەم لە فـۆڕمی ڕسـتەدا بەواتـایەکی خـوازراو دەردەکەوێ، کە جیـاوازە لە ڕستەیەکی ئاسایی (شیلان عومەر حوسێن: ۲۰۰۹ : ٤۹) ، واتای ڕستەی ئاسـایی بـریتییە لە (واتای فەرهەنگی + کاریگەریی ڕێزمانی) (ئـاوات ئەحـمەد مـحەمەد : ۲۰۰۹ : ۱۱۷) ، بـۆ نموونە ڕستەیەکی وەک :

**(۱) نانەکەی خوارد .**

لە ڕووی واتاییەوە ئەم ڕستەیە لە کۆبوونەوەی واتای فەرهەنگی (نان،ەکە ،ی، خوارد)، لەگەڵ پەیوەندیی ڕێزمـانی لەنێـوان کەرتە پێکهێنەرەکـان پێکهـاتووە، بەڵام زۆرجار هاتنەتەکی وشەکان مەرج نییە بکـاتە ڕسـتەیەکی ئاسـایی ، بەڵکـو واتـایەکی جیاواز لە واتا فەرهەنگییەکە دەهێنێتە کایەوە و پەیوەسـت نیـیە بە کـۆی واتـای بەشـە پێکهێنەرەکانی، بۆ نموونە ڕستەیەکی ئیدیەمی وەکو :

(۱) **کار لەکار ترازاوە**. (بەو کارە دەوترێ، کە کرابێ و بڕابێتەوە) (محەمەد ئەمین هەورەمانی: ۱۹۸۹ : ۲۲۷٤ ).

لێرەدا ئەم ڕستە ئیدیەمە واتایەکی نوێی دروست کردووە و لە واتای فەرهەنگی وشەکانەوە نەهاتووە .

فـۆڕمێکی تـری ئیـدیەم دەرکەوتنێتـی لە فرێزیـدا، لە ڕووی واتـاوە جیـاوازی لەگەڵ فرێــزی ئاســایی ئەوەیە، کە فرێــزە ئاســاییەکان واتاکانیــان لە واتــای دانەی وشەکانییەوە دەست دەکەوێ، وەک :

**(۱) گوڵی سوور .**

**(۲) ئاوی سارد .**

بەڵام فرێــزی ئیــدیەمی واتاکــانی لە واتــای نادارِشــتەیی هــاتووە و دەبــنە ئاماژەیەکی نوێ بۆ شتێ، وەک ئەم ئیدیەمانە :

(۱) **ئاگری بنکا** . (بەکەسێ دەوترێ شەڕ و ئاشووب دروست بکا) .

وشەی ئیدیەمیش ، جیاوازە لە وشە ئاساییەکانی زمـان، واتـای وشـە بەگشـتی بـریتییە لە واتــای فەرهەنگــی و بــنەڕەتی ، کە واتاکانیــان لە تــوخمە بنچینەکانیــانەوە دەستنیشان کراوە، وەک ئەم وشانە :

(١) **ماستاو .**

(٢) **دار هەنار .**

بەڵام وشە ئیدیەمەکان ، تاریکن و واتاکانیان لە فۆڕمەکانیان بەدەست نایەت، هەروەک فرێــز و ڕسـتەکان وان (شـیلان عـومەر حوسـێن : ٢٠٠٩ : ٥٠ – ٥٣ )، وەک ئەم ئیدیەمە وشەییانە :

(١) **دەست کورت** ( واتە کەسی هەژار لە ڕووی ماددی ) .

(٢) **دڵپاک** ( واتە کەسێ دڵی پاکە و ...) .

پێویستە ئەوە بڵێین پەیوەندییەکی پتەویش لەنێوان واتا و فۆڕمە جیاوازەکانی ئیدیەم هەیە و هەردووکیان وابەستەی یەکترن، بە گۆڕانی فۆڕمیش واتاکان دەگۆڕێن، بەڵام دەربڕینی ئیدیەمیان هەیە بە دوو یان سێ فۆڕم هەمـان واتـا بگەیـنن، وەک ئەم نموونەیە :

(١) أ- **بەرد بە با دەکات** . (تووڕە و دەمارگیربووە، هیچ ناگێڕێتەوە).

ب- **بەرد بە ئاو دەکات .**

هەروەها ئەو واتا و فـۆڕمە جیـاوازانەی ئیـدیەم لە ئەنجـامی گەشـەی واتـای (خوازە و درکە و لێکچواندن و کەلتوور و قسەی ڕۆژانە ، ...هتد ) هاتوونەتە کایەوە ، کە بە سەرچاوەیەکی گرنگی دروستبوونی ئیـدیەم لەقەڵەم دەدرێـن . دواتـر لە پـاری (١-٤)دا ئەم ڕوانگەیە دەخرێتە ڕوو .

**١-٤ : سەرچاوەکانی دروستبوونی ئیدیەم**

چەند سەرچاوەیەک هەن ڕۆڵی گرنگیان هەیە لە سەرهەڵدان و دروستبوونی ئیدیەم، کە ئەم سەرچاوانە لەنێو زۆربەی زمانەکـان بەدی دەکـرێن، لە گـرنگترین ئەم سەرچاوانەش ئەمانەی خوارەوە:

**١- واتای خواستن :**

یەکێکە لە سەرچاوە هەرە باوەکانی دروستبوونی ئیدیەم، کە بریتییە لە هێنانی وشـەیەک بـۆ واتـایەکی تـر، کە لەڕووی دیـمەن و شـوێن و کـات و ئەرک ... هتـد، لەیەک بچن (عەبدولواحید موشیر دزەیـی : ٢٠١٥ : ٩٢ – ٩٣ ) ، ئەمەش بە دوو شێوە خـۆی دەنوێنێ :

**١- خوازە :**

لێرەدا دوو شت یان زیاتر بەیەکتری ئەچوێندرێن و ناوی یەکێکیان دەنرێ بە ئەوی تریان، ئەم واتای خوازەش لە دەوروبەر هەڵدێ (محەمە مەعروف فەتاح: ٢٠١٠ : ٢٠٠ ) . لە زمانی کوردیدا زۆر نموونەی ئیدیەممان هەیە، کە بەم ڕێگایە دروست بوونە و فەرهەنگی زمانەکەی دەوڵەمەند کردووە، لەوانە :

(١) **نانی بڕی** . (واتە لە ئیش و کارەکەی دەری کرد) .

(٢) **لە گوێی گا دا نووستووە** . ( ئاگای لە هیچ نییە) .

**٢- درکە:**

درکە: (( گواستنەوەی واتای دروستە بۆ واتای مەبەست )) (عەزیز گەردی : ١٩٧٢ : ٨٨). لێرەدا ئەو دوو شتەی ناو دەگۆڕنەوە زۆر نزیکن لە یەکتری (محەمەد مەعروف فەتاح : ٢٠١٠ : ٢٠٢ ) . ئەم جۆرە خواستنەش دەورێکی گرنگی لە دروستبوونی ئیدیەمدا دەبینێ و واتاکەی بۆ مەبەستێکی تر بەکاردێ، وەک ئەم نموونەیە :

(١) **شار خرۆشا** . (واتە خەڵکی شارەکە).

**٢-زیادە ڕۆیی :**

ئەو دەربڕینانەن ، کە لەگەڵ کەلتووردا یەکناگرێتەوە و دەبنە هۆکارێک بۆ هاتنەکایەوەی ئیدیەم لەم جۆرەدا ، وەک :

(١) **موو بە بەینیان وەناچێت** . ( واتە زۆر لەیەکتری نزیکن ) .

(٢) **لە هەزار ئاوی دایە** .

**٣- تەوس :**

ئەمەش ئەو دەربڕینانە دەگرێتەوە ، کە بەتوانج گوتراوە و ڕاست نییە، وەک :

(١) **دەستی خێری نایە سەر** .

(٢) **پاشەڵی جوان** .

**٤- پۆشین :**

ئەم دیاردەیە پەیوەندی بە جنس و نەخۆشی و لایەنی کۆمەڵایەتی و ...هتد، هەیە و وادەکا دەربڕینەکان جۆری لە تابۆ وەرگرن (عەبدولواحید موشیر دزەیی : ٢٠١٤ : ١٥٨-٥٧) ، وەک :

(١) **دەستیان لێوەشاندووە** . ( واتە شێت بووە ) .

(٢) **دووگیانە** . (سکی پڕە ).

**١-٥ : جۆرەکانی ئیدیەم**

لەنێو توێژەران و زمانەوانەکان جۆرەکانی ئیدیەم بەچەند شێوەی جیاواز پۆلین کراوە[٣]، بەڵام ئێمە بەپێی واتای تاریک و ڕوون، کە پەیوەستە بە سروشتی توێژینەوەکەمان پۆلێنی دەکەین ، لەم ڕوانگەیەوە ئیدیەمەکان دابەشی سەرئەم جۆرانە دەبن :

**١- ئیدیەمی یەکگرتوو :**

ئەم جۆرە ئیدیەمە واتاکەی لە ئەنجامی تواندنەوەی واتای کەرتەکانییەوە دێت و لەژێر کاری مێژووی خەڵک و داب و نەریت و کەلتوورەکەیدایە . ئەم جۆرە ئیدیەمانە ڕەق و وشک و نەگۆڕن ، بەواتای ئەوەی کارتەکانیان شوێن ناگۆڕن و ڕێگە بە کەرەسەی تر نادەن بێتە نێوانیان و خۆشیان پاش و پێش کەم دەکەن . لە نموونەی ئەم ئیدیەمانە وەک :

(١) **دڵی لە ژنەکەی پیسە** . (واتە گومانی لە ژنەکەیەتی) .

(٢) **ڕوو سپییە** . (واتە کەسێکی باش و پاکە) .

**٢- ئیدیەمی لێکدراو :**

لەم جۆرە ئیدیەمەدا پێچەوانەی جۆری یەکەم، تەنیا یەکێک لە کەرەستەکانی گۆڕانی واتایی بەسەردادێ، جگە لەمەش لە ڕۆناندا شل و شێواوترە ، بەواتای ئەوەی ڕێگا زۆرتر دەدات بە یاسا گۆڕانکاریەکانی زمان . لە نێو زمانی کوردیدا نموونەی ئەم جۆرەشمان زۆرە، وەک :

(١) **گوێی تەپە** . ( سەرشۆڕە).

(٢) **گوێی مسی تێ کراوە**. ( تێ ناگات، کەڕە).

(٣) **گوێی لێ خەواندووە** . (خۆی لێ کەڕ کردووە) . (محەمەد مەعروف فەتاح : ٢٠١٠ : ١٩٤–١٩٥).

لە نموونەکانی (١ و ٣)دا دەبینین (گوێ) بەواتای نوێ بەکارهاتووە، بەڵام لە نموونەکانی (٢)دا (گوێ) بەواتای بنەڕەتی خۆی بەکارهاتووە (مس تێکردن) بەواتای (گرتن) و (داخستن) هاتووە.

## بەشی دووەم
## ئیدیەم و پڕاگماتیک

**٢-١ : سەرەتا**

لەم بەشەدا هەوڵدەدرێ باس لە پەیوەندیی نێوان ئیدیەم و پڕاگماتیک بکرێ، بەوەی بزانین چ پەیوەندییەک لەنێوان ئیدیەم و پڕاگماتیکدا هەیە؟ ئایا چۆن و بەپێی چ بنەمایەک ڕەهەندی پڕاگماتیکی و بوارەکانی ڕەنگدانەوەیان لە نێوان ئیدیەمی زمانی کوردیدا هەیە ؟

**٢-٢ : پەیوەندیی ئیدیەم و پڕاگماتیک :**

پڕاگماتیک؛[٤] یەکێکە لەو ئاستە زمانییانەی ، تاوتوێی بەکارهێنانی زمان لە دەوروبەر دەکا و کاریگەری و ڕەنگدانەوەی لە نێو کۆی پرۆسەی ئاخاوتن و کردە زمانییە جیاوازییەکان و کەلتوور و پەیوەندییە کۆمەڵایەتییە جیاوازەکان هەیە .

زانستی پڕاگماتیک لە دیارترین ناساندنیدا : ((بریتییە لە پەیوەندیی نێوان زمان و دەوروبەر، کە گرنگن بۆ تێگەیشتن (عەبدولواحید موشیر دزەیی : ٢٠١٤ : ٣١) . واتە، ئەم زانستە لە بەکارهێنانی زمان لە دەوروبەر دەکۆڵێتەوە و بەیەکیان دەگەیەنێ ، ئەوەش ڕەهەندی سەرەکی پڕاگماتیک دەردەخات ، چونکە واتا بەپێی دەوروبەر لە بەکارهێنانیدا ڕەنگڕێژ دەکات .

پڕاگماتیک ؛ گرنگی بە واتای وشەیی نادات، بەڵکو جەخت لەسەر واتای بەکارهێنانیان و نزیکی و دووری و زانیاریی هاوبەش لە پەیوەندیی نێوان ئاخێوەران دەکاتەوە (محەمەد مەعروف فەتاح : ٢٠١١ : ١٩١ )، ئەمەش بەپێچەوانەی واتای سیمانیکی دەوەستێت، کە گرنگی بە واتای فەرهەنگی وشەکان دەدات . بەکارهێنانی زمانی بوارێکی گرنگی کارکردنی پڕاگماتیکە و پەیوەندی بە چالاکی زمانییەوە هەیە و پابەندی واتای نافەرهەنگیی وشە و دەربڕینەکانە و خۆی بە مەبەستە جیاوازەکان خەریک دەکات، کە لەکاتی کردەی پەیوەندیکردندا لە شێوەی (ئاخاوتن و نووسین ) دەردەکەوێ .

ئیدیەمەکان شێوازێکی تری بەکارهێنانی زمانن، وەک هەریەکێکی تری ئاخاوتن، کارلێک و چۆنیەکە لەگەڵ پڕاگماتیکدا، لەوەدا بۆ لێکدانەوەی واتاکانیان ،

پێویستی بە دەوروبەر و زانیاری وتن و قسەکەر هەیە، جگە لەمەش ئیدیەمەکان بە ناڕاستەوخۆیی واتا دەگەینن، لەبەر ئەوە دەبێتە بوار بۆ پڕاگماتیک و پەیوەندی و کاریگەریی ڕاستەوخۆ لەنێوانیاندا دروست دەبێت، ئەم دروستبوونەش لەواتای نافەرهەنگی بەدی دەکرێ، چونکە ئیدیەم واتاکەی ناوشەییە، بەهەمان شێوە پڕاگماتیک پابەندی ئەم جۆرە واتایەیە (شیلان عومەر حوسێن : ٢٠٠٩ : ٧٥) . بەم جۆرە دەوروبەر ڕۆڵی گرنگی دەبینێ لە گەیاندنی واتای ئیدیەمیدا .

**٢-٣ : ئیدیەم و دەوروبەر**

هەروەک پێشتر ئاماژەی پێدرا یەکێک لە پێناسە دیارەکانی پڕاگماتیک بریتی بوو لە گەیاندنی زمان و دەوروبەر بە یەکتری ، بۆیە دەوروبەر[٥] ((سەرجەم ئەو هەلومەرجە زمانی و نازمانییانەی، کە یاریدەی ڕوونکردنەوەی واتای دەربڕاوێکی زمانیکی لە شێوەی دەقێکی دیاریکراودا دەدات)) (ئارام عەبدولواحید : ٢٠١٣ : ٥١).

دەربڕاوە زمانییەکان پەیوەندیی گرنگیان بە دەوروبەر و جۆرەکانیەوە (فیزیکی و کەلتووری، کۆمەڵایەتی ...) هەیە، چونکە واتاکانیان لە دەوروبەر وەردەگیرێ، بۆیە "مارتن" دەڵێ : ((دوورکەوتنەوە لە دەوروبەر واتای وشە نامینێ (سالم شاکر : ١٩٩٢ : ٣١) . واتە، دەوروبەر ڕۆڵی گرنگی هەیە لە ڕوونکردنەوەی واتای وشە لە گەیاندنیدا .

دەوروبەر ڕۆڵی سەرەکی هەیە لە نیشتنەوەی ئەو لێڵییەی ، کە لە ئەنجامی بەکارهێنانی وشە دروست دەبێت، وەکو وشەکانی (فرە واتا، هاوبێژ)، ئەمە بۆ وشە، ئەی بۆ ئیدیەم چ پەیوەندییەکی بە دەوروبەرەوە هەیە ؟ ( فەتاح مامە : ١٩٩٨ : ٤٦) .

دەوروبەر پەیوەندییەکی بەهێزی بە ئیدیەمەوە هەیە، چونکە واتای کەرتە پێکهێنەرەکانی ئیدیەم بەشێوەی ناڕاستەوخۆ لە دەوروبەری بەکارهێنان وەردەگیرێ . بۆ نموونە دەگوترێ: (کابرا زۆر بێ بەزەییە و زوڵم و زۆرداری زۆر لە خەڵک دەکا)، ئینجا دەوترێ :

(١) **ئاگر لەناو کوولەکەی تەڕدا ئەکاتەوە** . ( واتە زوڵم و ستەم زۆر لە خەڵک دەکات). (جەلال مەحمود عەلی : ١٩٩٧ : ٥ ) .

هەروەها ئەگەر سەیری وشەکانی (ڕەش و سپی) بکەین، دەبینین بەپێی دەوروبەر واتا و ئیدیەمی جیاوازیان لەناو کۆمەڵدا دروست کردووە ، (شێرزاد سەبری عەلی : ٢٠١٤ : ٤٦) ، وەکو ئەمانە :

**(١) ڕوو ڕەش .**

**(٢) ڕوو سپی .**

**(٣) دڵ ڕەش .**

بەم شـێوەیە بۆمـان دەردەکەوێ ئیـدیەمەکان لە پەیوەنـدیی گرنـگ لەگەڵ دەوروبەردان و دەتـوانرێ پڕاگماتیکیـانە و بەپێـی بـوارە جیاوازەکـانی مامەڵەیـان لەگەڵیدا بکرێت .

**٢- ٤ : ئیدیەم و بوارەکانی پڕاگماتیک**

دوای ئەوەی ئاماژەمـان بەوەدا ، کە ئیـدیەم دەتـوانرێ پراگماتیکییـانە لێکدانەوەی بۆ بکرێ، ئێستا دێینە سەر شیکردنەوە و پڕاکتیزەکردنی بوار و بنەماکانی پڕاگماتیک لە ئیدیەمی کوردیـدا، بەگشتی بوارەکـانی پڕاگماتیـک بـریتین لەمـانەی خوارەوە :

**١- نیشانەکان .**

**٢- کردە قسەییەکان .**

**٣- گریمانە پێشەکییەکان .**

**٤- دەرکەوتە ئاخاوتنییەکان .**

لە خوارەوەش هەریەک لەم بوارانە لە چوارچێوەی ئیدیەمدا شـیدەکەینەوە و دەیانخەینەڕوو:

أ- نیشانەکان (Dixies)[٦]

نیشانەکان (( ئەو فۆڕمە زمانییە تەمومژاوییەن ، کە ئاماژە بـۆ کەس و کـات و شوێن و پلە و پایە و ...هتد دەکـەن . ئەو کەرەسـتانە دەگـرنەوە، کە زمـان و دەوروبەر بەیەکەوە دەبەسـتێتەوە (عەبدولواحیـد موشـیر دزەیـی : ٢٠١٤ : ١٢٥ ). واتە، نیشـانکارەکان واتاکانیـان لەدەوروبەر وەردەگیـرێ ، کە چەنـد جـۆرێکن ، وەکـو نیشانەکانی (کەس، کات، شوێن، کۆمەڵایەتی، دەق ) .

**١- نیشانە کەسییەکان :**

ئەو نیشـانانە ئامـاژە بەو کەسـانە دەکەن ، کە بەشـداری لە ئاخـاوتن دەکەن و ڕۆڵی کەسـەکانیش، کە هاوبەشـن لەکـاتی قسـەکردنیدا، نیشـان دەدەن (محمـد محمـد یونس: ٢٠٠٤ : ٢١) .

بەگشتی سێ جۆرە کەس هەن :

١- کەسی یەکەم (تاک) :من ⟵ ئێمە (کۆ)

٢- کەسی دووەم (کۆ) :تۆ ⟵ ئێوە (کۆ)

٣- کەسی سێیەم (نائامادە) : ئەو ⟵ ئەوان (کۆ)

ئەم نیشانە لە چوارچێوەی پڕاگماتیکدا، بەپێی دەوروبەر ڕۆڵ و ئەرکی جیاواز دەبینێت و دەبێتە چەند جۆرێک :

**أ- جێناوی ئاماژە و کەسیی :**

ئەم جێناوانە بەپێی دەوروبەری بەکارهێنان ، هەرجارەی بۆ کەسێک یان ڕووداوێک یاخود شتێک دەگرێتەوە . واتە، بەپێی (کات ، شوێن ، کەس)ی گوتن، واتایان دەگۆڕێت و لەمیانەی کەرەسەکانی ڕستەوە بەدەست ناهێنرێن (هۆگر مەحمود فەرەج : ٢٠٠٠ : ٧-٨) ، ئیدیەمەکانیش هەڵگری ئەم واتایانەن و بەپێی دەوروبەر ماناکانیان دەگۆڕێن و وەردەگیرێن ، وەک :

(١) **ئەو پارووە بەتۆ قووت نادرێ** . ( واتە ئەو ئیش و کارە بەتۆ ناکرێ) .

لە ئیدیەمی (١)دا، (ئەو) جێناوی نیشانەیە و بۆ کەسی سێیەمی کۆیە، وەک نیشانەیەکی پڕاگماتیکی بەکارهێنراوە، بەوەی نازانرێ (تۆ) کێیە ؟، ئەگەریش بزانین کێیە، دەبێ بۆ چوارچێوەی گوتنەکە و دەوروبەر بگەڕێین، ئەم واتایەش کە لە ئیدیەمەکە بەدەست هاتووە لە پەیوەندیی نێوان کەرتە پێکهێنەرەکانی نەهاتووە، بەڵکو لەدەوروبەر هاتووە، هەروەها نموونەکانی (٢) و (٣) هەمان ڕوانگە و ڕاستی دەردەخەن .

(٢) **ئەوەی بن بەڕی بینە سەر بەڕێ** . ( واتە هەموو شتێک ئاشکرا بکە ) .

(٣) **ئەو سەرە سەری خۆی نییە** . ( یەکێک هیچ کۆ ناکات و دوایی سەری خۆی بە فەوتان ئەدات و لەناو دەچێ ) .(ئیبراهیم ئەحمەدی: ١٣٩٣ : ٢٥٢) .

**ب- ناوی تایبەتی :**

ئەمەش جۆرێکی تری نیشانە کەسییەکانە، وەک نیشانەیەکی پڕاگماتیکی ڕۆڵ دەبینن، لە ئیدیەمی کوردیدا ، ئەم ناوە دەرکەوتنیان هەیە و بە دابڕانی گوێگر لە دەوروبەری وتن، مەبەست لە ناوە تایبەتییەکە کێیە ، ناگات ، وەک :

(١) **حەمە قەدۆی مووسـڵە** . (واتە دەوڵەمەنـدێکی گەورەیە و بە تەوسیشـەوە دەوترێ)،

لەم ئیدیمەدا (حەمە قەدۆ) ناوێکی تایبەتە و ئاماژە و پەیامی بۆ گوێگر ئەوەیە، پیاوێکە خەڵکی مووسڵە و نـاوی (حەمە قەدۆ)یە ، بەڵام لێـرەدا نەگەیانـدنی زانیـاری لەبـارەی ئەوەی (حەمە قەدۆ) کێـیە و چـۆنە ؟ لەلای گـوێگر ، بەبـێ ڕەچـاوکردنی دەوروبەری وتن و کات و شوێنی قسەکە، ئەوا لێڵی لە پەیامەکە دەبینرێت .

**پ- ناوی خزمایەتی :**

ئەم جۆرە نـاوانەش وەک نیشـانەیەکی پڕاگماتیکـی، لە چوارچێـوەی نیشـانە کەسییەکان کاردەکەن، لە نمـوونەی هەنـدێ ئەو نـاوانەش (مـام، پـوور، بـاوک، بـرا، دایک، خوشک، باپیر، پلک، ...هتد) . لە ئیدیەمـدا ئەم نـاوانە ڕەنگـدانەوەیان هەیە، وەک :

(١) **ئەو بابەت مردووە.** (واتە، لەمەولا وەکو جاران هەموو کارێکت بۆ نـاچێتە سەر ) . (عەبدولوەهاب شێخانی : ٢٠٠٩ : ٣١ ) .

(٢) **کوڕی بابی خۆیەتی.** ( واتە، هەر لە باوکی دەچێت و شوێنی گرتۆتەوە) .

لە ئیـــدیەمی (١) و (٢)دا ، وشـــەی (بـــاوک و کـــوڕ) وەکـــو نیشـــانەیەکی پڕاگماتیکی بەکارهێنراون، چونکە نازانرێ ئەم دوو کەسە کێنە و چ دەکەن ؟

**ت- نازناو :**

ئەمەش جۆرێکی تری نیشانە کەسییەکانە و وەک نیشـانەی پڕاگماتیـک ڕۆڵ دەبینن، دوو جۆرن :

١- نازناو : ناوێکە یـان ئاوەڵنـاوێکە بەمەبەسـتی ناسـاندنی بەنـاوی کەسـێکەوە دەلکێنرێت، جا ئەگەر ناوەک ئەرێنـی و بـاش بـێ پێیـدەوترێ (نازنـاو)، خـۆ ئەگـەر ناوەکە خراپ و نەرێنی بێ، ئەوا پێیدەوترێ نـاو و نـاتۆرە. (ئـارام عەبدولواحیـد : ٢٠١٣ : ٢٣٩-٢٤٠) .

ئەم جۆرە ناوە لە نێو ئیدیەمی کوردیدا دەبینرێت و واتای تـایبەت دەگەیەنـێ، وەکو ئەو نموونەیەی خوارەوە :

(١) **گوڵی مەجلیسە** . (واتە قسەی خۆشە و دەچێتە دڵی خەڵکی) .

٢- ناتۆرە: هەروەک وترا، ئەم ناوەیە ڕەهەندی نەرێنی تێدایە، وەک :

(١) **حەرامزادەیە** . (کەسێکی خراپ و فێڵبازە) .

لەم ئیدیەمانەی سەرەوەدا، بەبێ گەڕانەوە بۆ دەوروبەری وتنەکە لێڵـی لەلای وەر گریان گوێگر دروست دەبێت .

**٢- نیشانەکانی شوێن :**

ئەو نیشانانە، بریتین لەوەی شوێنی گوتن لەچاو شوێنە هاوبەشـەکان لەکـاتی ئاخـاوتن دیـاری دەکەن ( مـحەمەد مەعـروف فەتـاح : ٢٠١١ : ٢٠٠) و زمـان و دەوروبەر بەیەک دەگەیـنن. نیشـانەی شـوێنی وەکـو ئاوەڵکـاری شـوێنی (لە ژێـر ، لەسـەر، لەتەنیشت...) ، یان ناوی شـوێنی ئاسـایی وەک: (مـزگەوت، قوتابخـانە، خـانوو، ...) دەردەکەون .

لەکـاتی ئاخاوتنـدا چەنـد جۆرێـک لە شـوێنی بنچینەیـیمان هەیە ، لەوانە : شوێنی نزیک لە قسەکەر، نزیـک لە گـوێگر ، نزیـک لە جەمـاوەر، نزیـک لە کەس (ئاڤێستا کەمـال مەحـمود : ٢٠٠٩ : ٣٤) . ئیـدیەمەکان لەم ڕوانـگەیەوە وەک نیشـانەیەکی پڕاگماتیکی ڕۆڵ دەبینن ، بۆنموونە دەگوترێ :

(١) **لەبنی دنیایە** . (واتە شوێنەکە زۆر دوورە) .

(٢) **شوێنی قایمە** . (واتە جێی خۆی باشە و بەرنادات ) .

**٣- نیشانەکانی کات :**

ئەو نیشـانانەن، کە کـاتی گـوتن لەکـاتی قسـەکردن دیـاری دەکەن، وەک : (سبەی، دوێنێ، ڕۆژ، ئەمڕۆ، ...هتد). لەم ڕوانگەیەوە ئیدیەمەکان بەپێـی دەربڕینیـان چەمکی کاتییان تێدا دەردەکەوێ و واتای جیاواز بەپێی دەوروبەر دەگەیەنـن . وەک ئەمانەی خوارەوە :

(١) **ڕۆژی ڕەشی نەدیتییە** . (واتە برسێتی و ناخۆشی و ... نەدیوە ) .

(٢) **ڕۆژی ڕووناک** . (کاتی خۆشی و ...) .

هەروەک (هێمن)ی شاعیر دەڵێ :

کات و ساتی خۆشی و سەرفرازی

هەمە هیوا بەدواڕۆژی ڕووناک (تاریک ڕوون، ل١٥٦)

**٤- نیشانە کۆمەڵایەتییەکان :**

ئەو نیشانانەن ، کە پلەوپایە و جیاوازیی کۆمەڵایەتی هاوبەشەکانی ئاخاوتن دەردەخەن. ئەم نیشانانەش لە شێوە و جۆری وەک : (ناوی تایبەتی، نازناو، جێناو، ئاوەڵناو، خزمایەتی) دەردەکەون و پیشە و ڕێزی جۆراوجۆر نیشان دەدەن (بێری یاسین حوسێن : ٢٠١٢ : ١٣٣)، وەک (دکتۆر، خاڵە ، وەستا ، بەڕێز، کاکە، ... هتد) . ئەم جۆرەی نیشانانەش لە ئیدیەمیدا بەپێی دەوروبەر دەرکەوتەیان هەیە و واتای جیاواز و تایبەت دەبەخشن، وەک :

(١) **خۆڵەمێشیان دایمە گەرمە** . ( واتە، باری ئابوورییان باشە، یان هەردەم بەمیوانن) .

(٢) **ئاغا بەڵێیە** . (هەرچی بڵێن ئەو مۆری دەکات . بێ لێکدانەوە بڕوای پێدەکات) (ئیبراهیم ئەحمەدی: ١٣٩٣ : ٣٤) .

لە ئیدیەمی (١) و (٢)دا ، دەبینین هەردوو وشەی (ئاغا و خۆڵەمێش) وەکو نیشانەی کۆمەڵایەتی بەپێی دەوروبەر دەرکەوتوون و ئاماژە بە لایەنی باڵادەستی (ئاغا) و ئابووری باش (خۆڵەمێش) دەکەن .

**٥- نیشانەی دەق :**

ئەو نیشانانەن، کە ئاماژە بەو بەشەی دەق (Text) دەکەن، کە گوتنەکەی تێدایە، یان ئاماژە بۆ پەیوەندیی نێوان گوتنێک و دەوروبەری گوتنەکە دەکات، نیشانەکانی کات و شوێن و جێناوەکان زۆرجار وەک نیشانەی دەق دەردەکەون (محەمەد مەعروف فەتاح : ٢٠١١ : ٢٠٦) . لەم ڕووەوە ئیدیەمەکان زۆرجار وەک نیشانەیەکی دەق دەرکەوتەیان هەیە و بەم پێیە واتا وەردەگرن، وەک :

(١) **ئەو هەویرە ئاوی زۆر دەوێ** . (واتە، ئەم کار و قسە و باسانە زۆری دەوێ).

(٢) **ئەو کەرەی لەو قوڕەی دەربینە** . (واتە، هیچ بیرناکاتەوە و تێ ناگات) .

لێرەدا، لە ئیدیەمەکانی (١) و (٢)دا، (ئەو) وەک نیشانەیەکی دەق ئاماژەی پێکراوە .

**ب- گریمانە پێشەکییەکان :** [7]

یەکێکی ترن لە بوارەکانی پراگماتیک، کە بریتییە لە هەڵێنجانی واتایەک لە ڕستەیەکی دیاریکراو لەلایەن وەرگری ڕستەکەوە، ئەو واتایەش لە ئەنجامی پێشگریمانەکەوە بەدەست دێت، بەرهەمی وەرگرە (دیار عەلی کەمال : ٢٠٠٩ : ٩٨) . واتە، لێرەدا قسەیەک دەربڕاوە و وەرگر گریمانەی مەبەست و واتاکانی دەکات .

لە گریمانەی پێشەکیدا، قسەکەر وا پێشبینی دەکا، کە هەندێ زانیاری هەیە و لەبەرچاوی گرتووە، بۆیە ئەو دەربڕینەی دەربڕیوە، گرنگیی ئەمە لەوەدا دەبینرێ، کە واتاکانیان بەشێک نین لە واتای فەرهەنگی وشەکان . (شیلان عومەر حوسێن :٢٠٠٩:٨١) . ئیدیەمیش لەم ڕوانگەیەوە گریمانەی پێشەکی تێدا دەبینرێ و واتاکانی لەدەرەوەی وشە فەرهەنگییەکان بەدەست دێت. وەک دەگوترێ :

(١) **بنوو با بێتە خەونت .** ( واتە، زانیاری هەیە، کە ئەو شتەی بۆ نابێ ) .

یان :

(٢) **دار و دیوار گوێی هەیە** . (واتە، ئاگات لە دەم و زمانت بێ با تووش نەبیت) .

لەم ئیدیەمانەی سەرەوەدا، قسەکەر جۆرێ لە زانیاری پێشینەی هەیە، بۆیە ئەم دەربڕینانەی دەربڕیوە، واتای دەربڕینەکانیش لە دەوروبەر وەردەگیرێ و لەلایەن وەرگرەوە گوزارشتی لێ دەکرێت

**پ- دەرکەوتە ئاخاوتنییەکان :** [8]

چەمکی دەرکەوتەکان[9]، ئەو واتایانە دەگرێتەوە کە لەلایەن قسەکەر درکاوە و بەئاشکرایی ئەیگەینێ، نەک ئەو واتایەی بەئاشکرا گوتراوە . بەم پێیە بریتین لە لێکدانەوە و شیکردنەوەی ئاخاوتن.

دەرکەوتەی ئاخاوتن، وەک بەشێکی گرنگی دەرکەوتەکان، هەموو ئەو واتایانە دەگرێتەوە، کە بە وشە دەرنەبڕاون، بەڵام هەڵدەهێنجرێن لە گوتنێک یان دەربڕاوێک پشت بەستوو بە (بنەمای هاریکاری – Cooperative principles) . بنەماکانی هاریکاریش ، ئەو بنەمایانەن، کە لەلایەن (گرایس) دانراوە، لەساڵی (١٩٧٥) ئەوەی دەرخست، کە ئاخاوتن لەسەر بنەمایەکی هاریکاریی گونجاو لە

نێوان (قسەکەر و گوێگر) بەڕێوەدەچێت، ئەمەش بۆ ئەوەیە ئاخاوتن بەشێوەیەکی ڕێکوپێک بەڕێوە بچێت (عەبدولواحید موشیر دزەیی : ٢٠١٤ : ١٠٠-١٠١)، ئەو بنەمایانەش بریتین لەمانە :

١- چەندییەتی : بەشداری کردنەکەت زیاد لە پێویست یان کەمتر بە پێویست نەبێت .

٢- چۆنییەتی : دەبێ بەشدارییەکەت ڕاست بێ و بێ بەڵگە نەبێ و گومانی تێدا نەبێ .

٣- گونجان: گوتنەکەت گونجاو بێت، لەگەڵ پێویستی و داواکاریی گوێگر بگونجێ.

٣- شێواز: گوتنەکە شێوازێکی ڕوون و ئاشکرای تێدابێ (عەبدولسەلام نەجمەدین عەبدوڵڵا: ٢٠٠٨ : ٩٧) .

بەڵام مەرج نییە ئاخاوتن هەموو کات بەپێی ئەو بنەمایە بەڕێوە بچێ، بەڵکو هەندێ جار لادان لەو بنەمایانە دەکەوێتەوە، ئەمەش بەمەبەستی باری دەروونیی گوێگر و کاریگەری و دەربڕینی ناڕاستەوخۆیی و ڕێز و ...هتد. ئیدیەمەکان لەم ڕوانگەیەوە لەکاتی ئاخاوتندا بەزاندنی ئەو بنەمایانەیان تێدا دەردەکەوێت، ئەمەش مەبەست و مەرامی تایبەتی لەپشتە، هەروەک تازە ئاماژەمان پێکرد، بۆنموونە ئەگەر سەیری ئەم ئاخاوتنەی خوارەوە بکەین :

(١) – (أ) شنە کچێکی چۆنە ؟

**(ب) زۆربڵێیە، مێشکی سەرت دەبا ؟**

(٢)- (أ) دارا لە کارەکەی چۆن دەرچوو ؟

**(ب) دەستپیس دەرچوو .**

بۆ ئەوەی لە وەڵامی (ب) لە جووتە گوتنەکانی (١ و ٢) تێبگەین و بزانین تاچەند بنەماکانی هاریکاری جێبەجێکراوە لەلایەن گوێگرەوە. لەم گوتنانەدا دەبینین گوێگر بنەماکانی هاریکاری بەزاندووە، هەروەک بەکارهێنانی ئیدیەمی (زۆربڵێیە) لەلایەن (ب) لە گوتنی (١)دا ، بەوەی (شنە زۆر قسە دەکات و مەجالی کەس نادات)، ئەمەش لادانە لە بنەمای هاریکاری، چونکە وەڵامەکەی زیادەڕۆیی تیایە،

بەهەمان شێوەش بەکارهێنانی ئیدیەمی (دەستپیس) لەلایەن (ب) لە گوتنی (٢)دا ، کە بەواتای ئەوەی (دارا لە کارەکەیدا خراپ و دز دەرچووە) ، دیسانەوە ئەمەش لادانە لە بنەمای هاریکاری ، ئەم لادانەش لەلایەن گوێگرەوە بێ مەبەست دەرنابڕێ و ڕەهەندی خۆی لەپشتە .

**ت- کردە قسەییەکان :**

تیۆری کردە قسەییەکان،[١٠] بەیەکێک لە بنەما گرنگەکانی شیکردنەوەی ئاخاوتن دادەنرێت . ئەم تیۆرە زمان بەکردە دادەنێت واتە، دەکرێ لە پشت هەر گوتنێک کۆمەڵێ کردەوە و مەبەستی جیاواز دەربکەوێ (تالیب حوسێن عەلی : ٢٠١٩ : ٥٦) .

ئەگەر لەواتای هەر گوتنێک وردبینەوە، دەتوانین لە دوو ڕوانگەی جیاوازی واتاییەوە سەیری بکەین، واتای ئاشکرا و واتای شاراوە ، ئەم تیۆرەی کردە قسەییەکان گرنگی بە واتای شاراوە دەدات، کە ڕاپەڕاندنەکەیە و کردە و ئەرکی کۆمەڵایەتی جیاواز جێبەجێ دەکات (قیس کاکل تۆفیق: ١٩٩٥ : ٣٩-٤٠) . بەم جۆرە کردە قسەییەکان دەبن بە دوو جۆر :

١- کردەی قسەیی ئاشکرا : لێرەدا ، قسەکەر بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ گۆتنەکەی دەردەبڕێت، وەک:

– **نانەکەت بخۆ**. (فەرماندان)

٢- کردەی قسەیی شاراوە: لەم کردەیەدا، قسەکەر گۆتنەکەی بەشێوەی ناڕاستەوخۆ دەردەبڕێت و چەندین کردەی وەک : (ئامۆژگاری، هەڕەشە، گلەیی، ... هتد) بەپێی دەوروبەری گۆتنەکە تیایدا دەردەکەوێ، وەک :

– **مامۆستا ببوورە . (پۆزش) .**

ئیدیەمەکان لەم ڕوانگەیەوە وەك واتایەکی شاراوە دەردەکەون و چەندین مەبەست و ئەرکی کۆمەڵایەتی جۆراوجۆر، بەپێی دەوروبەر دەگەیەنن، چونکە هەڵقوڵاوی ناو کۆمەڵگان، وەک :

(١) **ئەو دڕکەت لەبن پێت دەردەینم**. ( واتە، تۆڵەی ئەم کارەت لێ دەکەمەوە). (هەڕەشەکردن)،

(٢) **ئەمن لۆتـوومە، ئەتـوو لەبـۆ کێـتە.** (واتە، پـێم باشـە ئەو کـارەی نەکەی). (ئامۆژگاری).

(٣) **ڕووی خـۆی ڕەش کـرد.** (واتە، کـارێکی خراپـی ڕاپەڕانـد). (گلەیـی و ناڕەزایی) .

(٤) **بەڕاستی دەست پاکە.** (کەسێکی باش و پاکە) . (پیاهەڵدان) .

(٥) **پشتم مەشکێنە.** (واتا، لێم تێک مەدە و وازم لێ بینە) . (ئاگادارکردنەوە).

دەبینین هەریەک لەو ئیدیەمانەی سەرەوە، بەپێی دەوروبەر، کردەی قسـەیی جیاواز تێیانـدا دەرکەوتـووە. بەم جـۆرە بۆمـان دەرکەوت ، ئیـدیەمەکان دەتوانرێـت بەپێی ئەو واتا نافەرهەنگییەی، کە بەپێـی دەوروبەر دەگەیـنن، بوارەکـانی پڕاگماتیـان تێدا دەرکەوێ.

**ئەنجام**

توێژینەوەكە بەم ئەنجامە گرنگانەی خوارەوە گەیشت :

١- چەمكی ئیدیەم؛ وەك ڕەهەندێكی كۆمەڵایەتی و كەلتووری لە نێو زمانی كوردیدا بە شێوەی فۆڕمی جیاواز (وشە، گرێ، ڕستە) دەركەوتەی هەیە و هەڵگری پێكهاتەی ڕێزمانی و واتاییە و وەك دەربڕاوێكی زمانی گرینگ گوزارشت لەو دەربڕینانە دەكات، كە لە زنجیرەیەك وشە پێكهاتوون و مانای لە دەوروبەر وەردەگیرێ .

٢- واتاكانی ئیدیەم لە زمانی كوردیدا، واتای خوازەیی و نافەرهەنگین، واتە؛ واتاكانی شاراوەن و پەیوەست نییە بە پەیوەندیی نێوان كەرتە پێكهێنەرەكانی، ئەمەش سەرچاوەیەكی گرنگی دروستبوونی ئیدیەمەكانن .

٣- پەیوەندییەكی بەهێز لەنێوان ئیدیەم و دەوروبەردا هەیە، چونكە مەبەست و لێكەوتەكانی واتای ئیدیەم لە دەوروبەری بەكارهێن وەردەگیرێ و ڕووندەكرێنەوە .

٤- پڕاگماتیك؛ بەكارهێنانی زمانە لە دەوروبەر، ئیدیەمەكانیش لەم ڕوانگەیەوە شێوازێكی تری بەكارهێنانی زمانن و ئەركی كۆمەڵایەتیی جیاواز جێبەجێ دەكەن .

٥- دەتوانرێ پڕاگماتیكییانە مامەڵە لەگەڵ ئیدیەمدا بكرێ و بنەما و بوارەكانی وەك : ( كردەی قسەیی، پێشگریمانە، دەركەوتە ئاخاوتنییەكان، نیشانەكان) تێیدا ڕەنگبداتەوە.

**پەراوێزەکان**

١- زاراوەی ″ ئیدیەم ″ لە وشەی لاتینی (ئیدیۆس- idios)ەوە وەرگیراوە، کە بەم واتایانە بەکارهێنراوە :

- (خاوەنێتی، هەیەتی – own ) .
- (تایبەتی، سەربەخۆ – private) .
- (کەسی، خودی- prisonl). (www.1913.dictanary) .

هەروەها لە فەرهەنگی (oxford)، واتای ئیدیەم بەم شێوەیە لێکدراوەتەوە : (فریزێکە یا ڕستەییێکە، واتاکانیان بەزانینی تاکە واتاکانی لێکدراوەکە ئاشکرا نابێت، بەڵکو پێویستە واتای لێکدراوەکە هەموو بەسەریەکەوە بزانین (Hornaby:1974:431) .

٢- ئەمە ئەوە ناگەیەنێ، ئیدیەم بەواتای فەرهەنگی دروست نابێت، بەڵێ دروست دەبێ، بەوەی لە فەرهەنگیدا واتایەک دەدا؛ بەڵام جیاوازە لە واتا خوازراوەکە . بۆنموونە، ئیدیەمی **(پایزا برا) :**

أ- لە فەرهەنگدا (بەو هەژارانە دەوترێ، کە لە پایزدا بۆ خەرمان دەردەکەون و دێنەسەر خەرمان).

ب- بەواتای ئیدیەمی (بەیەکێک دەوترێ، کە درەنگ درەنگ دەردەکەوێت و کاتێکیش دەردەکەوێت کارێکی پێت بێت) . بڕوانە : (شیلان عومەر حوسێن: ٢٠٠٩ : ٦١ – ٦٢ )، ئەمەش خاڵێکی جەوهەری گرنگی جیاکردنەوەیە لە واتا فەرهەنگییەکە، کە بەرەو مەبەستێکی تری تایبەتی دەبات (عەبدولوەهاب خالید موسا : ٢٠٠٩ : ٨ ) .

٣- زمانەوانەکانی خۆمان هەندێکیان بەسوود وەرگرتن لە زمانەوانی تر و بۆچوونی خۆیان، ئیدیەم لەچەند ڕوویەکەوە پۆلێن دەکەن، بۆ نموونە (محەمەد مەعروف فەتاح) لەڕوانگەی واتاییەوە دوو جۆر لە ئیدیەم دیاری دەکات ( یەکگرتوو، لێکدراو ) (محەمەد مەعروف فەتاح : ١٩٨٦ : ١٠٠-١٠٤)، (ئەورەحمانی حاجی مارف)یش لەڕووی واتاوە، سێ جۆر ئیدیەم دەستنیشان دەکات (یەکگرتوو، تێکچڕژاو، تێک ئاڵاو) (ئەورەحمانی حاجی مارف : ١٩٨٠ : ٦١-٦٥ )، (فەتاح مامە) لەنامە دکتۆراکەیدا چەند جۆرێکی ئیدیەمی هێناوە، وەک : ( لەڕووی ڕێزمان، ئەرک، واتاسازی، داڕشتن ) (فەتاح مامە: ١٩٩٨ : ٦١ – ٨٣ ).

٤- زاراوەی پڕاگماتیــــک (pragmatic) لە وشـــەی (pragma)ی گـــریکییەوە وەرگیراوە، بەواتای کارکردن یـان پڕاکتیـک دێـت (عەبدولواحید موشیر دزەیی : ٢٠١٤ : ٣٠). ئەم زاراوەیە بۆیەکەمجـار لەسـاڵی (١٩٣٨) لەلایەن (چـارڵس مـۆریس) لە کتێبەکەیدا بەناوی (زانستی هێما - semiotics) بەکارهـات، کە زمـانەوانی دەکـاتە سـێ بەش (ڕستەسازی، واتاسازی، پڕاگماتیک) (تالیب حوسێن عەلی : ٢٠١٩ : ٤٥) .

٥- بیروبۆچـوونی "دەوروبـەر" لە سـاڵانی سـییەکاندا سـەری هەڵـدا، ئەمەش لەکاتێکـدا گرنگـی درا بـە کـۆمەڵ و پەیوەنـدیی کۆمەڵایەتیـدا، کە مـرۆڤ بەهـۆی زمانەوە لە ئەندامانی کۆمەڵەکەی بگات، ئەم ڕێبازەش لە سـەردەمی (مالینۆفسـکی و فێرث) زیاتر پەرەی سەند، هەروەها چەند زمانەوانێکی تـری وەک (هالێـدەی، بـازل، کاتزوڤۆدەر) بەشدارییان تێکرد (ساجیدە عەبدوڵڵا فەرهادی : ٢٠٠٨ : ٢٧) .

٦- زاراوەی (Dixies)، لە بنەڕەتدا وشەیەکی یۆنانییە و بەواتای دیـاریکردن یـان ئاماژەکردن دێت (ئارام عەبدولواحید : ٢٠١٣ : ٢٠٧) .

٧- لە هەنـدێ سـەرچاوە لەبـری زاراوەی (گـریمانە پێشـەکییەکان)، زاراوەی (بەرگریمانە) بەکارهاتووە . بـۆ زانیـاریی زیـاتر بـڕوانە : (قـەیس کاکـل و کوردسـتان ڕەفیق : ٢٠١٤ : ١٣٢) .

٨- بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە : (محەمەد مەعروف فەتاح : ٢٠١١ : ٢١٣ : ٢١٦) .

٩- "ئاڤێستا" کەمال لە نامە دکتۆراکەیـدا، لەبـری زاراوەی (دەرکەوتە)، زاراوەی (بەنامەکیی) بەکارهێناوە . بڕوانە : (ئاڤێستا کەمال مەحمود : ٢٠٠٩: ٦٩) .

١٠- سـەرەتای ئەم تیـۆرە لەلایەن زانـای بەریتـانی " ئۆسـتۆن "وە، لە سـاڵی (١٩٦٢)دا پێشکەشکراوە، مەبەستیش لە تیۆرەکە شیکردنەوەی زمـان بـووە، هەروەهـا بەپێی بۆچوونی تیـۆرەکە هەر قسـەکردنێک بەئەنجامـدانی کارێـک دادەنـرێن . بـۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە : (قەیس کاکل تۆفیق : ١٩٩٥ : ٤٠ – ٤١)، (تالیب حوسێن عەلی : ٢٠١٩ : ٥٦ - ٥٨) .

## سەرچاوەکان

**أ- بەزمانی کوردی :**


١. ئارام عەبدولواحید (٢٠١٣)، ڕێزگرتن لە زمانی کوردیدا، چاپی یەکەم، چاپخانەی لەریا، سلێمانی.
٢. ئاڤێستا کەمال مەحمود (٢٠٠٩)، پڕاگماتیکی ڕستەی پرسیار و فەرمان لە زمانی کوردیدا، چاپی یەکەم، چاپخانەی ڕەنج، بڵاوکردنەوەی مەڵبەندی کوردۆلۆجی، سلێمانی .
٣. ئاوات ئەحمەد محەمەد (٢٠٠٩)، شێوازی گۆتنی فەرماندان لە زمانی کوردیدا، نامەی ماستەر، کۆلیژی زمان، زانکۆی سەڵاحەدین .
٤. ئیبراهیم ئەحمەدی (١٣٩٣)، زیوەری زمان، فەرهەنگی کینایە و دەستەواژەی کوردی سۆرانی، (کوردی– کوردی- فارسی- کوردی)، چاپی یەکەم، چاپخانەی شابک، ئیران .
٥. ئەورەحمانی حاجی مارف (١٩٨٠)، کارێکی گەورە لە باسی ئیدیەم لە فەرهەنگ نووسی کوردیدا، گۆڤاری (بەیان)، ژ(٦٢)، بەغدا .
٦. بێری یاسین حوسێن (٢٠١٢)، هەندێ لایەنی پڕاگماتیکی فراوان لەزمانی کوردیدا، نامەی ماستەر، کۆلیژی پەروەردە، زانکۆی سەڵاحەدین .
٧. تاڵیب حوسێن عەلی (٢٠١٩)، شیکردنەوەی گوتار، چاپی یەکەم، چاپخانەی هێڤی، هەولێر .
٨. جەلال مەحمود عەلی (٢٠١٢)، ئیدیۆم لەزمانی کوردیدا، چاپی دووەم، چاپخانەی بینایی، سلێمانی .
٩. دیار عەلی کەمال (٢٠٠٩)، گوتاری سیاسی کوردی لە ڕوانگەی پێشگریمانەکانەوە، نامەی دکتۆرا، کۆلیژی زمان، زانکۆی سەڵاحەدین .
١٠. زوبێر عەلی قادر (٢٠١٢)، ئیدیەم لە شێوازی هەورامیدا، نامەی ماستەر، سکۆڵی زمان، زانکۆی سلێمانی .
١١. ساجیدە عەبدوڵڵا فەرهادی (٢٠٠٨)، ڕستە و پاش ڕستە، چاپی یەکەم، چاپخانەی ئاراس، هەولێر.
١٢. شاخەوان جەلال فەرەج (٢٠١٣)، تابۆ وەک پەیوەندیی نێوان زمان و کەلتوور، چاپی یەکەم، چاپخانەی بینایی، سلێمانی .
١٣. شۆخان عەزیز عومەر (٢٠١٤)، لێکسیکۆلۆژی و هەندێک وشەی چالاک لە فەرهەنگی کوردیدا، نامەی ماستەر، سکوڵی زمان، زانکۆی سلێمانی .
١٤. شێرزاد سەبری عەلی (٢٠١٤)، پڕاگماتیک، چاپی یەکەم، چاپخانەی حاجی هاشم،

بڵاوکردنەوەی ئەکادیمیای کوردی، هەولێر .
١٥. شیلان عومەر حوسێن (٢٠٠٩)، ئیدیۆم چەشن و پێکهاتنی لە زمانی کوردیدا، چاپی یەکەم، چاپخانەی ڕەنج، بڵاوکردنەوەی مەڵبەندی کوردۆلۆجی، سلێمانی .
١٦. عەبدولسەلام نەجمەدین عەبدوڵڵا (٢٠٠٨)، شیکردنەوەی دەقی شیعری لە ڕووی زمانەوانییەوە، چاپی یەکەم، چاپخانەی حاجی هاشم، هەولێر .
١٧. عەبدولواحید موشیر دزەیی (٢٠١٤)، پراگماتیک، چاپی دووەم، چاپخانەی ئاوێر، هەولێر .
١٨. عەبدولواحید موشیر دزەیی (٢٠١٥)، پراگماتیک و ڕەوانبێژی، چاپی یەکەم، چاپخانەی ئاوێر، هەولێر .
١٩. عەبدولوەهاب خالید موسا (٢٠٠٩)، چەند بابەت لێکۆلینێن زمانی، چاپا یەکێ، چاپخانا هاوار، دهۆک .
٢٠. عەبدولوەهاب شێخانی (٢٠٠٩)، فەرهەنگی ئیدیەم لە زمانی کوردیدا، چاپی یەکەم، چاپخانەی خانی (دهۆک)، بڵاوکردنەوەی دەزگای موکریان، هەولێر .
٢١. عەزیز گەردی (١٩٧٢)، ڕەوانبێژی لە ئەدەبی کوردیدا، بەرگی یەکەم، (ڕونبێژی)، بەغدا .
٢٢. فەتاح مامە، (١٩٩٨)، ئیدیەم لە زمانی کوردیدا، نامەی دکتۆرا، کۆلیجی ئاداب، زانکۆی سەلاحەدین .
٢٣. قەیس کاکل تۆفیق (١٩٩٥)، جۆرەکانی ڕستە و تیۆری کردە قسەییەکان، نامەی ماستەر، کۆلێجی ئاداب، زانکۆی سەلاحەدین .
٢٤. قەیس کاکل تۆفیق و کوردستان ڕەفیق محێدین (٢٠١٤)، سروودی ئەی ڕەقیب (لێکۆڵینەوەیەکی زمانەوانی)، گۆڤاری ئەکادیمیای کوردی، ژ(٣١)، هەولێر .
٢٥. محەمەد مەعروف فەتاح (١٩٨٦)، دیسان ئیدیەم، گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق (دەستەی کورد)، بەرگی یازدەهەم، چاپخانەی کۆڕی زانیاری عێراق، بەغدا .
٢٦. ____________ (٢٠١٠)، لێکۆڵینەوە زمانەوانییەکان، کۆکردنەوە و ئامادەکردنی : شێروان خۆشناو و شێروان میرزا، چاپی یەکەم، چاپخانەی ڕۆژهەڵات، بڵاوکردنەوەی دەزگای موکریان، هەولێر .
٢٧. ____________ (٢٠١١)، زمانەوانی، چاپی سێیەم، چاپخانەی حاجی هاشم، بڵاوکردنەوەی ئەکادیمیای کوردی، هەولێر .
٢٨. محەمەد ئەمین هەورامانی (١٩٨٩)، فەرهەنگی زار و ئیدیۆمی زمانی کوردی، بڵاوکردنەوەی ئەمینداریێتی گشتی ڕۆشنبیری لاوان، بەغدا .

٢٩. هۆگر مەحمود فەرەج (٢٠٠٠)، پڕاگماتیک و واتای نیشانەکان، نامەی دکتۆرا، کۆلیژی زمان، زانکۆی سلێمانی .
٣٠. هێمن موکریانی (٢٧٠٨) ، دیوانی هێمن، چاپی یەکەم، چاپخانەی چوارچرا، سلێمانی .

**٢- بەزمانی عەرەبی :**

٣٢- سالم شاكر ( ١٩٩٢)، مدخل إلى علم الدلالة، ترجمة بيحاتن، ديوان مطبوعات جامعيـة، الجزائير .
٣٣- محمد محمد يونس على (٢٠٠٤)، مدخل إلى اللسانيات، دار الكتاب الجديد، بيروت .

**٣- بەزمانی ئینگلیزی :**

34- CrestL .David, (2008), Adictionary of linguistic and ponetics, ed . Malden- uk: Blank wen publishing Ltd .
35- Hornby (1974), Oxford Advanced learnes dictionary Oxford University press .

**٤- پێگەی ئەلیکترۆنی :**

36- www.1913. Dictionary.com.

## ملخص البحث

## تداولية الايديوم في لهجة الكورد المتوسط

م.م. رزگار اسماعيل كريم
قسم اللغة الكوردية- كلية اللغات
جامعة صلاح الدين –اربيل

م.م. طلعت محمد عزيز
قسم اللغة الكوردية –كلية التربية-عقرة
جامعة دهوك

يعد مصطلح الإِيديوم مظهراً من المظاهر الاجتماعية والثقافية المرتبطة بالعلاقة الموجودة بين الأفراد داخل النسيج الاجتماعي، وهو تعبير عن مجموعة من الكلمات تتضمن معنى مأخوذاً من المحيط الاجتماعي ولا علاقة لها بمكوناتها المعجمية، انطلاقاً من هذا المنظور تبحث الدراسة في براغماتيكية الإيديوم وفق المنهج الوصفي التحليلي، فتتناول الإيديوم في زواياه المتعلقة بالبراغماتيكية بغية الوصول إلى إمكانية دراسة هذا المجال وفق منظور البراغماتيكية وفروعها.

تتكون الدراسة من فصلين، يتناول الفصل الأول تعريف مصطلح الإيديوم ومصادر تكوينه وأنواعه. وأما الفصل الثاني فيتناول مجالات البراغماتيكية من (الأفعال الكلامية ومظاهر التحدث والعلامات وما قبل الاحتمالات) في اللغة الكوردية وتنتهي الدراسة بعرض أهم النتائج التي توصلت إليها.

**الكلمات المفتاحية:** مصطلح الإيديوم، البراغماتيكية، الإيديوم والمحيط المكون له، براغماتيكية الإيديوم.

## Abstract

### Pragmatic idioms in Kurdish central dialect

The term (idiom) is a cultural and social reflection. It is connected to the relationship among the individuals and it has originated from society. Idiom is that linguistic expression which is composed from a series of words which has a hidden meaning. And the meaning is derived from the surrounding environment not from the composing words. In this sense, the research explains the pragmatic meaning of idiom in Kurdish middle dialect following the descriptive-analysis method. Furthermore, the basics and aspects of idiom which are related to pragmatics are discussed. In which, the study aims to discover if (idiom and its meaning) can be investigated through Pragmatics.

The study is consisted of two sections. The first section is about idiom definition, the term of idiom, idiom as a meaningful unit, source of its composition, and its types. While, the second section describes the pragmatics of idiom, for this purpose, the study considers the four aspects of pragmatics (speech acts, conversational implicature, rhetorical structure and management of reference) which are related to idiom in Kurdish language.

Finally, the study has arrived at some results, the most important one is that idiom can be investigated through pragmatics as it has a non-dictionary meaning which is taken from the surrounding environment.

**Key words:** term of idiom, pragmatics, idiom and environment, idiom and pragmatics, idiom and meaning.

# ڕۆڵی زمانی ڕۆژنامەنووسی
# لە پەرەپێدانی وشەی نوێباودا

**بارزان کانەبی تاهیر محەمەد**
بەشی کوردی - کۆلێژی زمان
زانکۆی سەلاحەدین-هەولێر

**پێشەکی:**

ئەم لێکۆڵینەوەیە، کە بە ناونیشانی (ڕۆڵی زمانی ڕۆژنامەنووسی لە پەرەپێدانی وشەی نوێباودا)یە، هەوڵێکە لە ئاستی وشەسازی و لە چوارچێوەی زمانی ڕۆژنامەنووسیدا، بە شێوەیەکی تیۆری بۆ دەرخستنی هۆکارەکانی سەرهەڵدان و جۆر و پێڕەوەکانی هێنانەکایەی (وشەی نوێباو). کە لەم چوارچێوەیەدا لە گواستنەوە و پەرەپێدانی بەردەوامدان.

**هۆی هەڵبژاردنی لێکۆڵینەوەکە:** هۆی هەڵبژاردنی ئەم لێکۆڵینەوەیە بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە، تاکو ئێستا (وشەی نوێباو) لە ڕوانگەی وشەسازییەوە، لە چوارچێوەی زمانی ڕۆژنامەنووسیدا نەبۆتە کەرەستەی لێکۆڵینەوەیەکی تایبەت، کە لایەنێکی گرنگ و کاریگەری گەشەکردنی زمان و زمانی ڕۆژنامەنووسییە.

**گرنگی لێکۆڵینەوەکە:** گرنگی لێکۆڵینەوەکە لەوەدایە، جگە لە خستنەڕووی ڕۆڵی گرنگی زمانی ڕۆژنامەنووسی، بەشێوەیەکی تیۆری تیشک دەخاتەسەر چەمک و جۆر و ڕێگاکانی هێنانەکایەی (وشەی نوێباو) لەڕووی لۆژیکی زمانەوانییەوە، پاشان بەستنەوەیەتی بە زمانی ڕۆژنامەنووسییەوە، لە چۆنیەتی پەرەپێدان و گواستنەوەی بۆ نێو جەماوەر و جێگیربوونی لە نێو فەرهەنگی زماندا. هەروەها ئاماژە بە چەند ڕێگایەکی تری جیاواز لە ڕێگا باو و دیاریکراوەکانی داهێنانی وشە دەکات، لە وەرگرتنیش لە زمانی بێگانە، وەرگرتنی ڕاستەوخو و ناڕاستەوخۆ دیاریدەکات.

**سنووری لێکۆڵینەوەکە:** بۆ دیاریکردنی سنووری لێکۆڵینەوەکە، لە ئاستی وشەسازییدا، (ڕۆڵی زمانی ڕۆژنامەنووسی لە پەرەپێدانی وشەی نوێباودا)، وشە نوێباوەکانی کایەی ڕۆژنامەنووسی وەک نموونە دەخاتە بەر تیشکی لێکۆڵینەوەکە.

**ڕێبازی لێکۆڵینەوەکە:** لێکۆڵینەوەکە لە چوارچێوەی زمانی ڕۆژنامەنووسی، لە ئاستی وشەسازییدا، بە پشت بەستن بە ڕێبازی (وەسفی شیکاری) لە وشە نوێباوە دیاریکراوەکانی کۆڵیوەتەوە.

**گیروگرفتی لێکۆڵینەوەکە:** لە کاتی ئەنجامدانی ئەم لێکۆڵینەوەیە، دیارترین گرفت کە هاتبێتە پێشمان، نەبوونی سەرچاوە و لێکۆڵینەوەیەکی تێروتەسەل بوو، کە زمانی ڕۆژنامەنووسیی کوردی خستبێتە بەر تیشکی لێکۆڵینەوە بە تایبەتی لە چوارچێوەی وشەسازییدا، هەروەها بەردەست نەبوونی سەرچاوە بە زمانانی تریش گرفتێکی دیکە بوو. ئەوەی ئێمە بیزانین کتێبخانەی کوردی لەم بارەیەوە هەژارە.

**ناوەڕۆکی لێکۆڵینەوەکە:** ناوەڕۆکی ئەم لێکۆڵینەوەیە جگە لە پێشەکی و ئەنجام لە دوو بەشی سەرەکی پێکدێت:

**بەشی یەکەم:** ناوەڕۆکی ئەم بەشە پێکدێت لە: (زمانی ڕۆژنامەنووسی، وشە، جۆرەکانی وشە). لەم بەشەدا جگە لە وردبوونەوە و هەڵوەستەکردن لەسەر هەر یەکێ لەم سەرەباسانە، بە مەبەستی ڕوونکردنەوەی زیاتر بەپێی پێویست نموونە خراوەتەڕوو.

**بەشی دووەم:** ئەم بەشە کە سەرەباسەکانی: (وشەی نوێباو، هۆکارەکانی هاتنەکایەی وشەی نوێباو، ڕێگاکانی هێنانەکایەی وشەی نوێباو) لەخۆدەگرێت، بە وردی تیشک خراوەتە سەر هەرکێکیان و بەپێی ویستی لێکۆڵینەوەکە نموونەی پێویست خراوەتەڕوو. لە کۆتایی لێکۆڵینەوەکەشدا جگە لە خستنەڕووی گرنگترین ئەنجامەکان، لیستی سەرچاوە بەکارهاتووەکان لەگەڵ پوختەی توێژینەوەکە بە هەردوو زمانی عەرەبی و ئینگلیزی خراونەتە ڕوو.

## ڕۆڵی زمانی ڕۆژنامەنووسی لە پەرەپێدانی وشەی نوێباودا

**بەشی یەکەم**

**تەوەری یەکەم/ زمانی ڕۆژنامەنووسی:**

زمان وەک ئامرازێکی دەربڕین و گوزارشت، دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی و هاوسەردەمە و بەردەوام لە گەشە و گۆڕاندایە. لەم بارەوەش لە ئاستی وشەسازییدا بەهۆی ئەوەی هەر دەرکەوتەیەک، یان هەر داهێنانێک ناوەکی بێت، یان دەرەکی هاوپێچ بە (ناو)ێکەوە دەبێت، بۆ ئەم مەبەستەش هیچ زمانێک لە زمانانی جیهان ناتوانێت بە تەنیا پشت بە وشەکانی نێو فەرهەنگەکەی ببەستێت، بۆیە ناچار بە داهێنانی یان وەرگرتنی وشە دەبێت. ئەم وشەیەش لە دەسپێکدا بە ( وشەی نوێباو) ناو دەبرێت. بۆ گواستنەوە و بڵاوبوونەوەشی بۆ نێو چینەکانی کۆمەڵ زمانی ڕۆژنامەنووسی ڕۆڵێکی کارا دەبینێت لە برەودان و جێگیرکردنی وەک هەر وشەیەکی تری نێو فەرهەنگی زمانەکە. کەواتە زیندوویی و گەشەی هەر زمانێک لەوەدایە، کە (سیستەمێکی دینامیکییە. هەمیشە لە هەموو ئاستەکانیدا "فۆنەتیک – فۆنۆلۆجی – مۆرفۆلۆجی – سینتاکس – سیمانتیک – پراگماتیک" لە بزوین و گۆڕینێکی بەردەوامدایە. هەندێ لەو گۆڕانانە خێران و زوو دەردەکەون. هەندێ لە سەرەخۆن، دوای ماوەیەکی زۆر لە ڕێی دەقە کۆنەکانەوە درکیان پێ دەکرێت). (ئەمین، ٢٠١٤، ل٧) یەکێ لەو گۆڕانە بەردەوامانەش لە ئاستی وشەسازییە. هۆکارەکەشی دەگەڕێتەوە، بۆ ئەو ڕووداو و دیاردە و داهێنانە ناوەکی و دەرەکییانەی دێنە ئاراوە، کە هەمیشە زمان بە داهێنان و وەرگرتنی وشە و زاراوەی نوێ پەیوەست دەکەن. کەواتە یەکێک لە بنەما گرنگەکانی زیندوویی و گەشەکردنی هەر زمانێک داهێنان و هێنانەکایەی وشەی نوێیە، تا ئەم زمانە کارابێت، فەرهەنگەکەی لە داهێنان و وەرگرتنی وشە نوێیەکان لە گەشە و برەوی بەردەوامدا دەبێت. بۆ ئەوەی بتوانێت لەگەڵ پێشکەوتنە هەمەلایەکان هەنگاوهەڵێنێت و وشەی نوێ لەخۆ بگرێت. بۆ گواستنەوە و برەودانی ئەم وشانەش زمانی ڕۆژنامەنووسی بەهۆی ئەوەی نە زمانی نەرم و بەسۆز و ئەندێشە ڕازاوەی ئەدەبە، نە زمانی ڕووت و ڕەهای زانستە، بەڵکو زمانێکی سادە و پوختکراوە

لـە ئاسـتی هـەموو چینـەکانی کۆمەڵـە، واتـە زمـانێکی تایبەتـە و خـاوەن شـێواز و تایبەتمەنـدیی خۆیـەتی. (دزەیـی، ٢٠٠٥، ل٥٩) بۆیـە زمـانی ڕۆژنامەنووسـی هەمیشـە دانەبڕاوە لە گەیاندنی شتە نوێیەکان و شانبەشانی پێشکەوتنی لایەنە جۆراوجۆرەکانی تـری وەك: (زانسـتی، ئـەدەبی، هونـەری، ڕامیاری....هتـد) دایـە و لـە هێنانەکایـە و داهێنانی هەر وشە و زاراوەیەک خێرا لەڕێی ئامرازەکانی ڕۆژنامەنووسییەوە دێنـە نێـو زمانەکـەوە. (حەمەغـەریب، ٢٠١٤، ل١٥) ئەمـەش گـرنگترین هۆکـاری زینـدوویی و نوێبوونـەوەی زمانـە. کەواتـە زمـانی ڕۆژنامەنووسـی جگـە لـەوەی بـە خێراتـرین و کاریگـەرترین ئـامرازی گەیانـدنی زانیـاری و ڕووداوە هەمـەجۆرەکان بـە وەرگـر دادەنرێـت، لـە بـزوین و گەشـە و گـۆڕانی زمانیشـدا بـە تایبـەتی لـە بووژاندنـەوە و هێنانەکایەی وشەی نوێباودا، ڕۆڵێکی سەرەکی دەبینێت و بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ لە ژیانی ڕۆژانەی وەرگردا ڕەنگدانەوەی دەبێت. لەم بـارەوەش تیشـک دەخەینـە سـەر وشـە و پێکهاتـەکانی و هـەروەها وشـەی نوێبـاو و جـۆر و ڕێگاکـانی داهێنـان و وەرگرتنی.

**تەوەری دووەم/ وشە و جۆرەکانی:**

وشـە وەک یەکەیـەکی سـەرەکی و بنچینـەی فەرهـەنگی هـەر زمانێـک فـرە تایبەتمەندە و ناساندنی لـە چوارچێـوەی پێناسـەیەکدا بـە شـێوەیەکی ڕەهـا کـارێکی ئاسـان نییـە. لەبـەر ئـەوەی لەسـەر هـەموو ئاسـتەکانی زمانـدا ڕۆڵ و ئـەرکی گرنـک دەبینێت. بۆیە تاکو ئێستا نەتوانراوە لە چوارچێوەی پێناسەیەکی گشـتگیر و داخـراودا پێناسە بکرێت. بۆیە ئاماژە بە چەند پێناسـەیەک دەدەیـن، کـە لەلایـەن شـارەزایانەوە خراونەتە ڕوو. وەك:

- وشە لە چەند دەنگێک پێکدێت. (حاجی مارف، ١٩٧٥، ل٦)
- وشە بریتییە لە چەند مۆرفیمێک کە جێ گۆڕی ناکەن. (فەتاح، ٢٠١١، ل٩٠)
- وشە بچووکترین فۆرمی ئازادە. (محمد، ٢٠١٩، ل٤٥)
- وشە ئەو بێژەیەیە کە ڕستەی لێ پێکدەهێنرێت. (حاجی مارف، ١٩٧٥، ل٦)
- وشە یەکەیەکە لە ڕێگای فۆنیمەوە درکی پێدەکرێت و ئەرکێکی سیمانتیکی هەیە. (جمعة، ٢٠٠٢، ص٢١)

- وشە واتادارە و لەسەر ئەم بنچینەیەش فەرهەنگ دروست بووە. (دزەیی، ٢٠١٤، ل٣١)

بە سەرنجدان لەم ناساندنانە وەک دەردەکەوێت، هیچ یەکێکیان هەڵگری تەواوی تایبەتمەندییەکانی وشە نین و بەڵکو هەر یەکە و ڕوانگەی یەکێ لە ئاستەکانی زمانی پێوە دیارە، ئەمەش ئەوە دەردەخات، وشە ئەو دانە زمانییە فرە تایبەتمەندەیە لە سەر هەموو ئاستەکانی زمان ڕۆڵ و ئەرکی هەیە.

یەکێ لەو تایبەتمەندییانەش کە دەمانەوێت تیشکی بخەینە سەر لەڕووی پێکهاتەوەیە، کە دابەش دەبێت بۆ دوو جۆر:

**یەکەم: وشەی سادە:** ئەو وشانە دەگرێتەوە، کە تەنیا ڕیشەیەکیان هەیە. (ئەمین، ٢٠١٤، ل٢٤) واتە لە مۆرفیمێکی سەربەخۆ پێکهاتوون. وەك: با، تۆز، بەفر، باران......هتد

**دووەم: وشەی نادە:** مەبەست لەو وشە داهێنراوانەیە، لە بنچینەدا دەگەڕێنەوە بۆ وشەی تر. (حاجی مارف، ٢٠١٤، ل٦) واتە ئەو وشە سادانەی لەڕووی فۆڕمەوە بۆ گەیاندنی واتای تر گۆڕانیان بەسەر داهاتووە. لەم بارەوەش سێ جۆر وشەی ناسادە بەدی دەکرێت.

**١- وشەی داڕێژراو:** ئەو وشانە دەگرێتەوە، کە لە وشەیەکی سادەی سەربەخۆ و پێشگرێک یان پاشگرێک، یان هەردووکیان، داڕێژراون. (فەخری و موکریانی، ١٩٨٢، ل٨)

**- پێشگر:** مەبەست لەو گیرەکانەیە، کە بە سەرەتای وشەوە دەلکێن و وشەی نوێ دروست دەکەن. وەک: (بە، بێ، نە، دا، ڕا،........هتد بۆ نموونە: بەجەرگ، بێهۆش، نەبەز، داهات، ڕابوون......هتد

**- پاشگر:** مەبەست لەو گیرەکانەیە، کە بە کۆتایی وشەوە دەلکێن و وشەی نوێ دروست دەکەن. (بڕوانە: هەورامانی، ١٩٨١، ل١٧٤-١٧٦) وەک: گە، گەر، وان، ەوان، مەند، ەتی، خانە، ......هتد. بۆ نموونە: بازاڕگە، دادگەر، مەلەوان، پاسەوان، هونەرمەند، پیاوەتی، چاپخانە......هتد

**- ناوگر:** لە پیتێک یان دوو پیت پێکدێت، بەشداری لـە لێکـدانی دوو وشـەدا دەکات، واتە لە نێوان دوو وشەدا جێگیر دەبێت و واتایەکی نوێ بە وشە لێکدراوەکە دەبەخشـێت. (روخـزادی، ۲۰۱۰، ل١١٨) وەک: (ا، و، بـە، تا،....هتـد. بـۆ نموونـە: سەراسەر، دەنگوباس، دەربەدەر، سەرتاپا......هتد

**٢- وشەی لێکدراو:** ئەو وشانەن کە لە دوو وشە یان پـتر پێکهـاتوون، هەمیشـە یان وشەی یەکـەم واتـای وشـەی دووەم تـەواو دەکـات، یـان بـە پێچەوانـەوە. وەک وشەکانی: نێرەکەو، دەنکەگەنم......هتد. (ئەمین، ٢٠١٤، ل١٣٤-١٣٥) هەروەها یەکگرتنی دوو وشە بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ، واتە بێ هـیچ گیرەکێـک، پێیـدەگوترێت: وشـەی لێکدراوی سینتاکسی. (دزەیی، ٢٠١٤، ل٣٥) بـۆ نموونـە: مارماسـی، دارگـوێز، دەسـتاڕ، هەوارغەر......هتـد. بـەڵام گـەر بـەهۆی مـۆڕفیمی لێکـدەرەوە بـە یەکـەوە بلکـێن پێیدەگوترێت: وشەی لێکـدراوی نـا سینتاکسـی. بـۆ نموونـە: گۆمەشـین، گردیگـۆم، دانەقەتێ، بێژینگبەسەر.....هتد

**٣- دەستە:** ئەو کۆمەڵە وشـەیە دەگرێتـەوە، کـە هـەموویان پێکـەوە لـە ڕسـتەدا ئەرکی ناوێک، ئاوەڵناوێک.......هتد، دەبینن. واتە ئەو کۆمەڵە وشەیەن، کـە کاریـان تێـدا نییـە. (فـەتاح، ٢٠١١، ل٩٨) هـەروەها (گرێ)شـی پێـدەگوترێت. بـۆ نموونـە: (لەسەردارەکە، بۆ کرێ، کاتژمێر سێی پاش نیوەڕۆ....هتد).

هەریەک لەم پێکهاتانـەی ئاماژەمـان پێـدا، وەک چـۆن سـەرچاوەی سـەرەکی زمانن، لەگەڵ ئەمەشدا بنەمای دەستوورین بۆ داهێنان و هێنانەکایەی وشەی نوێ، کە بە خاڵی سەرەکی کراوەیی دەروازەی فەرهەنگی هەر زمانێکی کارا دادەنرێت. بۆ ئەم مەبەستەش ئەو وشانەی دادەهێـنرێن، کـە وەکـو وشـەی سسـت نامێننـەوە و بـە هـەر هۆکارێک بێت دەکەونە سەرزاری بەشێک لە بەکارهێنـەرانی زمانەکـە، لـە سـەرەتادا وەک (وشـەی نوێبـاو) دەردەکـەون. لـەم بـارەوە لـە بەشـی دووەمـی باسـەکەماندا بەشێوەکی ورد تیشک دەخەینە سـەر (وشـەی نوێبـاو) و ڕۆڵ و گرنگیـی لـە کایـەی زماندا.

**بەشی دووەم**

**تەوەری یەکەم/ وشەی نوێباو:**

**- نوێباو**: دەرکەوتەیەکی تازەبابەتی پەسندکراوە، جا لەهەر بوارێکەوە بێت. لە بواری زمانەوانییشدا، مەبەست لەو وشە نوێیە دەرکەوتووانەیە، کە هێشتا نەکەوتوونەتە سەر زاری زۆرینەی بەکاربەرانی زمانەکە. واتە هێشتا لە ڕیزی وشە ڕەسەنەکانی فەرهەنگی زمانەکە جێگیر نەبوونە.

ئەگەرچی هەموو زمانێک هەر لە سەرەتاوە بەهۆی هێنانەکایەی وشەی نوێ، وەک دیاردەیەکی (نوێباو) بەردەوام لە گەشە و گۆڕاندا بووە، بەڵام سەرهەڵدان و تیشک خستنەسەر چەمکی "نوێباو" لە بنچینەدا دەگەڕێتەوە بۆ وشەی (Neologisyme)ی فەرەنسی و ماوەی ساڵانی (١٧٩٠- ١٨٠٠ز)ی. لە زمانی ئینگلیزیدا (Neologism) و لە زمانی عەرەبیدا (الکلمات المولودة)ی پێدەگوترێت. (ساڵح، ٢٠١٧، ل٢٢)

لە ڕووی ناساندنەوە وەک هەر وشە و زاراوەیەکی تر لەلایەن شارەزایانەوە، چەند پێناسەیەک لەبارەیەوە خراوەتەڕوو. وەک ( نیومارک ) دەڵێت: ((وشەی نوێباو بریتییە لە یەکەی فەرهەنگی تازە داهێنراو، یان ئەو یەکە فەرهەنگیانەن خودان هەبوونن، بەڵام پێویستییان بە تێگەیشتنی تازە هەیە)). (سەبری و مونیب، ٢٠١٦، ل٢٣٤)

بەپێی ئەم پێناسەیە، کە دوو ڕەهەندی سەرهەڵدانی وشەی نوێباو دەگرێتەوە:

**١- تازە داهێنراو:** وەك وشەکانی: چالاکوان، گشتپرسی، ساڵڕۆژ....هتد

**٢- بوونی لە فەرهەنگدا:** وەک وشەکانی: پشتیوان، دەمامک، سەرکۆنە....هتد

هەر لەم بارەیەوە (ئەندەرسۆن) دەڵێت: ((وشەی نوێباو ئەو وشەیەیە یان ئەو زاراوەیە، کە دێتە نێو کردەیی زمانیدا و بەشێوەیەکی بەربڵاو بەکاردێت، هەرچەندە پێشتر پەسند نەبووە، بێتە نێو زمانەکە)). (Anderson, 2006, p601) بۆ ئەم مەبەستەش لەزمانی کوردیدا، وشەگەلێک بەرچاو دەکەون، کە بەم قۆناغەدا تێپەڕیون. وەک وشەکانی:

**- جەریدە: ڕۆژنامە**

**- ئیجتیماع: کۆبوونەوە**

**- ڕەقەم: ژمارە**
**- مەرحەلە: قۆناغ**
**- مزاهەرە: خۆپیشاندان....هتد**

هەروەها ( ئەوڕەحمانی حاجی مارف) دەڵێت: ((هەر وشەیەک کە تازە لە زماندا پەیدا بووبێت، بە نوێباوی دەژمێردرێت تا ئەو کاتەی ڕەنگ و بۆی تازەیی پێوەدیار بێت)). (حاجی مارف، ١٩٧٥، ل٥٤) بەپێی ئەم پێناسەیە ئەوە ڕوون دەبێتەوە، کە وشەی نوێباو ( ئەو وشانەن کە تازە هاتوونەتە ناو زمانەوە و نەچوونەتە ڕیزی وشە چالاکەکان و هێشتا جێگای خۆیان لە زمانەکەدا نەکردۆتەوە). (دزەیی، ٢٠١١، ل٣٢) هەروەها ئەوەش دەردەکەوێت، کە پەیوەستە بە سەردەمی بوونەکەی لەلایەن بەکاربەرانی زمانەکەوە، نەک کاتی داهێنان و سەرهەڵدانییەوە. وەک وشەکانی:

**- هۆنەر**
**- پێنووس**
**- کاژێر**
**- وەرزین**
**- دەرماڵە.....هتد**

وەک لەم نموونانە دەردەکەوێت هەر یەکێ لەم وشانە بە شێوەیەکی جێگیر لە ڕیزی وشە چالاکەکان نە کەوتوونەتە سەرزاری زۆرینەی بەکاربەرانی زمانەکە، بەڵکو لە بەرانبەریاندا هێشتا وشەکانی: شاعیر، قەڵەم، کاتژمێر، وەرزش....هتد) بەکاردەبرێن. کەواتە ئەو وشەیەی دێتە ئاراوە، ئەگەر بوو بە باو و جێی خۆی کردەوە، دوای ماوەیەک لە نوێباوی دەردەچێت و وەک هەر وشەیەکی تری ڕەسەن و ئاسایی لە فەرهەنگی زمانەکە جێی خۆی دەگرێت.

بە سەرنجدان لەم پێناسانەدا ئەوە ڕوون دەبێتەوە، کە وشەی نوێباو ئەو وشە داهێنراو و وەرگیراوانە دەگرێتەوە، کە لەلایەن زۆرینەی بەکاربەرانی زمانەکە بەربڵاو نین لە بەکاربردندا، بەڵکو زیاتر لە لایەن نووسەران و ئەدیبانەوە لە ڕێگەی چاپەمەنی و بە تایبەتی ئامرازەکانی ڕۆژنامەنووسییەوە، دەکەوێتە سەرزاری بەکاربەرانەوە و جێگیر دەبێت. (عەلی، ٢٠٠٩، ل٤٠) کەواتە ئامرازەکانی ڕۆژنامەنووسی بەشێوەیەکی

گشتی ڕۆڵی سەرەکی دەبینن لە هێنانەئارا و پەرەپێدانی وشەی نوێباودا، کە بەهۆی گواستنەوە و گەیاندنی ئەو پێشکەوتن و ڕووداوە ناوەکی و دەرەکییانەی دێنە ئاراوە. لەبەر ئەوەی زمانی ڕۆژنامەنووسی زمانێکە لە ئاستی هەموو چینەکانی کۆمەڵە و لە هەموو بوارەکانی تر زیاتر کاریگەری بەسەر (وەرگر)دا هەیە، ئەمەش وای کردووە، هەمیشە سەرچاوەیەکی گرنگ و کاریگەر بێت لە گەشە و گۆڕانی فەرهەنگی زماندا.

**هۆکارەکانی هاتنەکایەی وشەی نوێباو:**

بۆ سەرهەڵدان و هاتنەکایەی وشەی نوێباو هۆکارگەلێک هەن، زمانەوانان و بەکاربەرانی زمانەکە ناچار بەداهێنانی وشەی نوێ دەکەن، کە بریتین لە:

- لە بەرانبەر هاتنەکایەی شت و مانا و دیاردەی نوێ، زمان پەیوەست دەبێت بە داهێنانی وشەی نوێ، بۆ ناونانی ئەو شت و مانا و دیاردە هەمەلایەنە نوێیانەی، (حاجی مارف، ١٩٧٥، ل٥٥) وەك: (ئابووری، سیاسی، کارگێڕی......هتد). وەک وشەکانی: (قەیران، ترازان، بندیوار.....هتد).

- پێشکەوتنە جۆراوجۆرەکانی وڵاتانی گەشەکردوو هۆکارێکی تری سەرهەڵدانی وشەی نوێن، کە ((پێشکەوتنی تەکنەلۆجیا و دروستبوونی بەرهەمی نوێ لە کۆمپانیاکان و پێشکەوتنی زانست و زانیاری))(دزەیی،٢٠١١، ل٣٢) دەگرێتەوە. وەک وشەکانی: (ڤایبەر، ماسنجەر، تیلیگرام، ئایپاد، سناپ.......هتد).

- هۆکاری دەروونی، هۆکارێکی ترە، کە بە مەبەستی جوانکاری و ڕەچاوکردنی لایەنی دەروونییە بۆ داهێنانی وشەی نوێی ئەرێنی لە بەرانبەر وشەی نەرێنی پێشوو. وەک وشەکانی: (نابینا: کوێرە، درۆ: ناڕاست، مێرد: هاوژین....هتد). (سالح، ٢٠١٧، ل٣٨)

- بارگاوی بوون بە بیری لایەنێکی دیاریکراو، کە دەبێتە لەدەستدانی بێلایەنی و واتا ڕاستەقینەکەی و سەرهەڵدانی وشەی نوێی بەرانبەری. (سالح، ٢٠١٧، ل٣٩) وەک وشەکانی: (هەڵسووڕاو، ئیسلامی، باژێڕوان،.....هتد).

- پەیدابوونی ناوی نوێ بۆ ئەو واتایانەی کە ناویان هەبووە، (حاجی مارف، ١٩٧٥، ل٥٥) وەک هەستکردنێک لەلایەن خاوەنی زمانەکەوە بۆ داهێنان و

هێنانەکایـەی وشـەی نـوێ، بـە مەبەسـتی زیـاتر گەشـە و نمـای زمانەکـەوە. وەک وشەکانی: (باشووری کوردستان، کوردستانی باشوور، فرەبۆچوون.......هتد).

**تەوەری دووەم/ ڕێگاکانی هێنانەکایەی وشەی نوێباو:**

یـەکێک لـە بنـەما گرنگـەکانی زینـدوویی و گەشـەکردنی هـەر زمانێـک هێنانەکایەی وشەی نوێیە. تا ئەم زمانە کارابێـت، فەرهەنگەکـەی لـە گەشـە و بـرەوی بەردەوامـدا دەبێـت، بـۆ ئـەوەی بتوانێـت لەگـەڵ پێشـکەوتنە هەمەلایەنـە نـاوەکی و دەرەکییەکان هەنگاو هەڵێنێت و وشە و زاراوەی نوێ لەخۆ بگرێت.

ئەمەش وای کردووە، هەمیشە (لە ئاستی وشەسـازییدا ژمـارەی وشـەکانی هـەر زمانێک بەردەوام لە زیادبووندان. هەر چەمکێک یان هـەر شـتێکی نـوێ کـە پەیـدا دەبێت، چ کەرستەیی بێت چ ئەندێشەیی بێت، ناوێکی لێ دەنرێت و زاراوەیەکی بۆ دادەنرێـت). (ئـەمین، ٢٠١٤، ل٧) کەواتـە بـە پەیوەسـتبوون بـە ناونـان، زمـان هەمیشـە پێویستی بە وشە و زاراوەی نوێ هەیە. بۆ ئەم مەبەستەش جگە لە هاتنەکایەی وشەی سادەی نوێباوی وەک: (ڕەوش، مووچە، سەکۆ، باڵ......هتد). بە شێوەیەکی گشتی لە دوو سەرچاوەی تریشەوە دێتە ئـاراوە، کـە بـریتین لـە: یەکـەم: هاتنەکایـەی نوێبـاوی نـاوەکی، کـە بـە سـوودوەرگرتن لـە فەرهـەنگی خۆمـاڵی و پشـت بەسـتن بـە بنـەما تایبەتییەکانی زمانەکە دادەهێنرێت، کە پێیدەگوترێت وشەی داهێنراو (دروسـتکراو). دووەم: هاتنەکایەی نوێباوی دەرەکی، واتە وەرگرتن لە زمانێکی ترەوە. (کالفي، ٢٠٠٨، ص٣٢٦) کە پێیدەگوترێت وشەی وەرگیراو. کەواتـە سـەرچاوەکانی گەشـە و گـۆڕانی فەرهەنگی هەر زمانێک، دەگەڕێتەوە بۆ دوو سەرچاوەی سەرەکی کە بریتین لە:

**یەکەم: وشەی داهێنراو (دروستکراو):** بەهۆی ئەوەی وشەی سادە لـە دۆخـی خۆیدا نامێنێتەوە و لە ڕێگـەی چەنـد کردەیەکـەوە لـەڕووی فـۆڕم و واتـاوە گـۆڕانی بەسەر دادێت، (دزەیی، ٢٠١٣، ل٨٩) کە بنەمایـەکی سـەرەکی داهێنـانی وشـەیە لەسـەر بنچینـەی ئـەو وشـانەی پێشـتر لـە زمانەکـەدا بوونیـان هەیـە. لـەم بـارەوەش مۆرفیمـە چالاکەکانی زمان یاریدەدەرن بۆ داهێنـانی وشـەی نوێبـاو، ئەمـەش سـەرچاوەیەکی گرنگـی دەوڵەمەنـدکردنی زمانـە. (حـاجی مـارف، ٢٠١٤، ل٤٢) بـۆ نموونـە وشـەکانی:

(نووسـەر، نـووسراو، پێنـووس، تیـانووس، سەرنووسـەر، ژێرنووس....هتـد) لەسـەر بنچینەی وشەی (نووسین) داهێنراون. کەواتـە داهێنـانی وشـە کردەیەکـە بـەپێی ئـەو پێڕەو و ڕێسا تایبەتییانەی لە زمانەکەدا بوونیان هەیـە. (مبارک، ١٩٩٥، ص١١٨) واتـە لـە ڕێـی گشـتاندن و جێبـەجێکردنی یاسـاکانی وشـەڕۆنانی زمانەکـە بەسـەر کەرستە و وشەکانی تری فەرهەنگی زمانەکە، بەڵام هەندێجار بـەدەر لـە ڕێسـا وشەسـازییەکانی زمانەکەش وشە دادەهێنرێت. سەبارەت بەمەش زمانەوانان پێیان وایە ئەو وشـانەی بـە ڕێسای وشەسازیی زمانەکە دادەهێنرێن، ڕێکـەوتنی زیـاتری بەکاربـەرانی زمانەکـەی لەسەر دەبێت و زووتر دەچنە نێو فەرهەنگی زمانەکەوە. (ئەحمەد، ٢٠١٣، ل١٠١) بۆ ئەم مەبەسـتەش جیـاوازی لـە نێـوان دوو شـێوازی وشـە داهێنانـدا دەکرێـت، یـەکـەمیان پێیدەگوترێت داهێنانی هەڕەمەکی، کە بەشێوەیەکی هەڕەمەکی لەلایەن بەکاربـەرانی زمانەکەدا دادەهێنرێت. دووەمیان ئەو جۆرەیە کە پێیدەگوترێت داهێنانی زانستی، کە لەلایەن دەستەیەکی تایبەتمەندەوە لەسەر بنچینەیەکی زانستی دادەهێنرێت و بڕیاری لەبارەوە دەدرێت. (کالفي، ٢٠٠٨، ص٣٢٦)

کەواتە لەژێر ڕۆشنایی دەسـتووری زمانەکـە بـە سـوود وەرگـرتن لـە وشـەکانی فەرهەنگی نەتەوەیی، بە پەیوەستبوون بە چەند ڕێگایەک وشەی نـوێ دادەهێنرێـت، ڕێگاکانیش بریتین لە:

**١- دارشتن:** یەکێکە لە بڵاوترین کردەی هێنانەکایەی وشەی نوێباو، کە بەهۆی لکانـدنی پێشـگر و پاشـگرە وشـەدارێژەکان لەگـەڵ هـەر وشـەیەک لـە بەشـەکانی ئاخاوتندا، یان لەگەڵ ڕەگێکی بەند دێتە ئـاراوە. هـەروەها هەنـدێ جـاریش بـەهۆی پارادایمی وشەدارێژەکان کە هەمان بنجیـان هەیـە، بـەدی دێـت. (دزەیـی، ٢٠١٣، ل٨٩) وەک وشەکانی:

| وشەی نوێبای دارێژراو | |
|---|---|
| دا (پێشگر) + هات | داهات |
| هاو (پێشگر) + بیر | هاوبیر |

| | |
|---|---|
| نا (پێشگر) + ڕەوا | ناڕەوا |
| پرس + گە (پاشگر) | پرسگە |
| کرد + ە (پاشگر) | کردە |
| شەڕ + ڤان (پاشگر) | شەڕڤان |
| نا (پێشگر) + کۆک + ی (پاشگر) | ناکۆکی |
| بەر (پێشگر) + پرس + یار (پاشگر) | بەرپرسیار |
| هاو (پێشگر) + نیشتمان + ی (پاشگر) | هاونیشتمانی |

**٢- لێکدان:** ڕێگایەکی تری داهێنانی وشەیە، کە بەهۆی یەکگرتنی دوو وشەی سەربەخۆ یان پتر بەپێی بنەما ڕێگادراوەکانی زمانەکە، ڕاستەوخۆ یان بە هۆی ئامرازێکەوە لێکدەدرێن. (محەمەد، ٢٠١١، ل١٩٣) وەک وشەکانی:

| وشەی نوێباوی لێکدراو | |
|---|---|
| ڕۆژ + بوون | ڕۆژبوون |
| مرۆڤ + دۆست | مرۆڤدۆست |
| شا + جوان | شاجوان |
| کەش + و + هەوا | کەشوهەوا |
| دژ + ە + مووشەک | دژەمووشەک |
| ئامادە + باش + ی | ئامادەباشی |
| گشت + پرس + ی | گشتپرسی |
| توند + و + تیژ + ی | توندوتیژی |

**٣- داتاشین:** ڕێگایەکی تری داهێنانی وشەیە، کە بەهۆی کردەی لێکدانەوە ئەنجام دەدرێت، لەم بارەشدا لە ئەنجامی لێکدانی وشەکان، سوان یاخود گۆڕانی دەنگی دێتە ئاراوە. (دزەیی، ٢٠١٣، ل٨٩) ئەم سوان و گۆڕانەش بەسەر یەکێک لە وشەکان یاخود هەردووکیانەوە دادێت. وەک وشەکانی:

| وشەی نوێباوی داتاشراو | |
|---|---|
| کاژێر | لە بنچینەدا لە وشەکانی (کات + ژمێر) پێکهاتووە، دەنگەکانی (ت، م) سواوە |
| دەزگیران | لە بنچینەدا لە وشەکانی (دەست + گیران) پێکهاتووە، دەنگی (س) گۆڕاوە بۆ (ز)، دەنگی (ت) سواوە. |
| تامەزرۆ | لە بنچینەدا لە وشەکانی (تام + ئارەزوو) پێکهاتووە، دەنگەکانی (ئـ، ا، ر) سواوە. |

**٤- وەرگێڕان:** وەک دیاردەیەکی باو لە هەموو زمانێکەوە بەهۆی وەرگێڕانەوە، وشەی نوێباو دێتە کایەوە، ئەمەش لە ڕێگای گواستنەوەی واتای فەرهەنگیی وشەیەک لە زمانێکەوە بۆ زمانێکی دیکە. (وەسمان، ٢٠٠٤، ل٦٠) بۆ نموونە گواستنەوەی واتای فەرهەنگیی وشە لە زمانی عەرەبییەوە بۆ زمانی کوردی بەم شێوەیەی خوارەوە دێتە ئاراوە:

| وشەی نوێباوی وەرگێڕدراو | |
|---|---|
| **وشەی بێگانە** | **وشەی وەرگێڕدراو** |
| تنظيم | ڕێکخستن |
| كاتب | نووسەر |
| سنوي | ساڵانە |
| مخرج | دەرهێنەر |
| معرض | پێشانگا |
| دفاع مدني | بەرگری شارستانی |

**٥- خوازە:** ئەو وشانە دەگرێتەوە، جگە لە واتای ڕاستەقینەیان هەڵگری واتای تری شاراوەن و بە پەیوەستبوون بۆ هۆی بەکارهێنانیان واتا دەدەن. (گەردی، ١٩٧٢، ل٦٨) وەک وشەکانی:

| وشەی نوێباوی خوازەیی | |
|---|---|
| وشەی خوازەیی | واتای ڕاستەقینە |
| تەقاندنەوە | خەبەرلێدان |
| ئاگرنانەوە | ئاژاوەنانەوە |
| سووتاندن | بێ بەشکردن |
| مراندن | ڕێگری لێ کردن لە برەودان |
| نواندن | لە بردانان |
| بڕینەوە | فێڵ لێ کردن |

**٦- زڕەڕێژ:** مەبەست لەو وشانەیە، کە لەڕووی دروستبوونەوە لەسەر هەمان بنەمای وشەسازی زمانێکی بێگانەوە داڕێژراون، هەروەها لەڕووی لێکسیکۆلۆژییەوە هەمان واتا دەبەخشن. بۆ نموونە وشەی (Pronoun)ی ئینگلیزی، کە پێکدێت لە وشەکانی (Pro) واتە (جێ) و (Noun) واتە (ناو)، لە زمانی کوردیشدا وشەی (جێناو) لەسەر هەمان بنەما داڕێژراوە. (البصیر، ١٩٧٩، ل١٧) هەر چەندە لە داڕشتنی ئەم جۆرە وشانەدا سوود لە وشەی فەرهەنگی خۆماڵی وەرگیراوە، کەچی لەڕووی داڕشتنەوە مۆرکێکی وشەی بێگانەیان پێوەدیارە، بۆیە پێیانەدەگوترێت زڕەڕێژ. بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا بە هۆکارێکی سروشتی دادەنرێت، چونکە فەرهەنگی هیچ زمانێک ئەو توانایەی نییە بتوانێت وشەی هاوتا بەرانبەر سەرجەم وشەکانی زمانانی تر دابنێت، بۆیە بەرەچاوکردنی لایەنی فەرهەنگی و ڕێزمانی پەنادەبرێتە بەر ئەم جۆرە داڕشتنە. (عەلی، ٢٠٠٩، ل٣٨) هەروەها بە دەروازەیەکی دەوڵەمەند کردنی زمانەکە دادەنرێت، لە هێنانەکایەی وشەی نوێباودا. وەک وشەکانی:

| وشەی نوێباوی خوازەیی | |
|---|---|
| **فارسی** | **کوردی** |
| شرق شناس | ڕۆژهەڵاتناس |
| | مێژووناس |
| | زماںناس |
| داروسازی | دەرمانسازی |
| | ڕەخنەسازی |
| | وشەسازی |

**٧- ئەکرۆنیم:** ڕێگایەکی تری داهێنانی وشەیە، ئەویش کورتکردنەوەی وشەیەک، یان چەند وشەیەکە بۆ بڕگەی یەکەمی، یان دەنگی یەکەمی و خوێندنەوەیان بەیەکەوە وەک دەنگی پیتەکان. (فەتاح، ٢٠١١، ل١٢٦) واتە لێکدانی کورتکراوەکان لە چوارچێوەی وشەیەکدا. بۆ نموونە: (پ. ز) کورتکراوەی (پێش زایینی)یە، (د. خ) کورتکراوەی (دروودی خوای لەسەر بێت)ە. هەروەها ئەم دیاردەیە لە زمانی کوردییدا لەسەر بنەمای کورتکردنەوە و خوێندنەوەی دەنگی پیتە ئینگلیزییەکانیش بەدی دەکرێت. وەک: (UN) کورتکراوەی (United Nations)ە، کە بوونەتە بنەمایەک بۆ هێنانەکایەی کورتکراوەی تری نوێباودا. وەک:

| ئەکرۆنیمی نوێباو | |
|---|---|
| ئاش | ئاڵای شۆڕش |
| (ژێ، کاف) ژێکاف | ژیانەوەی کوردستان |
| (م. س) میم، سین | مەکتەبی سیاسی |
| Ktv | Kurdistan Television |
| PUK | یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان |
| KNN | Kurdish News Network |

**٨- ئیـدیۆم:** مەبەسـت لـەو گـوزارە، یـاخود دەربڕینـە تایبەتەیـە، کـە وەک (یەکەیەکی زمانی یان نازمانی، لە چوارچێوەیەکی دیاریکراوی بەکارهێناندا نرخێکی واتایی تایبەتی هەیە) (شوانی، ٢٠١٤، ل٢٢٠) و ڕۆڵێکی بەرچاو دەبینێت لە هێنانەکایەی وشەی نوێدا. وەک وشەکانی:

| وشەی ئیدیۆمی نوێباو | |
|---|---|
| بندیوار | فەرمانبەری بێ دەوام |
| قەڵەمتیژ | ڕاپۆرتنووس، جاسووس |
| تۆزوبا | ئۆتۆمبێلی بێ تابلۆی ژمارە و ساڵانە |
| پۆزاوی | لەخۆبایی، لووتبەرز |
| مەشکەژێن | شانتەکێن، مەراییکەر |
| زمانمووس | ئاژاوەگێر |

**٩- بڕینەوە (لێکردنەوە):** کردەی بڕینەوەی بڕگەیەکە لە وشـەیەک بـێ ئـەوەی هیچ گۆڕانێک لە ئەرکەکەی ڕوویدات. ئەمەش بە پشت بەستن بـە ڕۆنـانی بڕگـەیی، نـەک وشەسـازی. واتـە وشـەیەکی دوو بڕگـەیی یـان زیـاتر، کـە هەمیشـە (نـاو)ە کورتدەکرێتەوە. (محمد، ٢٠١٩، ل١٤٤) بۆ نموونە لـە وشـەی (پادشـا) کـردەی بڕینـەوە ئەنجامدراوە، بووە بە (شا)، بێ ئەوەی هیچ گـۆڕانێکی ئـەرکی ڕووبـدات. وەک لـەم نموونانەی خوارەوە ڕوونتر دەردەکەوێت:

| وشە | وشەی کورتکراوە |
|---|---|
| نازەنین | نازە |
| ڕابیعە | ڕابی |
| بێریڤان | بێری |
| مەحەمەد | حەمەد |
| پاشا | شا |

**١٠- کرتاندن و لێکدانەوە (تێکچڕژان):** کردەیەکە بۆ داهێنانی وشەیەکی نوێ، بەکرتاندنی چەند وشەیەک و پاشان لێکدانەوەیان لە چوارچێوەی وشەیەکدا، ئەنجامدەدرێت. هەروەها دەبێت بەپێی ڕێسا و دەستووری وشەسازی زمانەکەوە بێت. (فەتاح، ٢٠١١، ل١٢٦) بۆ ئەوەی واتایەکی ڕوون و بێ گرفت بێنێتە ئاراوە. بۆ نموونە وشەی (ڕۆڤار)، کە بە هۆی کرتاندن و لێکدانەوەی وشەکانی (رۆژنامە) و (گۆڤار) سازدراوە. لە ناوی (ڕۆژنامە) بڕگەی یەکەمی ناوەکە (ڕۆ) وەرگیراوە. لە ناوی (گۆڤار)، ناوی (ڤار) وەرگیراوە. هەروەها ئەم وشانەی خوارەوە بەپێی هەمان کردە سازدراون:

| وشەی نوێباوی تێکچڕژاو | |
|---|---|
| **وشەکان** | **وشەی تێکچڕژاو** |
| سۆرانی - کرمانجی | سۆرمانجی |
| رۆژنامە - نووسین | ڕۆژنامەنووس |
| کۆمەڵ - ناسین | کۆمەڵناسی |
| کوردستان - سەتەلایت | کوردسات |

**١١- پێوانەکردن:** ئەو شێوە دارشتنەیە، بەپێی پێوەری شێوەی دارشتنی ئەو وشانەی، کە بەپێی دەستوورێکی ڕێزمانی و ڕێبازێکی تایبەتەوە داهێنراون و مێژوویەکی دێرینیان هەیە لە فەرهەنگی ڕەسەنی زمانەکە. (عەبدول، ٢٠٠٨، ل١١٥) بۆ نموونە وشەی (جلشۆر) لەسەر بنەمای وشەی (مردووشۆر) سازدراوە. کەواتە بەپێی ئەم پێوەرە وشە ڕەسەنەکانی زمانەکە هەمیشە دەتوانن ببنە بنەمای هێنانەکایەی وشەی نوێ. وەک لەم نموونانەی خوارەوە دەردەکەوێت:

| وشەی نوێباوی پێوانەکراو | |
|---|---|
| **وشەی کۆن** | **وشەی نوێ** |
| سەرپۆش | باڵاپۆش |
| داربەند | تەلبەند |

| | |
|---|---|
| جووتیار | هەستیار |
| شکاندن | ورووژاندن |
| کڵاشچن | هەڵەچن |

**١٢- چاوگی دەستکرد:** جۆرێکی تری داهێنانی وشەیە لەسەر بنەمای چاوگ، کە بەهۆی لکاندنی پاشگری (اندن)ەوە بە (ناو)ێک، یان (ئاوەڵناو)ێکەوە بەدی دێت (ڕەحیمی، ٢٢٠٩، ل٣١) و ڕۆڵی (چاوگی تێپەڕ) دەبینێت. ئەمەش ڕێگایەکی سەرکەوتووە بۆ هێناکایەی وشەی نوێباو، چونکە بەپێی دەستووری وشەسازیی زمانەکە دادەڕێژرێت. وەک وشەکانی:

| وشەی نوێباو لەسەر بنەمای چاوگی دەستکرد | |
|---|---|
| کورد + اندن | کورداندن |
| گشت + اندن | گشتاندن |
| گەوج + اندن | گەوجاندن |
| ڕاست + اندن | ڕاستاندن |
| نرخ + اندن | نرخاندن |
| هەڵم + اندن | هەڵماندن |

**١٣- ژیاندنەوە:** زمانی کوردی بە هەموو زار و شێوەزارەکانییەوە، وەک هەر زمانێکی تری جیهان خاوەن فەرهەنگ و کەلەپوورێکی دەوڵەمەندە. هەرچەندە پێشکەوتنە بەردەوام و جۆراوجۆرەکان و جێهێشتنی قۆناغی پێشوو، هەمیشە هەروەک چۆن هۆکارێکە بۆ هاتنەکایەی وشەی نوێ، بە هەمان شێوەش هۆکارێکە بۆ بەجێمان و لەکارکەوتەیی هەندێ لە وشەکانی پێشوو، کە تەنیا لە فەرهەنگدا یاخود لە بەرهەمە فۆلکلۆرییەکان دەمێننەوە. بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا سەرمایەکی ڕەسەن و بەهاداری نەتەوەیین. بۆیە وەک پێڕەوێکی تری هێنانەکایەی وشەی نوێباو بەرانبەر داهێنانە ناوەکی و دەرەکییەکان، پەنا دەبرێتە بەر وشە کۆنەکان و سەرەڕای واتا کۆنەکانیان بە واتایەکی نوێوە بەکاردەبرێنەوە. (عەبدول، ٢٠٠٨، ل٦٤) وەک وشەکانی:

| وشەی نوێباوی نوێکراوە بەرانبەر وشەی بێگانە | |
|---|---|
| هەگبە | Mail |
| وارگە | Site |
| تۆڕ | Network |
| دەرماڵە | مخصصات |
| ئۆباڵ | ذمة |
| سەرکۆنە | ادانة |

**١٤- پێڕەوی یاسا مۆرفۆسینتاکسییەکان:** سەپاندنی یاسا مۆرفۆسینتاکسییەکان لە ئاستی مۆرفۆلۆجیای زمانی کوردیدا، سەرچاوەیەکی دیکەیە لە هێناکایەی وشەی نوێدا. لەم بارەوەش لە فەرهەنگی زمانی کوردیدا ژمارەیەکی زۆر وشە بەدی دەکرێت، کە بەپێی ئەم بنەمایە داڕێژراون. بۆ نموونە وشەکانی (لێدان، تێگەشتن، تێگەیاندن)، بەم هەنگاوانە داڕێژراون:

تۆ لە ئەوت دا – لێت دا – لێدان

من لە تۆ گەیشتم – من تێت گەیشتم – تێگەشتن

ئەو لە منی گەیاند – تێی گەیاندم – تێگەیاندن

هەروەک لەم نموونانە دەردەکەوێت بە هۆی سەپاندنی یاسا مۆرفۆسینتاکسییەکان لە ئەنجامی گۆڕانی (لە) بۆ (لێ، تێ) و (بە) بۆ (پێ)ی ئەم چاوگانەی ئاماژەمان پێدا، داهێنراون. وەک لەم نموونانەی خوارەوە زیاتر ڕوون دەبێتەوە (ئەمین، ٢٠١٤، ل١٣):

| وشەی نوێباو بەپێی یاسا مۆرفۆسینتاکسییەکان | | |
|---|---|---|
| لە - لێ | لە - تێ | بە - پێ |
| لێکۆڵینەوە | تێروانین | پێزانین |
| لێهاتن | تێرامان | پێگەیاندن |
| لێراهاتن | تێچوون | پێناسین |

| | | |
|---|---|---|
| لێکدانەوە | تێکەوتن | پێسپاردن |
| لێخوڕین | تێخزان | پێکەوەبوون |
| لێپێچانەوە | تێئاڵان | پێکهاتن |

**دووەم: وشەی وەرگیراو**: خواستن یاخود وەرگرتن، گواستنەوەی وشەیە بە هەمان واتاوە لە زمانێکەوە بۆ زمانێکی تر، کە دیاردەیەکی باو و کاریگەرە لە هێنانەکایەی وشەی نوێباودا، هۆکارەکانی ئایینی و کەلتووری و پێشکەوتنی تەکنەلۆجیا و دیاردە نوێیەکان، وادەکات فەرهەنگی هەموو زمانێک لە وەرگرتنی وشەی نوێدا بە هەموو ڕێگا و شێوەکانییەوە دەروازەیەکی هەمیشە کراوەبێت، چونکە فەرهەنگی هیچ زمانێک ناتوانێت بەرانبەر هەر وشەیەکی بێگانە وشەیەکی خۆماڵی دابنێت. (باڵدار، ١٩٨٦، ل٢٢٢) ئەمەش وایکردووە نەتوانرێت سڵ لە هەموو وشەیەکی بێگانە بکرێتەوە، بە تایبەتی لە جیهانی ئەمڕۆدا، لە چوارچێوەی قالبێکی تەسکی تەنیا خۆماڵیدا زمان گەشە بکات و بەرەوپێش بڕوات. کوردیش وەک نەتەوەیەکی دێرین هەر لە دێرزەمانەوە بە هۆی ئەو تێکەڵییەی لەگەڵ نەتەوە و گەلانی تری وەک: (فارس، ئاشووری، کلدانی، ئەرمەنی، یۆنانی، عەرەب، مەغۆل، تورک، ئازەر، بلووژ) هەیبووە، بۆیە هەندێ وشەی ئەو زمانانە تێکەڵ بەیەکدی بوونە، بۆ نموونە عەرەب وشەی (المروج)ی لە وشەی (مێرگ)ی کوردییەوە وەرگرتووە، وشەی (الفردوس)ی لە وشەی (پەرەدایس)ی یۆنانی وەرگرتووە، هەروەها وشەی (زفاف)ی لە وشەی (زەماوەند)ی کوردی وەرگرتووە، کە بەم شێوەیە: زەماوەند > زەڤاڤەند > زەفافەند > زەفافە > زەفاف > زفاف. زمانی تورکیش وشەی (زۆر)ی وەک خۆی (زۆر > Zor) لە کوردی وەرگرتووە. (حەمید، ٢٠٠٩، ل٧٨-٧٩) فەرهەنگی زمانی کوردیش وەک فەرهەنگی هەر زمانێکی تری جیهان بە پەیوەستبوون بەم هۆکارانەی ئاماژەمان پێدا لە وەرگرتن و گواستنەوەی وشەی بێگانە بەدەر نییە و وشەیەکی زۆری بێگانەی بە تایبەتی (عەرەبی و فارسی و ئیگلیزی) وەرگرتووە. (کۆڕ، ١٩٧٧، ل٣) کەواتە بەپێی پێویست وەرگرتنی وشە لە زمانێکەوە بۆ زمانێکی تر وەک دیارەیەکی ئاسایی دەبینرێت. بۆ ئەم مەبەستەش لەوەرگرتنی وشەی بێگانە، دەبێت ڕەچاوی ئەوە

بکرێت وشە وەرگیراوەکە، هەروەک چۆن لە زمانە ڕەسەنەکەی خۆیدا بۆ مەبەست و واتایەکی دیاریکراو داهێنراوە، دەبێت بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ هەر لەو زمانەوە بە هەمان مەبەست و واتاوە بگواسترێتەوە. هەروەها بۆ ئەوەی بکەوێتە بەرگێکی خۆماڵییەوە، پێویستە بخرێتە بەر کاریگەری فۆنەتیکی و دەستووری وشەسازیی زمانە وەرگرەکەوە. (البصیر، ١٩٧٩، ل٥٢-٥٥) کەچی لەگەڵ ئەمەشدا ناتوانرێت بە شێوەیەکی ڕەها پەیڕەوی لەوە بکرێت، هەر وەک لە زمانی کوردیدا دەبینین لە وشە وەرگیراوەکانی پێشوو و ئێستادا دوو ڕێگە پەیڕەوی لێ کراوە. کە بریتین لە:

**١- وەرگرتنی ڕاستەوخۆ:** ئەو وشانە دەگرێتەوە، کە بە شێوەیەکی دەقاودەق لە زمانانی بێگانەوە وەرگیراون و جێی خۆیان گرتووە. وەک وشەکانی: (حەج، زەکات، ئۆتۆماتیک، میتافۆڕ.....هتد). هۆکاری ئەم جۆرە وەرگرتنەش دەگەڕێتەوە بۆ نەبوونی وشەیەکی هاوتا لە فەرهەنگی خۆماڵی، یان بە جیهانیبوونی وشەکە. (واتە بووەتە وشەیەکی جیهانی و بۆ زۆربەی زمانانی تر ڕۆیشتووە) (عەلی، ٢٠٠٩،ل٣٩) و وەک هەر وشەیەکی تری زمانەکە جێی خۆی گرتووە.

**٢- وەرگرتنی ناڕاستەوخۆ:** ئەو وشە وەرگیراوانە دەگرێتەوە، کە لەژێر کاریگەری فۆنۆلۆجییەوە گۆڕانیان بەسەر داهاتووە و لەڕووی فۆڕمەوە تا ئاستێک لە زمانە لێ وەرگیراوەکە دوور کەوتوونەتەوە و سیمایەکی خۆماڵییان وەرگرتووە. بۆ نموونە وشەی (چۆن) لە وشەی (شلۆن)ی عەرەبییەوە وەرگیراوە، بەدوو قۆناغدا تێپەڕیوە، لە سەرەتادا تەنیا دەنگی (ش) گۆڕاوە بۆ دەنگی (چ)، دەنگی (ل)ی لاواز گۆڕاوە بۆ (ڵ)ی قەڵەو، بووە بە (چڵۆن)، پاشان بە تێپەڕبوونی کات دەنگی (ل) سواوە. هەروەها وشەی ( تەلەفۆن) لە وشەی (Telephone)ی ئینگلیزی وەرگیراوە، کە دەنگەکانی (یـ) بۆ (ـە) گۆڕاون. ئەم گۆڕان و سوانەش ئەوە دەردەخات کە وەرگرتنی ناڕاستەوخۆ پەسندترە، چونکە وشە وەرگیراوەکە دەکەوێتە بەر کاریگەری فۆنۆلۆجیی زمانەکە، بەمەش هێزی زمانە وەرگرەکە بەسەر لێوەرگیراوەکە دەردەکەوێت. کاریگەرییەکەش تەنیا لەڕووی فۆڕمەوەیە، نەک واتا. ئەم پرۆسەیەش بە شێوەیەکی هەمیشەیی بەردەوامی هەیە لە هێنانەکایەی وشەی نوێباو، وەک لەم نموونانەی خوارەوە دەردەکەوێت:

| وشەی نوێباوی وەرگیراو | |
|---|---|
| **وشەی وەرگیراوی ڕاستەوخۆ** | **وشەی وەرگیراو** |
| ڤایبەر | Viber |
| فەیسبووک | Facebook |
| تیلیگرام | Telegram |
| **وشەی وەرگیراوی ناڕاستەوخۆ** | **وشەی لێ وەرگیراو** |
| تەلەگراف | Telegraf |
| مۆسیقا | Music |
| کۆمپانیا | Company |
| مۆڵەت | مهلة |
| دەوڵەت | دولة |
| باس | بحث |

جگە لەم دوو ڕێگایەی ئاماژەمان پێدا، لە وەرگرتنی وشەی بێگانە لە فەرهەنگی زمانی کوردیدا، چ لە پێشوو، چ لە ئێستادا جۆرە وەرگرتنێکی دیکە بەدی دەکرێت، کە تاکو ئێستا کەمتر ئاماژەی پێدراوە. ئەویش داڕشتن یان لێکدانی دوو وشەیە، لەسەر بنەمای وشەیەکی وەرگیراو و وشەیەکی خۆماڵی، یان گیرەکێک. بۆ نموونە وشەکانی: (بەدعەمەل، هەورازەخەت، ڕەشەسمەر، خێرکەر، وەفاتنامە، ڕەزامەند.....هتد). بە سەرنجدان لەم وشانەی ئاماژەمان پێدا، وەک دیارە وشە وەرگیراوەکان زیاتر لە زمانی عەرەبییەوە وەرگیراون. بەڵام لە قۆناغی ئێستادا بە هۆی پێشکەوتنە تەکنەلۆجییەکان وشە وەرگیراوەکان لە زمانی ئینگلیزییەوە وەرگیراون و بوونەتە دەروازەیەکی تری هێنانەکایەی وشەی نوێباو. وەک وشەکانی:

| وشەی نوێباو لەسەر بنەمای وەرگرتن و لێکدان | |
|---|---|
| شار + پرێس | شار پرێس |
| تیشک + نێت | تیشکنێت |

| | |
|---|---|
| زانکۆ + لاین | زانکۆلاین |
| هەگبە + ی + ئەلیکترۆنی | هەگبەی ئەلیکترۆنی |
| کورد + ماکس | کوردماکس |
| هاک + کەر | هاککەر |

بەسەرنجدان لە هەموو ئەو وشە نوێباوانەی خستمانە ڕوو، ئەوە ڕوون دەبێتەوە، کە زمانی ڕۆژنامەنووسی لە برەودان و گەیاندنیان بۆ نێو جەماوەر ڕۆڵێکی کارای هەیە. کەواتە بەدوور لە زمانی ڕۆژنامەنووسی، داهێنان و هێنانەکایەی وشەی نوێباو، ناتوانرێت وا بە سانایی پەرەی پێبدرێت و وەک پێویست جێی خۆی بگرێت. هەروەک لە هەندێ سەرچاوە دەیان وشەی داهێنراو، لە لایەن شارەزایانەوە، چ لە ئاستی تاکەکەسی، چ لە ئاستی دەستەی تایبەتمەندەوە بەدی دەکرێت، کە لە بەرانبەر وشەی وەرگیراو، یاخود زرەڕێژ داهێنراون. بەڵام تاکو ئێستا وەک وشەی سست ماونەتەوە. بۆ نموونە ئەو وشانەی کە لە ئاستی تاکەکەسییەوە پێشنیاز کراون. وەک لەم خشتەیەی خوارەوە لە بەرانبەر وشە چالاکەکان ئاماژە بە هەندێکیان دەدەین: (حەبیب، ٢٠١٣، ل١٢-١٣)

| **وشە چالاکەکان** | **وشە سستەکان** |
|---|---|
| ئامادەباشی | خۆسازدان |
| ڕێنمایی | ڕێنوێنی |
| سازش | کۆڵدان |
| سەرمایەگوزاری | دەسمایەگێری |
| کەنارگیر | لاپەڕگر |
| فریاگوزاری | بەهاناچوون |
| میانگیری | نێوانگری |
| ناوزەد | ناوبردن |
| کۆمەکبەخش | هاریکار |
| هۆشداری | ورياداری |

هەروەها زۆرێک لەو وشانەی کە چەند دەیەیەک لەمەوبەر لەلایەن (ئەنجومەنی کۆڕی زانیاری کورد -بەغدا) لە بەرانبەر وشەی وەرگیراودا، داهێنراون و پێشنیازکراون، تاکو ئێستا وەک پێویست نەکەوتوونەتە برەو. (بڕوانە: کۆڕ، ١٩٧٧) وەک لە خوارەوە ئاماژە بە بەشێکیان دەدەین:

| وشەی وەرگیراو | وشەی داهێنراو |
|---|---|
| اديب | وێژەوان |
| جنسية | زێدیاری |
| مطابق | یەکچین |
| حلقة | گەو |
| سائق | ئاژیار، هاژۆ |
| طابعة | تیپنووس |
| قائمقام | هەرێمدار |
| سايلو | کەندوو |
| قسط | پاژ |
| لحظة | ترووکە |
| واعظ | پەندیار |
| ضريبة الارض | زەویانە |
| الطريق الرئيسي | شاڕێ |
| عسكري | سوپایی |
| مخالفة | سووچ |
| مستوصف | تیمارگە |
| مناقصة | کەمگریی |
| مواطن | هاوزێد |
| مبيعات | فرۆتەنی |

وەک لەم وشانەدا دەردەکەوێت، کە بەپێی بنەما و ڕێسا تایبەتییەکانی زمانەکە و بە سوود وەرگرتن لە فەرهەنگی خۆماڵی داهێنراون. بۆیە پێویست دەکات لەلایەن ئامرازەکانی ڕۆژنامەنووسییەوە، وەک وشەی نوێباوی خۆماڵی لە بەرانبەر وشەی وەرگیراودا بهێنرێنە کایەی بەکاربردن و برەویان پێبدرێت، بۆ ئەوەی گەشە و بزوینێکی تەندروست بە زمانەکە ببەخشن. جگە لەمەش هەوڵی زیندوو کردنەوەی وشە ڕەسەنە سست بووەکان بدرێت لە بەرگێکی نوێدا، وەک وشەکانی: **(گۆنگەر، قانـدڕ، بەرانگژ، پەڕەتیرە، بنیسان، هەتوان، هودمگرتن، لامل، گۆردە، ئیدڵی، تیکردنەوە، باوەگۆ، زەلاندن، هاوێر، مرتە، پێلێنان، نادین،........هتد)**. هەر وەک چۆن لەم کات و ساتەدا بە هۆی ئامرازەکانی ڕۆژنامەنووسییەوە، لەسەر ئاستی هەموو ئەو ڕێگایانەی پێشتر ئاماژەمان پێدا، ڕۆژانە وشەی نوێباو دەخرێنە ڕوو. وەک وشەکانی: **(دەمامک، کەرەتین، کۆڕۆنا، تواناسازی، ئالنگاری، ڕەوانشاد، بەربژێر، هاوسەرۆک، ساڵبوون، داعش، سەرکۆنە، پلازما، هەنگەوانی، لێکەوتە، دەرکەوتە، ڤیدیۆ کۆنفرانس، شێلانخانە، هێڵی گەرم، ڤاگسین، دژەڤایرۆس، کۆڕۆژ، کۆباس، ڕووماڵ، تۆڕی ڕاگەیاندن، پانێل، دیبەیت، چاودێری سیاسی، پلەباڵا، مژار، پێشهات، مەبەستناسی، ڕوانگە، گشتپرسی، دەوڵەتمەدار، کۆدەنگی، کۆکراپی ......هتد)**.

**ئەنجام**

گرنگترین ئەنجامی لێکۆڵینەوەکە لەم خاڵانەی خوارەوە دەخەینەڕوو:

١- زمانی ڕۆژنامەنووسی وەک خێراترین ئامرازی پەرەپێدانی وشەی نوێ، بەشێوەیەکی گشتی بایەخ و بەرەوی بەو وشانە داوە، کە لەلایەن شارەزایانەوە داهێنراون، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا وشەگەلێک بەدی دەکرێت کە شێوەیەکی هەڕەمەکی یاخود بەدەر لە دەستووری وشەسازی زمانەکە داهێراون.

٢- لە پێڕەوی دارِشتندا، جگە لە (پێشگر و پاشگر)ەکان ئامرازەکانی (لە، بە) بە هۆی سەپاندنی یاسا مۆڕفۆسینتاکسییەکان ڕۆڵی گرنگیان بینیوە، لە دارِشتنی وشەی نوێدا.

٣- وشەی وەرگیراو بەشێوەکی گشتی لە قۆناغەکانی پێشوودا زیاتر لە زمانەکانی (عەرەبی و فارسی) وەرگیراون، بەڵام لە قۆناغی ئێستادا بە هۆی دیاردە و پێشکەوتنە تەکنەلۆجییەکاندا زیاتر وشەی ئینگلیزی بەدی دەکرێت.

٤- لە وەرگرتندا وەرگرتنی ناڕاستەوخۆ پەسندترە، چونکە وشە وەرگیراوەکە دەکەوێتە بەر کاریگەری فۆنۆلۆجیی زمانەکە و بەمەش هێزی زمانی وەرگر دەردەکەوێت.

٥- پێڕەوی داتاشین و پێڕەوی کرتاندن و لێکدان بەهۆی ئەوەی پڕۆسەیەکی سانا نییە، بۆیە لە هێنانەکایەی وشەی نوێباودا کەمتر سوودی لێوەرگیراوە.

٦- جگە لە پێڕەوە باوەکانی هێنانەکایەی وشەی نوێباو، شێوەیەکی تریش بەدی دەکرێت، کە بریتییە لە وەرگرتنی وشەیەکی بێگانە و لێکدانی لەگەڵ وشەیەکی خۆماڵی.

**سەرچاوەکان**

**یەکەم: بە زمانی کوردی**

**أ- کتێب:**

١- ئەحمەد، صافیە محەمەد. (٢٠١٣)، لادان لە شیعری هاوچەرخی کوردیدا، چاپخانەی حاجی هاشم- هەولێر.
٢- ئەمین، نووری عەلی. (٢٠١٤)، ڕێزمانی کوردی، چاپی چوارەم، چاپخانەی ڕۆژهەڵات- هەولێر.
٣-البصیر، کامل حسن. (١٩٧٩)، زاراوەی کوردی، چاپخانەی زانکۆی سلێمانی- سلێمانی.
٤- حەبیب، بەدران ئەحمەد. (٢٠١٣)، ماڵە وێرانەکەمان، چاپی یەکەم، چاپخانەی ئاراس- هەولێر.
٥- حاجی مارف، ئەوڕەحمانی. (١٩٧٥)، وشەی زمانی کوردی، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد- بەغداد.
٦- حاجی مارف، ئەوڕەحمانی. (٢٠١٤)، وشەڕۆنان لە زمانی کوردیدا، چاپخانەی ڕۆژهەڵات- هەولێر.
٧- حەمە غەریب، هێرۆ ئەحمەد. (٢٠١٤) یاسا و پرەنسیپەکانی زمانی نووسین لە ڕاگەیاندنی کوردیدا، نامەی دکتۆرا، کۆلێژی زانستە مرۆڤایەتییەکان، بەشی کوردی- زانکۆی سلێمانی.
٨- حەمید، ساکار ئەنوەر، (٢٠٠٩)، وشە خواستن لە زمانی کوردیدا، نامەی ماستەر، کۆلێژی زمان، زانکۆی سەلاحەددین.
٩- دزەیی، عەبدولواحد موشیر. (٢٠١١) لێکسیکۆلۆجی، چاپخانەی ماردین- هەولێر.
١٠- دزەیی، عەبدولواحد موشیر. (٢٠١٤)، ڕێزمانی کوردی، چاپی یەکەم، بڵاوکراوەی ناوەندی ئاوێر- هەولێر.
١١- دزەیی، عەبدولواحد موشیر. (٢٠١٣)، وشەسازی، چاپی یەکەم، بڵاوکراوەکانی کتێبخانەی ئاوێر- هەولێر.
١٢- دزەیی، عەبدولواحد موشیر .(٢٠٠٥)، ڕەهەندی دەروونی لە بواری ڕاگەیاندن دا،، چاپی یەکەم، چاپخانەی شەهاب- هەولێر.
١٣- ڕەحیمی، کامەران. (٢٠٠٩)، بنەماکانی وشەسازی و وشەڕۆنان لە زمانی کوردیدا، چاپی یەکەم، بڵاوکراوەی کۆڕی زانستی زمانی کوردی- ئێران.
١٤- روخزادی، عەلی. (٢٠١٠)، ڕێزمانی کوردی سۆرانی، چاپی یەکەم، انتشارات کوردستان- سنە.
١٥- سالح، ئاسیا سەلیم. (٢٠١٧)، پەیڤێن نوی بەلاڤ د زمانێ کوردیدا، نامەی ماستەر، کۆلیژی پەروەردەی بنیات- زانکۆی دهۆک.
١٦- سەبری، شێرزاد و مونیب ئازاد، (٢٠١٦)، وشەسازی، چاپی یەکەم، چاپخانەی هێڤی- هەولێر.

١٧- شوانی، ڕەفیق. (٢٠١٤)، وشەسازی زمانی کوردی، چاپی دووەم، چاپخانەی داودی- کەرکوک.
١٨- عەبدول، جەمال. (٢٠٠٨)، بەرکولێکی زاراوەسازی کوردی، چاپی دووەم، چاپخانەی خانی- دهۆک.
١٩- عەلی، صباح موسا. (٢٠٠٩)، ڕەنگدانەوەی چەند لایەنێکی واتاسازی لە ڕۆژنامەنووسیی کوردی عێراقدا، چاپی یەکەم، چاپخانەی ئاراس- هەولێر.
٢٠- فەتاح، محمد معروف. (٢٠١١)، زمانەوانی، چاپی سێیەم، چاپخانەی حاجی هاشم- هەولێر.
٢١- کۆڕ، ئەنجومەنی. (١٩٧٧)، زاراوەی کارگێڕی، چاپی دووەم، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد- بەغدا.
٢٢- گەردی، عەزیز. (١٩٧٢)، ڕەوانبێژی لە ئەدەبی کوردیدا، بەرگی یەکەم، چاپی یەکەم، چاپخانەی دارالجاحظ- بەغداد.
٢٣- محمد، حاتم ولیا. (٢٠١٩)، مۆرفۆلۆجی، چاپی یەکەم.
٢٤- محەمەد، مەسعوود. (٢٠١١)، زاراوەسازی پێوانە، چاپی دووەم، چاپخانەی ئاراس- هەولێر.
٢٥- هەورامانی، محەمەد ئەمین. (١٩٨١)، زاری زمانی کوردی لە ترازووی بەراورددا، بڵاوکراوەی دەزگای ڕۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی- بەغدا.
٢٦- وەسمان، محەمەد. (٢٠٠٤)، گیروگرفتەکانی زاراوە دانان لە زمانی کوردیدا- هەولێر.

**ب- گۆڤارەکان:**

٢٧- ئەمین، وریا عومەر. (٢٠١٤)، مۆرفۆسینتاکس وەک سەرچاوەیێک بۆ داڕشتنی وشە لە زمانی کوردیدا، گ، (ئەکادیمیای کوردی)، ژ، ٢٩– هەولێر.
٢٨- باڵدار، ئیبراهیم ئەمین. (١٩٨٦)، زاراوە و زمان لە کاروانی زانیاری ئەمڕۆدا، گ، (ڕۆشنبیری نوێ)، ژ ١١٢- بەغدا.

**دووەم: بەزمانی عەرەبی:**

٢٩- جمعة، حسن. (٢٠٠٢)، في جمالية الكلمة، دراسة جمالية بلاغية نقدية، منشورات اتحاد الكتاب العرب- دمشق.
٣٠- كالفي، لويس جان. (٢٠٠٨)، حرب اللغات والسياسات اللغوية، ترجمة حسن حمزة، طبعة الاولى، المنظمة العالمية للترجمة- بيروت.
٣١- مبارك، مبارك. (١٩٩٥)، معجم المصطلحات الالسنية، الطبعة الاولى، دار الفكر اللبناني- بيروت.

**سێیەم: بە زمانی ئینگلیزی:**

32- Anderson, Gamesm, (2006), the linguistics encyclopedia (Ebooked), malmiar Kirsten- London.

## ملخص البحث

## دور اللغة الصحفية في تطوير الكلمات المولودة

**بارزان كانبي طاهر محمد**
قسم اللغة الكوردية – كلية اللغات
جامعة صلاح الدين - اربيل

اللغة كأداة للتعبير هي ظاهرة اجتماعية ومعاصرة تتغير باستمرار وتتطور، وفى هذا الصدد في علم الصرف لأن اي ظهور او ابداع داخلي او خارجي مرتبط باسم، لهذه الغاية اذا لا يمكن لأي لغة عالمية ان تعتمد على قاموس الكلمات الخاص بها بشكل كامل، لذلك يجب ابداع او استعارة الكلمات و تسمى هذا الكلمات الجديدة من أجل تعميمها وايصالها الى جميع فئات المجتمع وتلعب اللغة الصحفية دورا فعالا في تطويرها وتثبيتها مثل اي كلمة اخرى.

في القاموس هذا البحث تحت عنوان (دور اللغة الصحفية في تطوير الكلمات المولودة)، اللغوية الجديدة هي محاولة لعرض اسباب ظهور النوع وطرق تحقيقها كما يلقي الضوء على ابداع (الكلمات المولودة) وبسبب اللغة الصحفية في الإيصال ونقلها، كمثال تم استعارة الكلمات من الشبكات الاعلامية.

## Abstract

### The role of Journalistic Language in Neologism

Language as a tool for expression is a social and contemporary phenomenon which is continuously changing and growing, in this regard at Morphology level, because any emergence and any internal or external invention will be attached to a a name to this end any world languages cannot depend on it's own dictionary words, therefore it must invent or receive a word, this word in the preface is called neologism in order to circulate and communicate it into the the classes of of the society, the journalistc language playes an effective role to developing and fix it like any other word in the language's dictionary.

This research under the title of (The role of Journalistic Language in Neologism), is an attempt to display the reasons of the emergence of type and the ways of bringing about the (Neologism) also sheds light on these words that due to journalistic language in communicatung and transporting them, in this regard the words are received as an example the Media Networks.

# دەقی کراوە، بنەما و پراکتیک
# دەقی (زێوان)ی سەباح ڕەنجدەر بەنموونە

**پ.ی.د.سامان عیزەدین سەعدوون**
بەشی کوردی
زانکۆی چەرموو/ چەمچەماڵ

**پێشەکی**

سەباح ڕەنجدەر شاعیرێکی دیاری قۆناغی نوێگەریی کوردییە، خاوەنی تایبەتمەندی شێوازی شیعریی خۆیەتی، زۆری لەبارەوە نووسراوە . دەقی زێوانی، لە تەمەنی بیست و سێ ساڵیدا نووسیوە، شاعیر لە ساڵی ١٩٨٣ دەستی بە نووسینی زێوان کردووە و لە ١٩٨٧ تەواوی دەکات . تاقیکردنەوەیەکی نوێی شیعریی کۆتای ساڵانی هەشتاکانە . ئەم دەقە لە لایەن چەند توێژەرێکەوە خوێندنەوەی بۆ کراوە . ئەوەی جێی سەرنجە ئەوەیە ئەم دەقە، یەکێکە لە دەقە درێژەکانی شیعری قۆناغەکە، کە بە درێژترین دەقی شیعری دادەنرێت و بۆخۆی لە شێواز و بنیاتی زماندا جیاواز و نوێ بوو، تەنانەت ئەوەندە تازە بوو، ڕێگە نەدراوە چاپ بکرێت و بڵاوبێتەوە، دوای چەند هەوڵێك ئینجا ڕێگای پێدراوە .

ئامانجی توێژینەوەکە ئەوەیە کە زانستییانە بە دروستی چەمك و واتای دەقی کراوە بەو شێوازەی کە ئیکۆ دیاری کردووە بخاتە ڕوو . هەروەها ڕەوینەوەی تەمومژی سەر ئەم چەمکە و تێکەڵکردنی لەگەڵ چەمکی تردا، کە لای هەندێ لە ڕەخنەگران و شاعیرانی کورد و عەرەب بە واتا ئیکۆییەکەی لێی ناڕوانن، ئامانجێکی تری توێژینەوەکەیە . دەقی کراوە هەروەك ئیکۆ ئاماژەی پێکردووە زیاتر لە خوێندنەوەیەك و لێکدانەوەیەك هەڵدەگرێت . لەو ڕوانگەیەوە بۆ خوێندنەوە و لێکدانەوەی دەقی زێوان ئێمە میتۆدی تەواوکاریمان لە ڕوانگەی ڕەخنەی خوێنەرەوە بەکارهێناوە .کاتێ کە ڕوو لە شیکردنەوەی دەقی زێوان دەکەین تەنیا لە یەك گۆشە نیگاوە لێی ناڕوانین، بەڵکو پێمان وایە دەق لە ڕوانگەی ئەو میتۆدە

رەخنەییانەی کە دەسەڵات بە خوێنەر دەدەن و وەك ناوەندێك رۆڵەکەی بە گرنگ دەزانن لە لێکدانەوەی واتادا تا ئەو ئەندازەیەی کە زیاتر لە خوێندنەوە و لێکدانەوەیەك بۆ دەق بکرێت .

بۆ یەکەم جارە لە رەخنەی کوردیدا لەبەر رۆشنایی بنەماکانی تیۆری دەقی کراوەدا خوێندنەوە بۆ دەقی شیعری زێوان دەکرێ . بۆ گەڕان بەدوای واتای نوێدا، لێکدانەوە و خوێندنەوەی جیاوازی لەبارەوە دەخەینە روو . ئەم کارەش بۆخۆی زێندوویتی دەقەکە دەردەخات، چونکە دەقەکە لە ئاکامی تاقیکردنەوەیەکی راستەقینەی شاعیر و سۆزێکی راستەقینەوە دروست بووە . وەك ئەوەی خوێنەر خۆی لەبەردەم گێڕانەوەی ژیاننامەی خۆیدا بێت نەك شاعیر ئەمەش سیحری گێڕانەوەیە بەو زمانە شیعرییەی کە لە پشتی دەقەکەوە خوێنەر ئاراستەدەکەن . دیارە هەر ئەم راستییەش هۆکاری سەرەکییە وەك پاڵنەری نووسینی ئەم توێژینەوەیە . دەق لە مانای خۆیدا کەلەبەرێکی گەورە دەهێڵێتەوە بۆ گوتنی تر و بیرکردنەوەی تر و هاوبەشیکردنی تر کە خوێنەر رادەکێشێتە بازنەی بوونی خۆیەوە .

بەم پێیە سوود لە میتۆدە رەخنەییەکان و هەموو تێڕوانینێکی رەخنەیی وەردەگرین بۆ گەیشتن بە جیهانبینی دەقەکە لە رێگای کارکردن لەسەر زمان و کردنەوەی کۆدەکانی دەق و ئاماژەکانی بە مەبەستی ئاشکراکردنی مانای دەق کە لە چوارچێوەی دەقەکە دەرناچین و لە مانای بنەڕەتی دەقەکە دوور ناکەوینەوە .

## بەشی یەکەم: چەمکی دەقی کراوە

دەقی کراوە وەك چەمکێکی رەخنەیی دوای بونیادگەری هاتۆتە ناو بواری رەخنەی ئەدەبییەوە . ئەم تیۆرە نوێیەی رەخنە کە بۆ خۆی دەستنیشانکردنی جۆرێکی نوێی خوێندنەوەی دەقی ئەدەبییە، پەیوەندی بە هەموو چەشن و ژانرە ئەدەبییەکانەوە هەیە . ((ئەم چەمکە لە بنەڕەتدا بۆ فەیلەسوف و نووسەری ئیتالی ئیمرتۆئیکۆ دەگەڕێتەوە کە لە کتێبی رۆڵی خوێنەر (the role of readar) بەشێك لە دەقەکان بە هۆی بوونی توانای راڤەکاری تیایاندا بە دەقی کراوە (Open text) پێناسە دەکات. لەلایەنە سیمانتیکییەکەیەوە لێکدانەوەی هێما و نیشانەکانە، لەلایەنە

میتۆدییەکەیشیەوە بەپێی هەردوو میتۆدی هێرمینۆتیکا و وەرگرتن، دەقی کراوە زیاتر لە خوێندنەوەیەك هەڵدەگرێ.)). (https://en.wikipedia.org/wiki/Open_text). لە بەرانبەردا دەقی تریشمان هەن بۆ نموونە دەقە پۆلیسییەکان یان دەقە گاڵتە ئامێزەکان، کە پێیان دەڵێین دەقی داخراو (closed text) ئەم دەقانە یەك ئامانجیان هەیە و خاوەنی توانایەکی کەمی وەرگرتن و پەسەندکردنی لێکدانەوەن .(د. رباب هاشم حسين . https://www.google.com). ئیکۆ زاراوەی دەقی کراوەی لە ۱۹۵۸ داهێناوە، کتێبێکی بە ناونیشانی (کاری کراوە) چاپکردووە، لەو کتێبەیدا ئەو راستییە دەخاتە بەردەست کە دەق کراوەیە لەوەی کە چەند مانا و چەند لێکدانەوەیەك هەڵدەگرێ . ئیکۆ بنەماکانی دەقی کراوەی لە کارە مۆسیقییە کلاسیکییەکان و رۆمانەکانی جیمس جۆیس، بەتایبەتی نموونەی رۆمانی (یۆلیسیس) دۆزیوەتەوە . پاشان هەندێ لە شانۆنامەکانی برتۆلد برێخت و نموونەی تێکستە شیعرییەکانی فێرلین و مالارمێ وەك دەقی کراوە پێشکەش دەکات . بەتایبەتی (وەرزێك لە دۆزەخ)ی شاعیری نوێخوازی فەرەنسی رامبۆ (١٨٥٤ – ١٨٩١)) . (نەوزاد ئەحمەد،فەرهەنگی زاراوەی ئەدەبی، ٢٠١١، ٣٤٥)

لەوانەی خرانە روو چەند راستییەکمان بۆ رووندەبێتەوە: یەکەمیان ئەوەیە کە ئەم چەمکە نوێیە لەدوای ئەوەی ئیکۆ لە ۱۹۵۸ دایهێناوە کەوتۆتە نێو تیۆرەکانی رەخنەی ئەدەبییەوە . دووەم بریتییە لەوەی کە دەستنیشانکردنی دەقی کراوە لەنێو دەقە ئەدەبییەکاندا پەیوەندی بە کۆنی و نوێی دەقەکانەوە نییە . راستییەکی تریش ئەوەیە کە بناغەی ئەم تیۆرییەی لەسەر بنیات نراوە ئەوەیە، کە دەق لە خۆیدا چەندین خوێندنەوەی شیاو هەڵدەگرێ . سەرهەڵدانی ئەم چەمکە پەیوەندی بە قۆناغی دوای بونیاد گەرییەوە هەیە، بەدیاریکراوی دوای تیۆری ئیستاتیکای وەرگرتن. کەواتە دەقی کراوەی بەرهەمهاتوو پەیوەندی بە سەرهەڵدانی چەمکی دەقی کراوەی ئیکۆوە نییە .

توێژەرانی بواری رەخنەی عەرەبی مێژووی سەرهەڵدانی ئەم چەمکە دەگەڕێننەوە بۆ دەقێکی فازل عەزاوی بە ناونیشانی (مخلوقات فاضل عزاوي الجميلة) کە بۆخۆی ئاوێتەیەکە لە ژانرە ئەدەبییەکان، هەروەکو خۆیشی ئاماژەی

پێدەکات و دەڵێ ((کاتێ دەقی مخلوقات الجمیلەم لەناوەڕاستی شەستەکاندا نووسی لە پێشەکییەکی کورتدا ئاماژەم بەوە داوە کە ئەم دەقە دەقێکی کراوەیە، لەکاتێکدا ئەم چەمکە هێشتا دەرنەکەوتبوو .))(سیڤا علی، ۲۰۱۹،النص المفتوح، ۱۲) . شاعیر مەبەستی ئەوەیە لە ناوەڕاستی شەستەکان هێشتا دەقی کراوە دەرنەکەوتبوو، ئەو دەقێکی کراوەی نووسیوە . ئەم هەڵە تێگەیشتنە لە ئەدەبی عەرەبیدا لێرەوە سەری هەڵدا، کە بەلایەوە دەقی کراوە جۆرێکە لە فۆرمێکی نوێ کە شاعیر خۆی بۆ بەرهەمهێنانی ئامادە دەکات و ئاوێتەیەکە لە ژانرە ئەدەبییەکان . بەڵام بە مانا ئیکۆیەکەی ئەم چەمکە پەیوەندی بە تیۆری خوێندنەوەوە هەیە نەك بە فۆرمی دەق، پاشان ئەوەندەی پەیوەستە بە خوێنەر و خوێندنەوەوە، ئەوەندە پەیوەست نییە بە نووسەرەوە . چونکە دەقی کراوە فۆرم نییە، بەڵکو بەو دەقە دەوترێ کە خوێنەر لێکدانەوەی هەمە جۆری بۆ دەکات . شاعیر ناتوانێت ناوی دەقی کراوە لە بەرهەمەکەی خۆی بنێت، بەڵکو ئەوە خوێنەرەکانن لە ئاکامی فرە خوێندنەوەیان بۆ دەقەکان ئەو ناوە بەدەقەکان دەبەخشن.

بەم پێیە رەخنەگرانی عەرەب تێڕوانینیان بۆ چەمکی دەقی کراوە جیاوازە لە تیروانینی ئیکۆ. بۆنموونە عەزاوی جەخت لەوە دەکاتەوە کە دەقی کراوە ((جۆرێکە لە نووسین هەموو ژانرەکان رێکدەخات : شیعر، رۆمان، چیرۆك، شانۆ لە پێناو گەیشتن بە نووسینێك کە لە شێوە و شێوازدا جیاواز بێ))(سیڤا علی، ۲۰۱۹،النص المفتوح، ۱۲) هەر بۆیە بە لای هەندێکیانەوە ((دەقی کراوە بە منداڵی شەرعی پەخشانە شیعری عەرەبی لەقەڵەم دەدەن)) .(د. رباب هاشم حسین . النص المفتوح https://www.google.com ). بەلای سەلاح فەزلەوە کرانەوەی دەق ((بریتییە لە توانای دەق بۆ ورووژاندنی ژمارەیەکی زۆر لە دەلالەت و وەڵامدانەوەی پەسەند واتە کرانەوەی بۆ راڤە و لێکدانەوە. بەپێی ئەم چەمکەش کرانەوە لە بنەماکانی شیعری نوێگەرییە)). (د. صلاح فضل. التخیل من فئات الادب والنقد . ۱۹۹٦ .۱۱۲). ئەوەی جێی سەرنجە ئەوەیە سەلاح خۆی لەوان جیادەکاتەوە کە پێی وایە دەقی کراوە واتە کرانەوەی بۆ راڤە و لێکدانەوە، بەڵام لەوەدا هاوڕانیم لەگەڵیدا کە چەمکی کرانەوە دەبەستێتەوە بە قۆناغی نوێگەرییەوە لەکاتێکدا ئەم چەمکە لەئاکامی خوێندنەوەی

بەرهەمی کلاسیکییەوە سەری هەڵداوە . لەو روانگانەوە رەخنەگرانی عەرەب سێ رێچکەی سەرەکی بۆ تێگەیشتن لە چەمکی دەقی کراوە دیاری دەکەن کە ئەمانەن: رێچکەی یەکەم : کرانەوەی ژانری واتا شیعر دەکرێتەوە لە رووی هونەر و ژانرە ئەدەبییەکاندا . رێچکەی دووەم کرانەوە بە رووی لێکدانەوەدا. کاتێ دەق ئەوە هەڵدەگرێ کە چەند مانا و ئاماژە و راڤەیەکی لەناوئاخندا حەشاردابێ ئەمەش بە هۆی فرە لێکدانەوەوەیە . رێچکەی سێیەم بریتییە لە کرانەوەی مەعریفی واتە دەق دەکرێتەوە بەرووی مەعریفە و رۆشنبیری و زانستدا . (سیڤا علی، ٢٠١٩، النص المفتوح،١٤) بەم پێیە لە ئەدەبی عەرەبیدا بە هەڵە باس لەوە دەکەن کە شیعری کراوە دوا فۆرمی دەقی شیعرییە لەدوای شیعری پەخشانییەوە وەکو ژانرێکی نوێی شیعری لێی دەروانن کە سیماکانی ژانری ئەدەبی و هونەرەکانی تری تێدا بەکار هاتووە .

دەقی کراوە لە رەخنەی کوردیدا لە رووی تیۆرییەوە لە ئیکۆوە هاتۆتە ناو ئەدەبی کوردییەوە ئەویش بە دوو تێگەیشتن یەکەمیان ئەوانەن کە راستەوخۆ لە سەرچاوە رەسەنەکەیەوە وەریانگرتووە زۆرینەن (عەتا قەرەداغی، نەوزاد ئەحمەد ئەسوەد . زاهیر لەتیف، عەبدوڵڵا تاهیر بەرزنجی، حوسێن لەتیف، رێبوار سیوەیلی، فوئاد رەشید ....) د. فوئاد رەشید لە توێژینەوەیەکیدا، زانستانە زاراوە و چەمکی دەقی کراوەی روونکردۆتەوە، کە پێی وایە (چەمکی کرانەوە راستەوخۆ پەیوەستە بە رادەی کرانەوەی دەق لەبەردەم کردەی راڤەکاری و خوێندنەوەی جیاوازدا . هەڵبەتە هەموو دەقەکان واتای کرانەوەیان نەك هەروەك یەك نییە، بەڵکو هەندێ دەق خوێندنەوەیەکی دیاریکراو هەڵدەگرن و رێگە بە لێکدانەوە و راڤەکردنی جیاواز نادات ئیکۆ ئەم جۆرە دەقانەی بە دەقی داخراو لەقەڵەمداوە) . (فوئاد رەشید، ٢٠١٩، ل٣).

چەمکی دەقی کراوە لە روانگەی ئیکۆوە ئەو دەقەیە کە بەسەر هەموو راڤەکردنێکی شیاودا دەکرێتەوە، یانی وەك دەڵێت هەموو تەئویلێك قبوڵ دەکات . (عەبدوڵڵا تاهیر بەرزنجی. ژ. ٢٠٠٦،٣٥). نەوزاد ئەحمەد ئەسوەد دەقی کراوەی وەکو چەمکێکی راڤەیی بۆ خوێندنەوە و لێکدانەوەی دەقی شیعری ئەحمەدی مەلا بەکارهێناوە، پێی وایە ((دەقی کراوە خوێندنەوەی کراوەمان بۆ دەڕەخسێنێ کە

بەقەدەر ژمارەی خوێنەرانی ئەم دەقە خوێندنەوەی جۆراوجۆر و کاریگەری ئەم خوێندنەوانە دروست دەکات . ئەم جیاوازییەی نێوان دەستەواژەکان، خوێندنەوەکە بەکراوەیی جێدەهێڵێ)) (نەوزاد ئەحمەد ئەسوەد، ٢٠٠٦ .١٤٧) . سەلاح حەسەن پاڵەوان کتێبێکی بە ناونیشانی شیعری کراوە لە ئەزموونی شیعری نوێی کوردیدا بڵاوکردۆتەوە، کە کاری لەسەر دوو بەرهەمی سەباح ڕەنجدەر کردووە، وەك هەوڵێك بۆ خوێندنەوەی دەقەکانی نێو ئەو دوو بەرهەمە، بەڵام بە بێ ئەوەی ئاماژە بە چەمکی شیعری کراوە بکات کە چییە ؟ هەروەها بێ ئەوەی ڕوونی بکاتەوە بۆ ئەم ناونیشانەی هەڵبژاردووە ؟. د. زاهیر لەتیف لەم بارەیەوە بۆچوونەکانی لەوەدا کۆدەکاتەوە کە هێڵی سوور لە نێوان دەقی کراوە و دەقی داخراودا بوونیان نامێنێت بە دیوێکی تردا دەقەکان ئاسان بن یان ئاڵۆز ئەوا لە یەك کاتدا هەڵگری فرەمانایی و تاکگەراییە .(د. زاهیر لەتیف . جێگۆڕکێی دەقی کراوە و دەقی داخراو . سایتی خاك) . دووەمیان ئەوانەن، کە ڕاستەوخۆ لەو ڕەخنەگرانەی عەرەبەوە وەریانگرتووە، کە بە هەڵە چەمکی دەقی کراوەیان پێناسەکردووە لێرەدا ئاماژە بە بۆچوونی شێرکۆ بێکەسی شاعیر دەکەین، کە لەبارەی دەقی کراوەوە لە پێشەکی کتێبی ملوانکەدا دەڵێ ((مەبەستم لە تێکستی واڵا و کراوە چییە ؟ماڵێکە نەیەك بابەت و نەیەك فۆرمی دیاریکراوی تێدا ناژی هیچ کام لەشیعر و چیرۆك و پەخشان و پەخشانە شیعرو شانۆنامە خاوەنی هەموو ماڵەکە نین، بەڵام لە هەمانکاتدا ماڵی هەموویانە..)) (شێرکۆ بێکەس، ئێوە بە خۆشەویستی ئەسپێرین، ٢٠٠٤، ٥) ئەم تێگەیشتنەی شێرکۆ بۆ دەقی کراوە ئەوەیە، کە دەق، کراوەیە لەبەردەم ژانرە ئەدەبییەکاندا و ئاوێتەبوونی دەقە لەگەڵ ژانرەکانی تری ئەدەبدا. ئەم تێڕوانینە جیاوازە لەو پێناسەیەی، کە ئیکۆ بۆ دەقی کراوەی کردووە، کە بەلایەوە میکانیزمێکی نوێی ڕەخنەییە بۆ لێکدانەوە و خوێندنەوەی ئەو دەقانەی، کە خاوەنی جیهانبینیی کراوەن لە مانا . شێرکۆ هەندێ لە دەقەکانی بە تێکستی واڵا ناودەبات، لە کتێبی کورسی نووسیوێتی (لە یەك تێکستی واڵادا : شیعر، چیرۆك، پەخشان، شانۆنامە) لە چلەی چلچرایەکدا نووسیوێتی دەقێکی ئاوێتەیە (پەخشان، شیعر، وتە). دیارە مەبەستی شێرکۆ ڕوونە کە دەقەکەی تێکەڵەیەکە لە پەخشان و شیعر و وتە . لوقمان ڕەئوف لە کتێبی بنەماکانی مۆدێرنە لە شیعرەکانی شێرکۆ بێکەسدا باس لە

دەقی کراوە دەکات و هەمان تێڕوانینی شێرکۆ دووبارە دەکاتەوە کە دەڵێ ((پێئەچێ، کە ئیتر دەقی کراوە ببێتە شکڵێکی زاڵ و لەبەرچاوی ئەم دونیا ئەفسووناوییە .)) (لوقمان رەئوف، بنەماکانی مۆدێرنە لە شیعرەکانی شێرکۆ بێکەسدا، ٢٠٠٩، ١٩٢). لوقمان رەئوف لە کتێبێکی تریدا هەمان تێڕوانینی پێشتری دووبارە دەکاتەوە کە دەڵێ ((تێکستە والاکان وەك دەرهاویشتە و بنەمایەکی تەکنیکی شیعری پۆست مۆدێرنە هاتۆتە کایەوە)) (لوقمان رەئوف، سیماکانی پۆست مۆدێرنە لە ئایدیای شیعری شێرکۆ بێکەس، ١٦٠) . حەمە سەعید حەسەن دەڵێ ((لە دەقی والادا کە تێکستی سەردەمە رێز لە سنووری نێوان ژانرە ئەدەبییەکان ناگیرێت، نە هیچ شتێك دەکەوێتە سەنتەرەوە، نە هیچ چەمکێك جێگیرە و نە هیچ دەکرێت بە پێوانە . دەقی کراوە هیچ پێشمەرجێکی بۆ دانەنراوە ...)) (حەمە سەعید حەسەن ، فڕین بە باڵی شیعر . ٢٠١٨ . ٦٠) سەرنجمان لەبارەی ئەو وتانەی سەرەوە لەسەر دوو خاڵە یەکەمیان تایبەتە بە دەقی کراوەوە کە رەخنەگر پەیوەستی دەکاتەوە بە سەردەمی نوێوە . لە کاتێکدا ئیکۆ لە بەرهەمی کلاسیکییەوە ئەم چەمکەی داهێناوە، سەرنجی دووەممان ئەوەیە کە دەقی کراوە بە تەنها دەبەستێتەوە بە ژانری شیعرەوە لە کاتێکدا زاراوەکە لە بنەڕەتدا بەرهەمی کراوەیە، چونکە ئیکۆ لە مۆسیقا و رۆمان و شیعرەوە زاراوەکەی داهێناوە و تایبەتی نەکردووە تەنها بە شیعرەوە .

**تیۆری وەرگرتن و دەقی کراوە:**

پەیڕەوکەرانی تیۆری وەرگرتن پێیان وایە، کە وەرگر (خوێنەر) رۆڵێکی سەرەکی هەیە لە دروستکردنی واتادا لە میانەی تێگەیشتن و گەڕان بە دوای دیوی ناوەوەی زمانی دەقدا، لێرەوەیە ئەم تیۆرییە لەگەڵ تیۆرییەکانی دوای بونیادگەری بەیەکدەگەن . بەتایبەتی ئەو تیۆرییانەی کە رەخنەی فەرەنسی پەرەی پێدا کە پەیوەندیدار بوون بە چەمکی دەقی کراوە بە تێگەیشتنی ئەمبرتو ایکۆ .(د. عبدالقادر عبو . فلسفة الجمال . ٢٠٠٧ . ٩٤) رەنجدەر پێی وایە، کە شاعیر نابێت بە شێوەیەك شیعر ملکەچی واقیع بکات کە رۆڵی بیرکردنەوەی خوێنەری تێدا بکوژێت (سەباح رەنجدەر، ئەزموون،٢٠١٤، ١١٥). خودی شاعیر بایەخ بە خوێنەر دەدات کە رۆڵی هەیە لە

بەرهەمهێنـانی واتـادا، و دەقـی کـراوە پێویسـتی بە خـوێنەری راسـتەقینە هەیە، ئەو خـوێنەرە هەسـتیارەی کە دیـوی شـاراوەی دەق دەخـوێنێتەوە و واتـای لـێ بەرهەم دەهێنێ، روو لە ئاستی گوتراوی دەقەکە ناکات وەك ئەوەی بریتی بێت لە حیکایەتی ژیانی نووسەری دەق . (خوێنەر کاری بەسەر حیکایەتەکانی ناو دەقەوە نییە، بەڵکـو کاری بەسەر ئەو پرسیارانەوە هەیە کە دەق دەیانوروو‌ژێنێـت، بەو واتایـانە رازی نییە دەقنـووس بەرهەمـی هێنـاوە، لەسـەر ئەو گـوتراوانە راناوەسـتێت، کە لە یەکەم خوێنـدنەوەدا واتاکانیـان ئاشـکرا دەبێـت، بەڵکـو روو لەو گـوتراوانە دەکـات کە لە ناواخنـدا بـابەتگەلێکی تێـدا حەشـاردراوە، لە ژێـر پەردەوە رازەکـان دەدرکێنـێ و پرسیارەکان دەکات، جۆرێك لە داخراویی واتا هەیە، بەڵکو خـۆی واتـای تـر بەرهەم دەهێنێتەوە، خوێنەری هەستیار لە رێگەی خوێنـدنەوەکەیەوە، ئاسـۆی خوێنـدنەوەی جیاوازتر دەکاتەوە . لە رێگەی ورووژاندنی پرسـیارەکانیەوە گـریمانەی پرسـیاری تـر دروستدەکات . کاتێك دەڵێین دەقی کراوە مەبەست لەو دەقەیە هەڵگری فرە پرسـیار و فرە خوێندنەوەیە قابیلیەتی پێبەخشینی واتای جیاوازی هەیە، لە هەمان کاتدا دەقـی کراوە بە خوێنـدنەوە و راڤەوە پەیوەستە، بەم پێیە ئەوەی دەق بەرەو کـرانەوە دەبـات خوێنەر و جۆرەکانی خوێندنەوەیە، چونکە دەقی کـراوە بەتەنیـا بەرهەمـی دەقنـووس نییە، بەڵکو پرۆسەیەکی دوولایەنەی نێوان دەقنووس و خوێنەرە) (حسەین لەتیـف، دەق لە چاوەڕوانی خوێنەردا، ٢٤٤، ٩٥) . ((خوێنەر کاتێك دەقێك راڤە دەکـات وەك ئەوە وایە لە تەجرەبەی کردەیەکی هاوبەشدا شەریك بێت . لە پرۆسەی راڤەییدا دەق و خوێنەر تا رادەیەك بەیەك رێژە دەور دەگێڕن)) (چارلز برێسلێر، رەخنەی ئەدەبی و قوتابخانەکـانی، ٢٠٠٧، ١١٨)، چـونکە بەلای لایەنگرانـی رەخـنەی هەڵوێسـتی خـوێنەرەوە ((شـیعری راستەقینە تەنیـا بـۆی هەیە لە نەسـتی خـوێنەردا بـوونی هەبـێ، نەك لەسـەر رووپەڕی قـاقەز، کاتێـك خـوێنەر و دەق کـاردەکەنە سـەر یەکـتری، دوابەدوای ئەو واتـا دەخولقێن. ئەمـانە تەنیـا لە نەسـتی خـوێنەردا بوونیـان هەیە، هەنـووکە خوێنـدنەوە و لێکدانەوەی دەقی دەبنە تەجرەبەیەکی جوانیناسانە)) (چارلز برێسلێر، رەخنەی ئەدەبی و قوتابخانەکـانی، ٢٠٠٧، ١١٨) . لە سـەرەتای سـاڵانی شەسـتەکاندا کۆتـایی بە دەسـەڵاتی دەقنووس دێت، بەڵکو سەردەمێکی تر لە کایەی ئەدەبی و رەخنەی ئەدەبیدا دەست

پێدەکات . ئەو سەردەمەش بە سەردەمی دەق / خوێنەر ناودەبرێت . لەم قۆناغە بەدواوە دەقنووس تەنیا مافێکی ڕەمزی بەسەر دەقەوە دەمێنێت . لەبەرانبەردا خوێنەر یاریی خۆی لەدەقدا دەکات . بە بڵاوکردنەوەی کتێبەکەی ئیکۆ (دەقی کراوە) و هەروەها ڕاگەیاندنەکەی بارت (مەرگی نووسەر) درزێکی گەورە کەوتە نێوان خوێنەر و دەقنووسەوە، چونکە وەك چۆن خوێنەر بە واتاکانی دەقنووس ڕازی نییە، ئاوەهاش دەقنووس بەو واتایانە ڕازی نییە، کە خوێنەر بە دەقی دەبەخشێت . ئیکۆ ئاماژە بەوە دەکات کە خوێنەر بەگوێرەی ویستی دەقنووس ڕاڤە ناکات، بەڵکو بە گوێرەی ئەو ستراتیژە ئاڵۆزە دەیکات کە لە ئەنجامی کارلێکی نێوان دەق و خوێنەردا دروست دەبێت .(حسەین لەتیف، دەق لە چاوەڕوانی خوێنەردا، ڕامان، ژمارە (١٤٤)، ٢٠١٧،ل ٩٤). بۆ نموونە دەقی شیعری پایزی گۆران هەمیشە کراوەیە لەبەردەم خوێندنەوەی جیاوازدا کە بۆ خۆی خوێندنەوەی جیاواز و هەندێك جار دژ بەیەکیشی لەسەر کراوە لەلایەن نووسەران و ڕەخنەگرانەوە . (نەجات حەمید . ٢٠٠٨. ٤٤٦)(د. ئەنوەر قادر . ٢٠١٨، ٤٢١ )(سامان عیزەدین . ٢٠١٤ . ٤٣٨) . عەتا قەرەداخی لەڕوانگەی بۆچوونەکانی ئیکۆوە دەڵێ: (هەر دەقێك دەتوانێت کۆمەڵێك ئەزموونی ئینسانی لەخۆیدا کۆبکاتەوە و لەهەر گۆشەنیگایەکەوە لێی بڕوانرێت جۆرێك لە خوێندنەوە هەڵدەگرێ . بەم پێیە دەقی کراوە چەند دەلالەتی هەمە چەشن هەڵدەگرێ . لێرەشەوە بنیاتی زمانی دەق کاری ئیستێتیکای وەرگرتن بەرجەستە دەکات، چونکە بنەمای بنچینەیی خەسڵەتی دەقی کراوە ئەوەیە کە لە ڕوانگەی بنیاتی زمانی دەقەکەوە شۆڕدەبێتەوە بەجیهانبینی دیوە شاراوەکانی دەقەکەوە) . (عەتا قەرەداخی، بەدوای شیعردا لەنێوان وەهمی تازەگەری و واقیعیەتی تەقلیددا، ١٩٩٧، ١٠).

میتۆدەکانی ڕەخنەی دوای بونیادگەری تێڕوانینی نوێیان خستە بەردەست سەبارەت بە چەمکی دەقی ئەدەبی و چۆنێتی لێکدانەوەی لە ڕوانگەی خوێنەرەوە ((دەقی ئەدەبی بە سروشتە خوازەییەکەی، دەقێکی کراوەیە و ڕێگە بە فرە خوێندنەوەیی دەدات . ئەم فرەییەش دەقەکە بە پیت و دەوڵەمەند دەکات لەم مەسەلەیەشدا تیۆری وەرگرتن لەگەڵ هەڵوەشانەوەگەرایی بەیەك دەگات)) (د. ابراهیم محمود خلیل، ڕەخنەی ئەدەبی نوێ، ٢٠١٧، ١٨١). لە ناوەڕاستی سەدەی بیست بەدواوە

میتۆدەکانی رەخنەی ئەدەبی روویان لە خوێنەر کرد، ئەمەش بەو پێیەی ((هەر بە تەنیا دەق قسان ناکات، بەڵکو ئێمەش لە بواری دەقەکانەوە دێینە قسەکردن . ئێمە لە ئاسۆی بیر و سنوورەکانی هزری خۆمانەوە تەئویلی دەقەکان دەکەین و بە رووناکیی تێڕوانینەکانی خۆمان رووناکیان دەکەینەوە)) (رێبوار سیوەیلی، کتێبی نالی، ٢٠٠١، ١٥). بەم پێیە تا دەهات رێچکەی ئەو رێبازانەی بایەخیان بە رۆڵی خوێنەر دەدا لە شیکردنەوەی دەقدا پەرەی دەسەند، ((رەخنەی شیکردنەوەی دەقی داوای سوود وەرگرتن لە زانستە مرۆییەکان و هەستی خوێنەر دەکات، ئەم شەپۆلە نوێیە لە دیاریکردنی واتای دەقدا بەرگری لە هەڵوێست و رۆڵی خوێنەر دەکات، کە پێیان وابوو شیعر لەخۆیدا مەبەست نییە، بەڵکو مەبەستەکە ئەوەیە هەر وەرگرێك لە ئەزموونی تایبەتی خۆی بۆ زیاد دەکات)) (د. ابراهیم محمود خلیل، رەخنەی ئەدەبی نوێ، ٢٠١٧، ١٨١). ((بۆ ئەوەی ئەم رۆڵە بە دەق ببەخشین، دەبێت بە شێوەیەکی کراوە بیخوێنینەوە و لێکدانەوەی بۆ بکەین و سوود لە هەموو، یان بەشێکی زۆری ئەو ئیمکانیەتە رەخنەیی و مەعریفیانە وەربگرین کە لە ئامانجەکانی دەق نزیکمان دەخەنەوە)) .(رێبوار سیوەیلی، کتێبی نالی، ٢٠٠١، ١٤) . ((ئیکۆ باسی لە خوێنەری ئینسکلۆبیدی دەکات، واتە هەتا خوێنەر مەعریفەی دەربارەی زمان و دەق و کێشەکانی سەردەم زیاتر بێت خوێندنەوەی جیاوازی بۆ دەق دەبێت .)) (حسەین لەتیف، دەق لە چاوەڕوانی خوێنەردا، ٢٠١٧) کەواتە ئاساییە کە خوێنەر بەو پاشخانە رۆشنبیریەیی هەیەتی رۆڵی لە راڤە و لێکدانەوەی واتای جیاواز بۆ دەق هەبێت . چونکە ((دەق لە واتای خۆیدا کەلەبەرێکی گەورە دەهێڵێتەوە بۆ گوتنی تر و بیرکردنەوەی تر و هاوبەشیکردنی تر کە خوێنەر رادەکێشێتە بازنەی بوونی خۆیەوە. ئەو بوونە مەرجدارەی هەموو کاتێك هەر دەربڕین لێکردن و بەرچاو خستنی کیانێکی عەقڵییە لە بووندا، کە هەرگیز ئەو بەرچاوخستن و دەربڕین لێکردنە ناگاتە پێگەیین و کامڵبوون .)) (نەجات حەمید،٢١٧) . لێرەوەیە خوێنەری راستەقینەی دەق، لەدوای بڵاوبوونەوەی دەقەکە ئامادەیی دەبێت و ئەو کەلەبەرانە پڕدەکاتەوە و نەوتراوەکانیش تەواو دەکات . بەم پێیە دوو جۆر خوێنەری دەق بوونی هەیە،

ئەوانیش خوێنەری نادیار و خوێنەری راستەقینەیە . نادیار لەکاتی نووسینی دەقدا ئامادە دەبێت، راستەقینەش لەدوای بڵاوبوونەوەی دەقەکە .

**هێرمینۆتیکا و دەقی کراوە:**

وشەی هێرمینۆتیکا (Hermeneutics) هونەری تێگەیشتن و لێکدانەوە دەگەیەنێت و ئامانجی ئەم تیۆرییەش بریتییە لە ئیشکردن لە واتای تێکستدا بە مەبەستی هێنانە سەر زمانی خۆمان، رۆشنکردنەوەی واتاکانی و شیکردنەوەی بە شێوەیەك کە ئیمکانی تێگەیشتنمان هەبێت .(رێبوار سیوەیلی، کتێبی نالی، ٢٠٠١، ١٠) . فرەواتایی دەق دەبێتە جێی بایەخی رەخنەگران ((لەراستیدا چەسپاندنی فرە واتایی لە دەقەکاندا تەنیا دوو گریمانە دەخاتە بیرکردنەوەمان، کە یا دەبێ مرۆڤ لە دەربڕین لێکردن لە هەموو واتایەکدا نەتوانێ بەتەواوەتی پەی بە هیچ بوونێکی راست بەرێ، یا ئەوەتا مرۆڤ ناگاتە ئاستی هیچ راڤەیەك بۆ بۆچوونی خۆی)) (نەجات حەمید . ٢٠٠٨، ٢٢٧).

دەق توانای لەڕادەبەدەری هەیە لە راکێشانی خوێنەر بەلای خۆیدا کە خوێندنەوە و لێکدانەوەی جیاواز و جۆراوجۆری بۆ بکات . لەبەرئەوەی هێز و توانای کرانەوە دەردەکەوێت لەمیانەی دەسەڵاتی دەق کە چاوگی هەڵێنجاندنی جۆراوجۆری خوێندنەوە و جیاوازی لێکدانەوە لەخۆدەگرێ . بەو پێیەی دەقی کراوە ئەوەیە کە لەبەردەم لێکدانەوەدا بە رێگای جۆربەجۆر بکرێتەوە، بە بێ ئەوەی تایبەتمەندیی خۆی لەدەست بدات.((لەماوەی سی ساڵی رابردوودا تەئویل و تیۆری تا دێت پتر لێك نزیك دەبنەوە . ئەوەی راستی بێت، بەڕای زۆرێك لە رەخنەکاران و تیۆری داڕێژانی هاوچەرخ، بەهیچ کلۆجێك ناکرێت تیۆری و تەئویل لێك هەڵاوێردرێن . ئەوان دەبێژن کاتێك دەقێك تەئویل دەکەین، هەموو کات کەڵك لە تێڕوانینێکی تیۆرێکیش وەردەگرین، جا چ خۆمان ئاگامان لەم بابەتە هەبێت، چ نەبێت هەروەتر دەڵێن تیۆری بەبێ تەئویل ناتوانێت بەردێك لە بەردێك بدات .)) (هانز بێر تێنز، بنەماکانی تیۆریی ئەدەبی، ٢٠١٤ . ٥) دەقی کراوە لە بنەڕەتەوە پەیوەستە بە هێرمۆنتیکاوە چونکە ((واتای ئەم زاراوەیە پەیوەندی بە راڤەکردن و تەئویلی تێکستی ئەدەبی و هونەرییەوە هەیە، بەو پێیەی تێکست کراوەیە لەوەی چەند مانا و چەند تەئویل هەڵدەگرێت)) (نەوزاد ئەسوەد، ٣٤٥،٢٠١١))

هەموو دەقێکی ئەدەبی و هونەری لەسەر بناغەی کێشەیەکی دیاریکراودا دروست دەبێ، هەموو دەقێك فرەمانایی بوونی بە واتا، سەربەخۆییبوون و سەنتەرێتی مان پرش و بڵاوەکان نایەنە ماناوە بەڵکو ئەو فرەمانایییە لەبیری نووسەردا،خاوەنی ناسنامەی بنەڕەتی خۆیانن، خاوەن هێزی بناغەی خۆیانن کە بۆی هەیە بەردەوام واتای نوێ بخوڵقێنێ و لەسنووری واتایەکدا نەمێنێتەوە . (نەجات حەمید، تیۆری بنیاتی شاراوە. ٩٨).((دەقی فرەواتایی لە هەموو نووسینێکدا بوونی هەیە تەنانەت لە ساکارترین دەقەکانیشدا)) (نەجات حەمید. ٢٠٠٨، ١٠١) بەم ڕەهایەی بڕیارێکی وەها زانستییانە نییە، چونکە هەر خودی ئیکۆ دەڵێ هەندێ دەق هەن، کە فرە خوێندنەوە هەڵناگرن و بە دەقی داخراو پێناسەیان دەکات . کەواتە دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە لەتیۆری دەقی کراوەدا هەموو لێکدانەوەکان بۆ دەق هێز و کاریگەرییان لە بیرە بناغەییەکەی دەقەوە وەردەگرن . چونکە ((فرەمانایی لە دەقدا بزرکردن و پەراوێزکردنی بیری بناغەیی نییە، هەریەك لەو مانایانەی کە لە بیری سەرەتاییەوە لەدایك بوونە، بۆیان هەیە ببنە بابەتی ڕەخنەیی سەربەخۆ، بەڵام بێ گەڕانەوە بۆ بیری بناغەیی، کە نووسەر لێیەوە واتای نوێ و پەیوەستدار دەخوڵقێنێ، هەرگیز واتای بنەڕەتی ئاشکرا نابێ)) (نەجات حەمید. ٢٠٠٨، ٩٩) ((خوێندنەوە جیاوازەکان دەق دەکەن بە دەقی کراوە، کاتێك ڕەخنەگرەکان بە تیۆری جیاواز لەیەکتر دەقێك دەخوێننەوە .)) (حسەین لەتیف، ڕامان، ٢٤٤ و ٩٧).

تیۆری ڕەخنەیی لە پرۆسەی گەڕان بە دوای واتای دەقدا سێ جۆر لە واتا دیاری دەکات :

١- واتای دانەر، کە مەبەست لێی ئەو واتایەیە کە لە زەینی نووسەری دەقدایە.

٢- واتای دەقی، بریتییە لەو واتا و مەبەستەی کە لەناو دەقدایە.

٣- واتای خوێنەر، مەبەست لێی ئەو واتایەی کە لە زەینی خوێنەردایە.

بەم پێیە چەمکی دەقی کراوە لەیەکتر بڕینی هەرسێ ئەو مەبەستانەی دەقەوە بە پرۆسەی ڕوونکردنەوەی واتای دەق دەگات . مەرجیش نییە کە دەقێك بە دەقی کراوە لەقەڵەمدرا ئیتر بەسەر خوێندنەوەی نوێدا دابخرێ، بەڵکو کراوەیە لەبەردەم خوێندنەوەی تردا . کەواتە تیۆری دەقی کراوە هێرمینۆتێکییە نەك ئیستێتیکی .

لەدوای ئیکۆوە، رەخنەگران تیۆری دەقی کراوە، بەو رێبازە رەخنەییانەی دەبەستنەوە، کە روو لە هەڵوێستی خوێنەر دەکەن، ئەمەش لەو باوەڕەیانەوە بوو، کە خوێنەر تەوەری سەرەکییە لە لێکدانەوەی واتاکانی دەقدا . ((رەخنەگرانی رۆژئاوا دەقی کراوە پەیوەست دەکەنەوە بە مەسەلەی لێکدانەوەی بەرهەمی ئەدەبییەوە بەو پێیەی فرەخوێندنەوەیی کارە ئەدەبییەکان بۆ خۆی کارێکی ئاسایی چاوەڕوانکراوە لە پرۆسەی خوێندنەوەدا وەك چەمکێکی ئیستێتیکای وەرگرتن)) (ان موریل، النقد الادبي، ٢٠٠٨، ١٣٢) چەندە دەقەکان هی داهێنەرەکانیانن ئەوەندەش هی خوێنەرەکانیانن بۆیە هەر خوێندنەوەیەکی کراوە بۆ دەق، بەرهەمهێنانی دەقێکی کراوەیشە و پرۆسەیەکی دیموکراتییانەی مەعریفی و ئێستاتیکی رەخنەییە لە بواری ئەدەب و رۆشنبیریدا . (رێبوار سیوەیلی، کتێبی نالی، ٢٠٠١، ١٥) . شانۆگەری (ئەنتیگۆنا)ی جان ئانۆی لە جەنگی جیهانی دووەمدا لەکاتی داگیرکردنی فەرەنسا لەلایەن نازییەکانەوە پێشکەشکراوە، چەندەها لێکدانەوەی جودای لەلایەن رەخنەگرانی ئەو سەردەمەوە بۆ کراوە هەندێکیان بە شانۆگەرییەکی بەرهەڵستکارییان لەقەڵەمداوە، کە دژ بە نازییەکانە. هەندێکی تریان بە شانۆگەرییەکی دەستخۆش لێکەری و پشتگیریکەری نازییەکانیان لە قەڵەمدەدا، هەندێکی تریشیان بە شانۆگەرییەکی وجوودی بێهودەییان لە قەڵەمدەدا.(نەجات حەمید، ٢٠٠٨، ٢٦) کەواتە دەقە ئەدەبییەکان کاتێك دەبن بە دەقی کراوە کە لەلایەن خوێنەرانیەوە خوێندنەوەی (تەئویل) جیاوازیان بۆ بکرێ . ئیکۆ دەڵێ ((دەسەڵاتی دەق لەو لێڵییەوە دروست دەبێ کە وشە و ئاماژەکانی خۆیان فرە جۆر و فرە رەهەند دەکەن)) دەقی کراوە پەیوەست بە فرە واتاییەوە سەربەخۆیی و ئازادی و کرانەوەیەکی فراوانی لەبەردەم خوێنەردا کردۆتەوە . کە هەموو گوتنەکانی هێز و کاریگەرییان لەبیرە بناغەییەکەی دەقەوە وەردەگرن . فەنتازیای ئیستێتیکی لەدەقی کراوەدا بریتییە لە بنیاتێکی فرە ئاراستەیی لە بنیاتی واتای دەقدا. ((رەخنەگران سێ جیهانبینی بۆ بنیاتی دەق دیاریدەکەن، کە بریتین لە (جیهانبینی یەك مەدلول، جیهانبینی فرە مەدلول، جیهانبینی کراوە لە مەدلولەکان).)) (نەجات حەمید، ٢٠٠٨، ١١١). پرسیارەکە لێرەدا ئەوەیە، کە دەقی کراوە لەکوێی ئەم سێ جیهانبینییەی دەقەوەیە ؟ لە وەڵامی ئەم پرسیارەدا روو لە بۆچوونێکی ئیکۆ دەکەین، کە دەڵێ: هەر بەرهەمێك (دەقێك) لەخۆیدا چەندین خوێندنەوەی شیاو هەڵدەگرێ. کەواتە بەلایەوە دەقی

کراوە چەندین خوێندنەوەی جیاواز دێنێتە کایەوە. بۆیە خاوەن جیهانبینییەکی کراوەیە لە مەدلوولەکان،. کەواتە هەردەقێك خاوەنی جیهانبینی کراوە بێ لە مەدلوولەکان ئەوە ئەو دەقە لێکدانەوە و خوێندنەوەی زۆری بۆ دەکرێ و بە دەقی کراوە پێناسە دەکرێ . لێکدانەوەی کراوە خەسڵەتێکی زیندوو دەبەخشێتە ئەو دەقانەی، کە خاوەن جیهانبینییەکی کراوەن لە مەدلوولەکان .

فرە واتایی دەق، یەکێکە لە سیماکانی دەقی کراوە، ئەم تێڕوانینە لەگەڵ تێڕوانینی لێکدانەوە بۆ دەق لە ڕوانگەی تیۆری دەقی کراوە بە واتا ئیکۆیەکەی دەگونجێت .((دەقی کراوە ئەو دەقەیە کە دەچێتە ناو قووڵایی و شوێنی شاراوەوە، دەقێکی فرە خوێندنەوەیە، شۆڕ دەبێتەوە بۆ بەشەکانی ناوەوە، لە ئاستی بنیاتی شاراوەییدا شوێنێك دەگرێ دادەبەزێتە دیوی ناوەوەی بنیاتی زمان))(سیڤا، النص المفتوح، ٢٠١٩، ١٥). ((هەموو دەقێك لە جیهاندا سیفەتی دووسەریی واتا لە خۆیدا هەڵدەگرێت و ئەم سیفەتەش لە سیفەتی ناوکی زمانەوەیە .))(نەجات حەمید . ٢٠٠٨، ١٠٩) بە شێوەیەکی تر دەق دوو بنیاتی هەیە یەکێکیان ئاشکرا و ئەوی تریان شاراوە . بنیاتە شاراوەکە کراوەیە لە بەردەم خوێنەردا کە مانای کراوەی لێ بەدەست بهێنێت، چونکە هەر خوێنەرێك ئازادە، کە لە دید و بۆچوونی خۆیەوە لێکدانەوە بۆ بنیاتی شاراوەی دەق بکات . لەم حاڵەتەدا دالەکان کراوەن لە بەردەم چەندین مەدلوولدا .

لە ئەدەبی کوردیدا چەندین بەرهەمی ئەدەبیمان هەیە لە چەند گۆشەنیگایەکەوە لێکدانەوە و ڕاڤەی بۆ کراوە هەندێ جار واتای جیاواز لە یەکتریان داوە بەدەستەوە، کەواتە ئەم جۆرە دەقانە کە خوێندنەوەی جیاوازیان بۆ کراوە دەشێ ناوی دەقی کراوەیان لێ بنێین. نالی لەلایەن چەندین خوێنەرەوە لێکدانەوە بۆ دەقەکانی کراوە. لە دیارترین ئەو خوێنەرانە (مەلا عەبدولکەریمی مودەریس و کوڕەکانی، مەسعود محەمەد، د. مارف خەزنەدار، د. دڵشاد عەلی، ڕێبوار سیوەیلی، عەتا قەرەداغی .....) چونکە ((شیعرەکانی نالی جیهانبینییەکی شاراوەیان تێدایە و تۆڕێك لە سیستەمی زانستی دەلالەتیان تێدایە و تا ئێستەکە هەر بە زیندوویتی بەکاریگەری ماونەتەوە)). (نەجات حەمید، ٢٠٩) لێرەوەیە ڕوو لە جیهانبینی دەقی زێوان دەکەین و لە ڕوانگەی بنەما و خەسڵەتەکانی تیۆری دەقی کراوە لێکدانەوە و ڕاڤەی واتا و دەلالەتەکانی دیوی ناوەوەی دەربڕینەکانی بنیاتی زمانی دەقەکە دەکەین.

## بەشی دووەم:

## دەقی زێوان لە روانگەی تیۆری دەقی کراوەوە

رەخنەگران و توێژەران، لە چەندین گۆشە نیگاوە، روویان لە جیهانبینی دەقی شیعری زێوان کردووە و مانای جیاواز و کراوەیان لەبارەیەوە خستۆتە بەردەست لەوانە(ئەحمەدی مەلا، عەبدوڵڵا رەحمان، سۆران مامەند عەبدوڵڵا) خەسڵەتی فرە خوێندنەوەیان پێ بەخشیوە. لەم توێژینەوەیەدا دەمانەوێت بە شێوەیەکی دیکە زێوان بهێنینە زمان و لە جیهانبینیەکی ترەوە لێکدانەوەی نوێی بۆ بکەین، بەڵام بێ دوورکەوتنەوە لە مانای بناغەیی دەقەکە . بۆ هاتنە دیی ئەم ئامانجە، پێویست دەکات سوود لە هەموو یاخود بەشێك لە تیۆرەکانی تری رەخنەی ئەدەبی وەرگرین، کە لە خزمەتی لێکدانەوەی بنیاتی شاراوەی دەقەکەدان . راڤەگەری فەرەنسی (هیرش) جیاوازی دەکات لەنێوان واتا و مەغزادا، چونکە واتا لە دەقدا جێگیرە، بەڵام مەغزا، یان دەلالە دەگۆڕێت . ئامانجی رەخنەی ئەدەبی ئەوەیە بگاتە مەغزای دەقەکان، بە پێچەوانەی شیکردنەوەوە کە ئامانجی گەیشتنە بە واتا، گەیشتن بە واتا بە شیکردنەوەی زمانەوانییانەی دەق بەدی دێت، بەڵام گەیشتن بە مەغزا، تەنها بەدروستبوونی پەیوەندی لەنێوان دەق وەرگردا بەدی دێت . ((د. ابراهیم محمود خلیل، رەخنەی ئەدەبی نوێ، ٢٠٤،٢٠١٧) .

شاعیر یەکەم شیعری خۆی لە ساڵی ١٩٨١ لە رۆژنامەی هاوکاری بڵاوکردۆتەوە، کە تەمەنی شانزە ساڵان بووە . دەقی زێوانی لە ١٩٨٨ بڵاوکردۆتەوە، کە تەمەنی بیست و دوو ساڵ بووە . تی . ئێس . ئەلیەت دەڵێ ((جوانترین شیعر ئەو شیعرانەن، پێش ئەوەی تەمەنمان ببێت بە بیست و پێنج ساڵی دەیاننووسین)). ئەوەی جێی سەرنجە کە بەم بنیاتە دەوڵەمەندە و بەو زمانە شیعرییە شاعیر لەو تەمەنەدا، لە یەکەم تاقیکردنەوەی شیعری درێژدا، دەقێکی نوێبەخشی بەرهەمهێناوە، کە هەست و هەناسەیەکی قووڵی شیعری لە جیهانبینیی خۆیدا شاردۆتەوە. ((سەباح رەنجدەر یەکێکە لەو شاعیرانەی کە شیعرەکانی بە زمانێکی سفت و سۆل و رووحییەتێکی تازە داڕێژراون، شێوازی تایبەتی خۆی هەیە و دەخرێتە خانەی شاعیرە نوێگەریخوازەکان.)) (کەمال غەمبار، چنینەوەی چەند وتارێکی رەخنەیی، ٢٠١٢، ٢٣) .

کۆمەڵێـك تـوێژەر و رەخنەگـر لە بـارەی شـاعیرەوە توێژینەوەیـان کـردووە و کۆمەڵێـك ئەنجـامی باشـیان خسـتۆتە روو، لە دیارترینیـان پرۆفیسـۆر دکتـۆر مـارف خەزنەدارە، ئەمەش بۆخـۆی پەسـەندکردنی شـاعیرە وەك یەکێـك لە شـاعیرە هاوچەرخەکان (ئازاد عەبدولواحید، د. مارف خەزنەدار لە گۆڤاری رامان دا، ٢٠١٨، ٣٢٩،٢٤٢). شاعیر لە تاقیکردنەوەی شیعری هاوچەرخدا پێگەیەکی دیاری هەیە، چونکە شێوازی شیعری خۆی لە شاعیرانی تر جیاکردۆتەوە و زمانی شیعری تایبەت بە خۆی هەیە کە شاعیری پێ دەناسرێتەوە . لەم بارەیەوە کەمال غەمبار دەڵـێ: ((مـۆرکی کـارتێکردنی شاعیرانی تری بەسەرەوە دیار نییە لە شـاعیریەتی و رەسـەنی بـخەن، ئەم بۆچوونەشـم ئەوە نـاگەیەنێ کە شـاعیر ئـاوڕی لە سـامان و کەلەپـووری خۆمـاڵی و نەتەوایەتـی نەداوەتەوە و سوودی لێ نەبینیون. (کەمال غەمبار، بەرەو جیهانی شیعریی چەنـد شـاعیرێك، ٢٠٠٨ .٣٢). هەروەهـا سرور حەسـەن محەمەد تـوێژینەوەیەکی زانسـتی بە میتـۆدی بەراوردکاری لەبارەی ئەدۆنیس و سـەباح رەنجـدەرەوە کـردووە .(سرور حسـن محمـد . ٢٠١٣) سەباح رەنجدەر لە دەقی زێواندا دەیەوێ لە ژێر پەردەوە راز و نیازی خـۆی بە خوێنەر رابگەیەنێت، چونکە (شیعری رەنجدەر لەو شیعرانەیە کە ئاسان خۆیان نادەن بەدەسـتەوە و لە پشـت هەر وشـەیەکەوە مانـایەکی پەناهـان حەشـارداوە و هەر بـۆیە بەدەگمەن لە یەکەم بەرکەوتندا لەگەڵ زۆرێـك لە شـیعرەکانی ئەم شـاعیرەدا خـوێنەر بۆی هەزم دەکرێت) (ئارام سدیق، زمان و شیعریەت، ١٣٦،٢٠١٧).

سـەرەتا لە ناونیشـانی دەقەکەوە دەچـین بەرەو جیهـانبینی دەقەکە . چـونکە ناونیشان هەمیشە کلیلی چوونە ژوورەوەیە بە نێو دیوە شاراوەکانی دەقەکەوە . زێوان ناوە بۆ ئەو کەسەی کە پارێزەر و راژەکاری شوێنی پیرۆز و ئاینییە . شاعیر هاتووە ئەم ناوەی خواستووە بۆ خۆی کە وەك ناونیشان یارمەتیـدەرە بـۆ گەیشـتن بە ئاماژەکـانی ئەو وێنانەی کە مانای خەسڵەتی راژەکار و پـارێزەری شـوێنێك دەگەیەنێـت لەلایەن کەسێکی خەمخۆرەوە بە مەبەسـتی خزمەتکردنـی و دابینکردنـی پێداویسـتییەکانی و دروستکردنی ژینگەیەکی ئـارام و بـێگەرد وەك ئەوەی کە مـژدە دەداتە نـواڵە کە لەو ناخۆشییانەی هاتۆتە رێگەیان رزگاری دەکات و جۆرێـك لە بەهەشـتی بـۆ دروسـت دەکات . شاعیر ئەو کەسەیە ماڵێك بۆ نواڵە دروسـت دەکـات لە شـێوەی ئەو شـوێنە

پیرۆزەی کە زێدەوان پارێزگاری لە شوێنی پیرۆز دەکات ئەو بڕواو متمانەی بە خۆی هەیە کە نەمری لە بەهەشتدا لەگەڵ نواڵە بەدەست دەهێنێت .

**ئێشی کوشندەی تێپەڕبوونی ساڵەکان**
**دەچنە چاڵی بیرچوونەوە**
**لە شاری جۆشخواردووی سەرزەمین**
**خانوویەکی ساکارت لە درەختی بەردار بۆ دروست دەکەم**
**تێیدا پیر بە**
**باخەکەشی بەخاوەن کە**
**ئەی خاوەن باخ**
**هەرچوار وەرز سەوزە و میوەیان لەسەر دەستە**

(سەباح رەنجدەر، ۲۰۱۸، ۲۵)

شاعیر خۆی دەکاتە زێوانی ئەو ماڵەی کە لە درەختی بەردار بۆی دروست دەکات و بەڵێنی پێدەدات کە ساڵانی رابردوو لە بیر بکەن و لەدوای بەیەکگەیشتنیان لە بەرهەمی داری خۆزگە و ئامانجەکانیان بە ئاسوودەیی لەو ماڵەی پێکەوەی دەنێن بخۆن و تا دوا تەمەنی پیریان پێکەوە بن .

شاعیر کە باس لە قۆناغی منداڵیی خۆی دەکات زیاتر یادەوەرییە خۆشەکانی خۆی دەگێڕێتەوە بەڵام هەندێ وێستگەی منداڵی نوغرۆی مەرگەساتە و ناخۆشییە هەروەها سەرتاپای تەمەنی قۆناغی گەنجێتی ماوەیەکی کەمی لێ دەرچێت ترووسکەی شادی تیا نەبووە .

**خۆم هاوێشتە بۆشایی بوون**
**بەخشندەیەك دەستی میهری بۆ درێژ نەکردم**

(سەباح رەنجدەر، ۲۰۱۸، ۷۰ )

ئەمە لووتکەی ئازار و خەمەکانی شاعیر دەردەخات کە لەو قۆناغەی ژیانیدا ئەوەندە تاڵی چەشتووە تەنانەت کەسێك شك نابات دەستی هاوکاری بۆ درێژبکات و بە رادەیەك هەستی بەتەنیایی کردووە کە وەك نامۆیەك دەربکەوێت . بۆیە ناونیشانی دەقەکە راستەوخۆ پەیوەندی بە ژیانی شاعیرەوە هەیە لە هەرشوێنێك ناوی زێوان

بەکارهاتبێت ئەوە مەبەستی شاعیر خۆیەتی و خۆی بە زێوان ناودەبات کە دەلالەتە بۆ پێگەی پاکی و بەوەفایی ئەو بەرپرسیاریەتییەی شاعیر وەك پاسەوان دەکەوێتە ئەستۆی ئەو مالەی کە پەیمانی داوە بۆ نوالەی دروست بکات، کەواتە دەقەکە بریتییە لە پانۆرامای ژیانی شاعیر بە خۆشی و ناخۆشییەکانیەوە هەر لە منداڵییەوە بۆ گەنجێتی . ژیانی شاعیر لە هەردوو قۆناغی منداڵی و گەنجیدا لە نێوان گەشبینی و رەشبینیدا سەرەتاتکێی کردووە، بەلام زیاتر ناخۆشی و رەشبینی بەسەر شاعیردا زاڵە وەك لەم هێڵکارییەدا روونکراوەتەوە :




بەم پێیە زێوان لە تێکچوونی هاوسەنگیی نێوان خۆشیی منداڵی و ناخۆشیی گەنجێتی و زاڵبوونی هەردوو چەمکی دڵەڕاوکێ و رەشبینی لای شاعیر هاتۆتە بەرهەم . کۆی گشتی تاقیکردنەوەکە بەرهەمی ئامـاژە و مانـای خۆشـی و ناخۆشییەکانن. سەرئەنجام هەردوو چەمکی دڵەڕاوکێ و رەشبینی لە ئاستی بنیاتی دەقەکەدا زاڵە . شاعیر لە دەقی زێواندا ئاشنامان دەکات بە کارەکتەرەکانی نێو دەقە شیعرییەکەی کە بریتین لە شاعیر(زێوان) و نوالە (خۆشەویستی شاعیر) و دایك و باوك و شاعیرەکان (نالی، مەولەوی، حاجی) و کارەکتەری ئاینی و ئەفسانەیی(ئادەم و خدری زیندە و فەرهاد و برایمۆك و مەسیح و مریەم و موسا و پێغەمبەر)، هەروەها بەو شوێنانەی کە رووداوەکانی نێو دەقەکە لەخۆیانی گرتووە کە بریتییە لە گوندی دەربەندی گۆم و هەولێر . لە رووی کاتیشەوە قۆناغی منداڵی و گەنجێتی شاعیر دەگرێتەوە .

لە رووی بابەتەوە شاعیر زیاد لە بابەتێك دەخاتە روو کە بەلای ئێمەوە بریتین لە خۆشەویستی، مردن، ژیان، سروشت، یادەوەری، رامان لە نهێنییەکانی گەردوون و بوون، مێژوو، دڵەڕاوکێ، نائومێدی، رۆشنبیری و کلتوور . شاعیر لەم تاقیکردنەوە شیعرییەدا دەیەوێ لە ئاستێکی قووڵی مەعریفییەوە شیعرییەت بە زمانێکی نوێ بەرهەمبهێنێت . ئەو رووکەشانە لە دیاردەکان ناڕوانێت، بەڵکو دەچێتە قووڵایی و رۆدەچێتە جیهانی شاراوەیی رووداو و پرسیارەکانی حەقیقەتی بوون و گەردوون . خەسڵەتی لێڵی و ناڕوونی لە مانا و دەربڕینەکانی بنیاتی زمانی دەقی زێوان خوێنەر پەلکێش دەکات کە ئازادانە لێکدانەوەی هەمەجۆر بۆ جیهانبینیی دەقەکە بکات، ئەمەش بەپێی ئەو دەسەڵاتەی دەق لە رووی مەعریفییەوە هەیەتی لەلایەك و لەلایەکی ترەوە بەپێی ئاستی مەعریفی و رۆشنبیری و تێڕوانینی خوێنەر خۆیەوە . (شکلۆڤسکی لەو باوەڕەدا بوو کە هونەر و هێزی هونەری خۆی لە نائاشناسازیدا ئەبینێتەوە بۆ ئەوەی شتەکان بە شێوەیەکی نوێ پیشان بدەین). (عەبدوڵڵا تاهیر بەرزنجی . ٢٥) لەبەرئەوە فۆرمالیزم تیۆرییەکە دەربارەی شیعر وەك لادانێکی زمانی، بە هۆی چەمکی بەنامۆکردنی شیعرییەوە ئەدەب خۆی لەزمانی ئاسایی و رۆژانە دوور دەخاتەوە . (پیتەر هاڵبێرگ و دانەرانی تر. وەرگێڕانی : ئەنوەر قادر محەمەد . ٣٢٠)

**سروشت هەموو شتێکت ترساندوومی**
**لرفەی ئاگرت**
**بڵندایی چیات**
**گەفی رووبارت**
**دەشتایی رووتت** (سەباح رەنجدەر، ٢٠١٨، ٥)

**سروشت** دەستپێکە بۆ چوونە ناو جیهانی هزر و مەوداکانی لێکدانەوەی هەموو دیاردەیەك کە هەستپێکراو بێ یاخود هەست پێ نەکراو بێ. ترس لە سروشت لە کۆنەستی هەموو مرۆڤایەتیدا بوونی هەیە . هەمیشە هەڕەشە بووە لەسەر ژیانی و لە هەمان کاتیشدا مرۆڤ وانەی زۆری لێوە فێربووە شاعیر لە سەرەتاوە هەستی ترس لە دیاردەکانی سروشت رادەگەیەنێ . ئەم تێڕامانە لە گەردوون پرسیارە لەو هێزەی لە پشتی دروستکردنی ئەم بوونەوەیە کە چۆن ئاگر و ئاو و خاك خولقاون . ئاگر کاتێك

سەرچاوەی ترسە کە قەبارەی ئاگرەکە بە ئەندازە و ئاستێکی بەرفراوان بێت وێنەی شکۆمەندی ئاگرمان لا دروست دەبێت وەك وێنەی ئاگری دۆزەخ ترسناکە . بەڵام ئاگر لە شێوەی ئاگری نەورۆزدا بێت سەرچاوەی ترس نییە و دەبێتە خولقاندنی جوانی . ئاو کە دەبێتە سەرچاوەی مەترسی لە وێنەی دەریایەکی بێ سنوور جوانییەکی لەرادەبەدەرە کە بە شکۆمەندی ناودەبرێت . لرفەی ئاگر و بەرزی چیا و هاژەی رووبار و بەرینی بیابانەکان کە سەرچاوەی ترسن جوانییەکی لەرادەبەدەریان هەیە مرۆڤ لەئاستیاندا سەرسامە و بەم جۆرە جوانییانە دەوترێت شکۆمەندی . رووناکی کە رەمزی ئارامی و دڵنیابوونە یارمەتیدەرێکی باشە بۆ چێژوەرگرتن لە دیمەنەکانی سروشت بە پێچەوانەوە تاریکیش رێگرە لە بەردەم چارەنووس و ئایندەمان کە ناتوانین پەی بە جوانییەکانی ژیان بەرین

**پەنجەم لە چاوەڕوانییەکی دوانەهاتوو یان گیان پێنەماو**
**بەناویەکدا دەشکێنمەوە**
**یادی ماڵیکردنی ورچ دەبێتە بۆنە و نیشان**
**دیوە تاریکەکانی زەوی چی لێ دەدۆزێتەوە** (سەباح رەنجدەر، ٢٠١٨، ٦)

شاعیر لە دەقی زێواندا نایەوێ وێنە مەئلووفەکانی پێشووتر کە لە نەستی خوێنەردا کەڵەکەبوونە دووبارەیان بکاتەوە . ئەم دەقە تاقیکردنەوەیەکی راستگۆیانەی شاعیرە کە لە دەروونێکی پاك و بێگەردی شاعیرانەی پڕ لە بەهای جوانی و خۆشەویستییەوە هەڵقوڵاوە. بۆیە بابەتە خودییەکان کە پەیوەندی بە شاعیرەوە هەیە، رەنگدانەوەی ئەو قۆناغەیە کە شاعیر لە منداڵیدا بەسەری بردووە .

**قیژەی یەکەمین کتێب لەناو چاڵەبەفرەکان گوێی زرینگاندمەوە**
**بەیەکگەیشتنەوەی من و جزدانی ئارامبەخشی دایکم**
**کۆڵانەکانی دەیگەیاندمە قوتابخانە و گۆڕەپانی رووخۆشی تۆپی پێ**
**پاشان دووکانە پڕ نهێنییە رەنگاوڕەنگەکانی گوندی گەنجینەی منداڵیم**

(سەباح رەنجدەر، ٢٠١٨، ٦)

قیژەی یەکەمین کتێب لەناو چاڵە بەفرەکانی حەوش . یەکەمین کتێب کە منداڵ پێی ئاشنا دەبێت کتێبی ئەلف و بێی کوردی ئیبراهیم ئەمین باڵدارە، چونکە دوو دێڕ

دواتر دەڵێ : **کۆڵانەکانی دەیگەیاندمە قوتابخانە** . کەواتە لە خەیاڵی رۆژانی منداڵی شاعیردا قوتابخانە وێستگەیەکی گرنگی ژیانی شاعیر بووە . لەو کتێبانەی کە لە زەینی زۆربەی تاکی کورددا دەزرینگێتەوە و کاریگەری بەردەوامی لەسەر یادەوەری دەمێنێتەوە ئەو کتێبە بەنرخەی ئەلف و بێی کوردییە لە شوێنێکی تردا ئاماژە بە بابەتێکی سەرنج راکێشی ناو کتێبەکە دەکات ئەویش مێوژی زۆرابە و لە شوێنێکی تردا ئاماژە بە لانك و بلوێر و گۆپاڵ و پەرژین دەکات ئەمانە لە کتێبی ئەلف و بێی کوردی باسکراون . لە زۆر شوێنی زێواندا وێنە و دەربڕینەکانی ناو یەکەمین کتێبی کوردی ئامادەییان هەیە (بزنە کێوی و گورگ و ئەسپ و سێو) وێنە ئاشناکانی نێو واقیع کە بەلامانەوە سادە و ئاساییە شاعیر نائاساییان دەکات و بە شێوەیەکی نائاشنایی سازیاندەکاتەوە:

**مام زۆراب لەناویدا سەبەتەی مێوژی داناوە** (سەباح رەنجدەر، ٢٠١٨، ٣٣)
**جوانە کیژان مۆسیقا دەژەنن**
**گۆرانیبێژ لەبەردەمیان تاساوە** (سەباح رەنجدەر، ٢٠١٨، ٣٤)
**گوندی گەنجینەی منداڵیم**
**یادەوەرییەکی جوان و ئەفسانەیەکی بەهێزە** (سەباح رەنجدەر، ٢٠١٨، **٥٣**)

رابردوو لە چنینی بنیاتی دەقی زێواندا زۆر بە سفت و سۆلی وەکو تۆڕێکی ورد نەخشێنراوە . هەربۆیە شاعیر ئاماژە بەوە دەکات کە ((رابردوو، بەشی هەرە گەورەی ژیانی نووسەر پێکدەهێنێ و پێکهاتەی دەقیشە)) (سەباح رەنجدەر، چوار کتێب لەبارەی شیعرەوە، ٨))

شاعیر لە ئاستی نەگوتراوی دەقەکەدا باس لە **پرۆسەی داهێنان** دەکات تەنانەت لەم رووەوە تێڕوانینی خۆیمان بۆ دەردەبڕێت بەلایەوە شاعیر کەسێکی دیار و خاوەنی خەسڵەتی تایبەتە هەر بۆیە پێگەی شاعیران دەباتە ئاستی پێغەمبەران . پێغەمبەر کە مەبەستی محەممەدە سرووشی لای خواوە بۆ هاتووە و پەیامێکی پیرۆز و گەورە و گرنگی بۆ هاتووە . کەواتە مەسەلەی پەیام و بیروڕاکانی پێغەمبەر پەیوەست دەکاتەوە بە هێزێکی دەرەکییەوە . ئەو کاتانەی کە سرووشی بۆ دێت و پەیامەکەی لا گەلاڵە دەبێت ئەو ئەوساتانە هەست بە ئارامی و خۆشی دەکات . بەڵام کە دێتە سەر

شاعیران پرۆسەکە دەبەستێتەوە بە هێزێك لە ناوەوەی مرۆڤ کە تەنها بیرکردنەوە و هەستکردنی شاعیر لە ناخی خۆیدا بۆ داهێنانی شیعرەکانی دوای ئەوەی کە بەرهەمەکانی دەکەوێتە بەر دیدی خوێنەران ئەوکاتانە شاعیر دەگەشێتەوە و هەست دەکات دەرگایەکی بەڕووی خەڵکدا کردۆتەوە و پەیوەندیی شاعیر و دەوروبەر لە دۆخێکی ئارام و جێگیردایە و درزەکەی نێوانیان بەو داهێنانە پڕدەبێتەوە چونکە گەشانەوەی شاعیر ئەو راستییە دەردەخات کە ئەو کەسە دڵخۆش دەبێت و بارە دەروونییە ناهاوسەنگەکەی تێپەڕاندووە ئەویش بە حوکمی رەوینەوەی دڵەڕاوکێی شاعیر دوای بڵاوبوونەوەی بەرهەمەکەی . زۆر جار شاعیران شیعرەکانیان بە جگەر گۆشە و کۆرپەی خۆیان هاوشێوە کردووە جگەر زۆر ناسکە و هەستیارە کۆرپەش ئەو مەخلوقەیە کە بە موعجیزە و لە پرۆسەیەکی نۆ مانگیدا دەخولقێت و دواتر دێتە بوون و سەرەڕای ژان و ئازارێکی زۆر لە کاتی منداڵبووندا دایك کە کۆرپەکەی دەبینێت هەموو ئازار و ژانێکی بیر دەچێتەوە لە دیوی ناوەوەی ئەم دێڕە شیعرەدا شاعیر دەیەوێت پێمان بڵێت کە نووسینی شیعر وەکو منداڵبوون وایە دوای ژانێکی زۆر شیعر لەدایك دەبێت ئەم دەقە سێ ساڵ زیاتر لە سنگی شاعیردا ماوەتەوە و بۆ ماوەی چوار ساڵیش لەگەڵیدا خەریك بووە و هاتۆتە تەواوبوون شاعیر لە یادی بیست ساڵەی لەدایکبوونی زێواندا راستیی ئەو بۆچوونەمان بۆ دەسەلمێنێت . زێوان کە خودی شاعیر خۆیەتی ئەو لەکاتی نووسیندا واتە داهێنانی شیعریدا ئەو کەسێکی دڵخۆش و ئارامە بەو پێیەی نووسین هاوشێوە دەکات لەگەڵ سرووش و بیرکردنەوە و منداڵبوون کە تیایدا مرۆڤ گەشبینە و بەختەوەرە شادی و خۆشبەختی شاعیر لە هیچ پرۆسەیەکی تردا بەدەستی نایەت تەنها لەکاتی نووسیندا نەبێت ئەو بە ئارەزووە گەرم و گرنگەکانی خۆی دەگات تەنانەت لە بەیەکگەیشتنی لەگەڵ نواڵەدا ئەو هەستەی لە گەشانەوە و ئارامی دەروونی بۆ دەستەبەر نابێت . کەواتە شاعیر دەیەوێت ئەوەمان پێ بڵێ کە سرووش و بیرکردنەوە و منداڵبوون و نووسین سەرچاوەی وزە و هێزن بۆ بەردەوامیی ژیان و رێکخستنەوەی پەیوەندییەکان و بڵاوبوونەوەی پەیامی مرۆڤایەتی جوان بە ئامانجی بەخشینەوەی ئومێد و هیوا لەناو دەروون و لە سیما و روخساری هەموو تاکێکدا . نووسین بەلای شاعیرەوە بە سێ هەنگا و تێدەپەڕێت هەنگاوی

یەکەم سرووشــە هەنگــاوی دووەم بیرکــردنەوە و لێکــدانەوە کۆتــا هەنگــاویش نووســینەوەیە . نووســین لە بیرکردنەوەیەکــی قــوڵ و لێکــدانەوەیەکی هەمەلایەنەدا لەدایك دەبێت ژانی لەدایکبوونی وەکو ژانــی منــداڵبوون بە ئــازارە بەڵام هەرکە هــاتە دنیاوە شاعیر ئارام دەبێتەوە و پێی دەگەشێتەوە . پەیامەکەی شاعیر هەڵگــری ســۆز و خۆشەویستی و مرۆڤدۆستییە بــۆیە هەمــوو خەڵکــی ســەرزەوی پێــی شــاد دەبــن کە بەرهەمی شاعیریان دەگاتە دەست .

**گۆرانیم ئاوێنەیەکە وەك بەیانیانی بەهار روون**
**پێغەمبەر دەموچاوی لە کاتی سرووش وەرگرتن تێیدا دەگەشێتەوە**
**نالی دەموچاوی لەکاتی بیرکردنەوە لە شارەزوور تێیدا دەگەشێتەوە**
**دایك دەموچاوی لەکاتی منداڵبوون تێیدا دەگەشێتەوە**
**زێوان دەموچاوی لەکاتی نووسین تێیدا دەگەشێتەوە**
**ئارەزووە گەرمەکانم زەوییان شاد کرد** (سەباح رەنجدەر، ٢٠١٨، ٩)

کۆمەڵێك هۆکاری دەروونی و ژینگەیی لەوانە (مەرگ، نەگەیشتن بە یــار، بــێ بەشبوون لە سۆزی باوك، دابڕان لە دەوروبەر، نــامۆیی ) لە دیــارترین و ســەرەکیترین پاڵنەرەکــانی داهێنــانی دەقــی زێــوانن، هەرچەنــدە شــاعیر خــۆی پێــی وایە ((مەرگ سەرەکیترین هۆیە بۆ دڵەڕاوکێی داهێنان، ئامادەکردنی ئەم مەرگەش هێزی شیعرە بــۆ ڕووبەڕووبــوونەوەی لەگەڵ گرفتەکــانی ژیــان و مــان)) . (ســەباح رەنجــدەر، ٣٢،٢٠١٩) دڵەڕاوکێــی شــیعریش کە ســەرچاوەکەی بەرهەمــی شــاعیرانی ســەردەمەکە و پــێش سەردەمی شاعیرە ئەم تاقیکردنەوە شیعرییانە لە جیهانبینیی شــاعیردا رەنــگ دەدەنەوە، هەروەك دەبینین لە چەند شوێنێکدا ناوی نالی و مەولەوی و حاجی قادر دەهێنێت و رەنــگە چەنــدین شــاعیری تــریش هەبــن کە ناڕاســتەوخۆ، کاریگەرییــان بەســەریەوە جێهێشتووە.

لە **بابەتی ئیرۆتیکیدا** شاعیر راســتەوخۆ بــێ ســڵکردنەوە ئەو جــۆرە دەربڕینــانە بەکــاردەهێنێ، کە لەنــاو کــۆمەڵگەی ئــێمەدا ڕێگەپێــنەدراو بــوونە، ئەو بەربەســتە دەشــکێنێ، چــونکە لە چەنــد شــوێنێکی دەقەکەدا، جەســتەی خۆشەویســتەکەی

رووتدەکاتەوە هەرچەندە ناوی نابات و نایەوێ بە ئاشکرا ناوی خۆشەویستەکەی بهێنێت.

**پارچەیەك قوماشی مەمکدانتم دەس بخە**
**چاویلکەمی پێ روون دەکەمەوە** (سەباح رەنجدەر ۲۰۱۸، ۵۸)
**نواڵە کراسی سەما لەبەربکات**
**فریزی پەستی حەوشە ژەنگی کەوتن دادەماڵێ**
**کراسی سەماش فڕێ بدا**
**فریزی شادمانی حەوشە کتوپڕ رەشەتای دێتێ** (سەباح رەنجدەر، ۲۰۱۸، ٦٧)

شاعیر بە هەندێ نموونەی ئەزموونی خۆشەویستی شکستخواردوو . لای شاعیر و کەسانی عاشق دەیەوێت پێمان بڵێت هەرمن نیم، کە نەگەیشتووم بە یارەکەم ئەو دەمانگەڕێنێتەوە بۆ رابردوو و چیرۆك شکستخواردووی نالی و حەبیبە و شیرین و فەرهاد و برایمۆك و پەریخان کە بەیەك نەگەیشتوون دەهێنێتەوە لەلایەکی تریشەوە خۆشەویستی خۆی و نواڵە دەکاتە مێژوو دەیخاتە ریزی چیرۆکە بەناوبانگەکانی عەشق و خۆشەویستییەوە .

**برایمۆکیش ئاگری سێبووری ونکردووە** (سەباح رەنجدەر، ۲۰۱۸، ٤٠)
**فەرهاد پەیمان شکێن بکات** (سەباح رەنجدەر، ۲۰۱۸، ٥٥)
**قەڵەمکێشی حەبیبەم دەداتێ بە دیاری بۆ نواڵەی ببەم**
(سەباح رەنجدەر، ۲۰۱۸، ٦٤)

لە ئاکامی بێبەشبوون لە حەزی سێکسی و خۆشەویستی رەگەزی مێینە لای شاعیر وێنەی ئیرۆتیکی بە راستەوخۆ دێنە نێو بنیاتی دەقەکەوە حەزی سێکسی و بێ بەشبوون لە سۆزی یار، هەڵسووڕێنەری هێنانە کایەی ئەو شتانەن کە شاعیر لە منداڵی و گەنجێتیدا لێیان بێ بەش بووە و پێیان نەگەیشتووە :

**منداڵدانی ژنان گەرمن**
**دەماری ئارەزووی مەمك**
**گەرمایی پەنجە بە ئاگای دەهێنێ** (سەباح رەنجدەر، ۲۰۱۸، ٥٢)

منداڵـدانی ژن مەبەسـت ئەنـدامی زاوزێـی مێیـنەیە . مەمکـیش شـوێنێکی هەستیارە و بە دەست لێدان و راموسانی بە پەنجە و بە دەست حەزی سێکسی مێینە دەوروژێنێت . ئەمانەی لە ئاستی ئاگاییدا وتـووە . بـابزانین لە ئاسـتی نەوتـراودا و لە ئاسـتی نەسـتدا شـاعیر بە رەمـز و لە ژێـر پەردەوە چـۆن حەزی سێکسـی خـۆی دەردەبڕێت .

**چیا بەم روو ئەو روو دابکەون**
**دەشتایی لە خەسڵەتی ناز فرۆشتن خۆ پێکدادەن**
**منیش سرووش لە یەکەمین هێلکەی هەڵۆ دەخوازم**
**شیعرێکت خەون لە چێشتەخەو دەبینێ**
**پرچی خۆڵەمێشینی نواڵە لەناو باران گەشە دەکات**
**تەنیایی کەوانەیەکی ئاوریشمینە** (سەباح رەنجدەر، ٢٠١٨، ٦٧)

چیـا لە روانـگەی شـیکاری دەروونیـیەوە رەمـزە بـۆ ئەنـدامی نێـرینەی پیـاو دەشتاییش رەمزی جەستەی ئافرەتە کە بە ناز و خۆشەویستییەوە بەر چیا دەکەوێت و بەیەك دەگەن و بەریەکتری دەکەون . هێلکە هێما و رەمزی تۆوە و لە بەیەکگەیشتنی جووتبوونی رەگەزی نێر و مێ تۆی نێرینە هێلکەکە دەپیتێنێ و کۆرپەلە دەخولقێت . شاعیران هەمیشە شیعر بە کۆرپەلە و جگەرگۆشەی خۆیان دادەنـێن. لێرەشـدا شـاعیر ئاماژە بەوە دەکات کە منداڵێکیان دەبێت ئەم زاوزێکردنە و گەشەکردنە پێویسـتی بە ئاوە لێرەدا باران هەڵگری ئەو سیفەتەیە و کە دەشتایی پاراو دەکـات. لێـرەدا ئامـاژەیە بۆ جەستەی ئافرەت، ئەو تۆوەی لە زەویـدایە پێـدەگات و دەبێـتە بەرهەم واتە زەوی بەهـۆی بـارانەوە ئـاوس دەبێـت کە بـاران لە زەوی دەدات زەوی خـۆی لەبەردەمیـدا راکشاندووە و بە ناز و نەرمییەوە ئاوی بارانەکە هەڵـدەمژێت دیـارە هەمـوو شـتێك لە سروشتدا بە هۆی بارانەوە گەشە دەکات . شاعیر لە تەنیایی و بەیەکنەگەیشـتنی بە یـار بەکەوانەیەکی تەواونەکراو هاوشێوە دەکات ئەو خەونـی بەیەکگەیشـتنی بەیـارەکەی دەبێتە گرێی دەروونی ئیـتر تەنیـایی دەبێـتە ئەو رێگـایەی کە ناگـاتە دوا وێسـتگەی خۆی و دادەخرێت بەرووی هیواکانی شاعیرەوە .

**گوندی گەنجینەی منداڵیم**

ئەگەر لە ڕوانگەی دەروونناسییەوە ڕاڤەی ئەم دێڕە بکەین، کە چل و شەش جار دووبارە بۆتەوە، ڕەهەندێکی سێکس هەیە، چونکە تیۆری شیکاری دەروونی واتای ڕەمزی وشەکانی بۆ دیاریکردووین (گەنجینە ئەو شوێنەیە کە لە ڕوانگەی شیکاری دەروونیی فرۆیدەوە ڕەمز و ئاماژەیە بۆ ئەندامی زاوزێی ئافرەت، دەلالەتە بۆ حەز و سۆزی گەڕانەوەی شاعیر بۆ ئەصلەکەی بەواتای کۆرپەلەیی و جیناتی)(د. انور عبدالحمید الموسی، علم النفس الادبي، ٤٦) کۆمەڵێك وشە هەیە لە ڕوانگەی دەروونییەوە ڕەمز و دەلالەتن بۆ ئەندامی زاوزێ و منداڵدانی ژن لەوانە (چاڵ، کانەکان، ئەشکەوت، جانتا، کۆگا، گەنجینە، ژوور، دەرگا و ڕاڕەوەکان ڕەمزن بۆ کونی ئەندامی زاوزێی مێینە) (د. انور عبدالحمید الموسی، علم النفس الادبي، ٤١).

**ئەفسانەی خدری** زیندە لە کلتووری کوردەواریدا لەسەر ئەوە بنیاتنراوە، کە خدر لەوێنەی پیرە پیاوێکی نوورانیی ڕیش و سمێڵ سپیدا دەردەکەوێت بە هەموو لایەکدا دەگەڕێ و خەڵکیش بە ئاسانی نایناسنەوە بەڵام ئەوەی گرنگە ئەوەیە هەرکەسێك خدری زیندە بناسێتەوە و داوای هەرچییەکی لێ بکات بۆی جێبەجێدەکات بە تایبەتی لە گەیشتن بە مرازی خۆی و بەهاناوەچوونی و ڕزگاربوونی لە تەنگانە. پێدەچێت شاعیر لە بێ ئومێدبوونی لە گەیشتن بە نواڵە هانای بۆ خدری زیندەش بردبێت ئەو ناچارە هانا بۆ هەموو ڕێگاکان بەرێت تا بە ئاواتی خۆی بگات .

**بەختیاریی خدری زیندەیە** (سەباح ڕەنجدەر، ٢٠١٨، ١٠)

**خدر لەبن نوێنی گیایان مردنی لەخەوندا بینیوە** (سەباح ڕەنجدەر، ٢٠١٨، ٤٣)

**تا مردن لەوێ**

**لە وڵاتی خەون دەژیم** (سەباح ڕەنجدەر، ٢٠١٨، ٥٨)

خدر ڕەمز و هێمای بەهانەوەچوون و بە دەنگەوەهاتن دێت کە کەسی لێقەوماو بەدوای فریادڕەسێکدا دەگەڕێ لە گێژاوی ژیان ڕزگاری بکات . شاعیر بە منداڵی باوکی لەدەست داوە بۆیە دەشێت کە خدر بکاتە جێگرەوەی باوك بۆ خۆی .

**گیان ڕووناکەکانی ژێر سێبەری دێرینترین خانووی گوندی گەنجینەی منداڵیم**

**برادەری خدری زیندەن** (سەباح ڕەنجدەر، ٢٠١٨، ٥٨)

**خدری زیندەش سەرگەرمی نووسینەوەی بیرەوەرییەکانیەتی**
(سەباح رەنجدەر، ۲۰۱۸، ۵۹)

شاعیر سەرسامە بە کەسێتیی خدری زیندە و خۆی بەو دەشوبهێنێت . سەباح لەزۆر شوێنی شیعرەکەدا خدری زیندە و ئاوی زمزم و گیای هوما دەکاتە مۆتیفی سەرەکی بنیاتی دەقەکەی . شاعیر ویستی درێژکردنەوەی ژیانی خۆی و نەمری هەیە لەو رووەوە خۆی بە خدری زیندە هاوشێوە دەکات .

**گرمۆڵەبوونی خدری زیندە ژوورێکی لاپەڕی گوندی گەنجینەی منداڵیمە**
(سەباح رەنجدەر، ۲۰۱۸، ٦۳)

**گیای نەمریم بەرەواژی بینی** (سەباح رەنجدەر، ۲۰۱۸، ٦۷)

**ئاوی زمزمی ناو گۆلمت دەخۆمەوە** (سەباح رەنجدەر، ۲۰۱۸، ۲۰)

ئەگەر ئاوی حەیات رەگەزی سەرەکی و بەردەوامی ژیان بێت بۆ نەمریی خدری زیندە ئەوا گۆلمی یارەکەی بۆ ئەو دەبێتە رەگەزی مانەوەی ژیانی هەتا هەتایی شاعیر، چونکە پێی وایە بەگەیشتنی بە نواڵە ئیتر ژیانی هەتا هەتایی بەدەست دەهێنێت لەکاتێکدا خدری زیندە بە ئومێدی خواردنەوەی ئاوی حەیاتە بۆ ئەوە بە نەمری بگات ئەمەش ئەوەمان بۆ دەردەخات کە ئەگەر ئاوی حەیات ئاوێکی سیحری بێت ئەوە سیحری عیشق و خۆشەویستی و بەیەکگەیشتن ئەو پیرۆزییە بە گۆلمی یار دەبەخشێت کە بەلایەوە ئەوەندە عیشقەکەی پیرۆزە کە دەبێتە سەرچاوەی بەخشینی ئەو هێزە سیحرییە کە نەمری بۆ شاعیر دەستەبەر دەکات . شاعیر پێش ئەوەی ئاوی حەیات بخواتەوە ئەو ئاوی ناو گۆلمی یارەکەی دەخواتەوە دڵنیاشە کە گەیشتن بە یار ژیانی هەتا هەتایی دەستەبەر دەکات.

**ئەی ئاو هەموو ژیان بۆ تۆ** (سەباح رەنجدەر، ۲۰۱۸، ٦۹)

ئاو یەکێکە لە رەگەزە پێکهێنەرەکانی ژیان و بە بێ ئاو ژیان لەسەر گۆی زەوی بەردەوام نابێت کەواتە ئاو هەڵگری ماکی ژیانە لەلایەکی تریشەوە لە رێگەی ئاوەوەیە سەرجەم زیندەوەران دروست دەبن بەهۆی گواستنەوەی تۆو لە رەگەزی نێرەوە بۆ رەگەزی مێ . ئەم رەگەزانە وەکو ئامراز و بنەمای پێکهاتەی شیعر بۆ

مەبەستێکی تر بەکارهاتوون وەك سیمایەکی دیاری نوێخوازی بۆ بەرهەمهێنانی شیعرییەت مامەڵەی لەگەڵدا کردوون بە مەبەستی فراوانکردنی جیهانبینی دەقەکە .

ئەفسانەی دروستبوون و دروستکردنی مرۆڤ لە قوڕ هەروەك لە قورئانی پیرۆزیشدا هاتووە کە خوا ئادەمی لە قوڕ دروستکرد و رووحی بەبەردا کرد و دواتریش حەوای لە جەستەی ئادەمەوە دەرهێناوە بەڵام گوناهی خواردنی سێوەکە بە یەکەم گوناە ئاماژەی پێکراوە بوو بە هۆی ئەوەی لە بەهەشت دەربکرێن و فڕێ بدرێنە سەر زەوی کەواتە ئێمە هەموومان لەخاك دروست بووینەوە بۆ خاکیش دەگەڕێینەوە . شاعیر لە ئاستی نەوتراودا ئەوە دەڵێت کە بە گەیشتن بە خۆشەویستەکەی ئەوە ئەو بەهەشتە دروست دەکەن کە هەمیشە و هەتاهەتایە بە ئاسوودەیی ژیان بەسەر بەرن، بەڵام شکاندنی بەڵێنی بۆ یەکبوونیان لەلایەن نواڵەوە بەهەشتەکەی کە شاعیر هەوڵی بۆ دابوو گۆڕا بۆ دۆزەخ بەو پێیەی ئادەم و حەوا پێشتر لە بەهەشت دەژیان بەڵام دوای خواردنی سێوەکە لە بەهەشت دەرکران و فڕێدرانە سەر زەوی کەواتە ئەم زەوییە ئێستا وەکو دۆزەخ وایە بۆ مرۆڤەکانی سەری . شاعیر لە نەگەیشتنی بە یارەکەی خۆی بێ تاوان نیشاندەدات، ئەو وەکو زێوان خۆی دەناسێنێت کە ژیانی تاڵ بووە وەکو گیا تاڵەکە لەناو بەهەشتی سەر زەوی دەریدەکەن ئەم دۆخەی بەسەریدا هاتووە باجی تاوان و هەڵەی نواڵەیە دەیداتەوە .

**نواڵە هێندەی ئاگری حەفتاو پێنج دڕندەی** (سەباح رەنجدەر، ٢٠١٨، ٥٤)

شاعیر مەبەستی لە حەفتاو پێنج ساڵی ١٩٧٥ کە شۆڕشی کورد لەو ساڵەدا لە باشوور تووشی شکست بووە بە هۆی پیلانێکی نێو دەوڵەتییەوە کە کاریگەری لەسەر تاکی کوردی زۆر بوو . پەشیمانبوونەوەی نواڵە و بێ پەیمانێکەی ئەوەندە بەهێزە بەڕادەیەك، بە یارەکەی دەڵێت دڕندە، چونکە تووشی شکستێکی گەورەی کردووە شاعیر خۆی وەك قوربانی پیشاندەدات کە پیلانی لە دژی گێڕاوە .

**ئێمە بۆ لێرە دەمرین**
**ئێوە بۆ لێرە دەژین**
**گەیشتوومەتە رۆخی خنکان**
**بێدەنگ رێورەسمی مردنم بەرپا دەکەم**
**خوێنی پێم عەرد رەنگ دەکات** (سەباح رەنجدەر، ٢٠١٨، ٧٠)

پرسی مردن لای شاعیر وەکو بیرکەرەوەیەکی لەبەردەم مەترسییەکانی مەرگ ئامادەبوونی هەیە هەست دەکات مەرگ لە پشتی سەریەوە راوەستاوە و کەی ویستی هێرشی بۆ دێنێت ئەو مەترسییە گەورەیەش وادەکات بەردەوام مرۆڤ لەترسدا بژی ترسی مردن و کۆتاییهاتن ... پرسیارە فرە رەهەند و ئاڵۆزەکەش ئەوەیە ئاخۆ شاعیر بۆ ئەو پرسیارە ناکات کە لە نێوان ژیان و مردندا هەیە ؟

**ترس لە چێورمەی گۆڕەکان کاتی سێو پێگەیشتن دیاری دەکات**

(سەباح رەنجدەر، ٢٠١٨، ٧)

**دوێنێ مەرگ بەرەو لام هات**
**تۆزێ راما**
**بوێری نەکرد لادا**
**بە منداڵی لەسەر کێلی باوکم کێشام** (سەباح رەنجدەر، ٢٠١٨، ١١)
**گۆڕێك لە گوندی گەنجینەی منداڵیم رێنماییکارمە**

(سەباح رەنجدەر، ٢٠١٨، ١٢)

لە سەرەتایی دروستبونی ژیان لەسەر ئەم زەوییە، مردن مرۆڤی تووشی دڵەڕاوکێ و ترس کردووە هەر بۆیە لە پێناوی مانەوەی خۆیدا هەوڵی داوە خۆی بپارێزێت و بەسەر هەموو دیاردە و رێگرییەکاندا زاڵ بێت تا درێژە بە ژیان بدات . مەرگ کەسە ئازیزەکانمان لەبەرچاو ون دەکات و لە ناز و خۆشەویستییان بێ بەش دەبین مرۆڤ هەرچەندە بڕواداربێت و خۆی وادەردەخات کە لە مردن ناترسێ، بەڵام لە کۆنستی هەمووماندایە، کە دژی مردنین و رەتی دەکەینەوە، چونکە بەو هەوڵ و تێکۆشانانەماندا، کە لە ژیاندا دەیدەن دەردەکەوێت ئێمە لایەنگری ژیاندۆستی و دنیا ویستین. شاعیر لە زۆر شوێندا خۆی وەك قوربانی نیشان دەدات ((زۆر لە مردن و تارمایی مردن دەترسام، دڵم بەتەقەی دەرگایەك دادەخورپا، کەچی بەردەوام لەباری شیعریدا ئەم ترسە پێچەوانە دەبوو و بیرکردنەوە لە خۆکوشتن لە دەقەکەدا زاڵ دەبوو.))(سەباح رەنجدەر . ئەزموون . ١١٤) حەقیقەتی مەرگ ئەوکات دەزانرێت کە توانای باسکردنیمان نییە ئێمە بۆ ئەوەی لە حەقیقەتی مەرگ بگەین دەبێ بمرین، شاعیر کە باسی مردووەکان دەکات بۆ ئەوەی بیر لە مردنی خۆی نەکاتەوە یان بە

پێچەوانەوە . شاعیر مردن وەك ڕاستییەك بەشێك لە بوونی خۆی تەماشا دەکات . شاعیر ئاواتی بە مردن خواستووە بەڵام مەرگ دۆستیش نییە . شاعیر داوا لە مردن دەکات کە کۆتایی بە ژیانی بهێنێت.

**مردن ئەم و ئەو ئازارم دەدەن** (سەباح ڕەنجدەر، ٢٠١٨، ٤٩)

**خوێنم وەك خوێنی ریشۆڵەیەکی خوێنگەرم بەفیڕۆ چوو**

(سەباح ڕەنجدەر، ٢٠١٨، ٣٧)

**گۆڕ داکەوتن**

**کێل نووشتانەوە**

**ئێسك دیارن**

**بەم زووانە قاوەی تازیەم لە دەستی مێوانان دەگێڕدرێ**

(سەباح ڕەنجدەر، ٢٠١٨، ٣٨)

**گەرمترین مووچڕکی شکۆمەندی ئەم قوربانییە خوێن بەفیڕۆچووە منم**

(سەباح ڕەنجدەر ٢٠١٨، ٤٨)

شاعیر وەسفی ئەو ژیانە کورتەی تەمەن و پڕ لە زەحمەتە دەکات و گومانیشی تێدا نییە، کە ئەویش وەك هەرکەسێکی ئاسایی تر مردنی بەلاوە ناخۆشە و حەز بە ژیان دەکات . شاعیر لە زێواندا بە شێوەیەکی بەربڵاو باس لە مردن دەکات، ئەمەش ئەوە دەردەخات سەرچاوەی ئەم بایەخدانەی بە مەرگ ترسە لە خودی مردن، کەواتە ترس لە مردن پاڵنەری سەرەکییە، کە وای لە شاعیر کردووە لە جیهانبینی شیعرەکەیدا فراوانترین ڕووبەر بە پرسی مردن داپۆشێت . جگە لە نائومێدبوونی لەوەی نەگەیشتووە بە یار و دۆخێکی سیاسی ناجێگیر شاعیری تووشی ڕەشبینی کردووە لە لایەکی ترەوە هۆکاری خەمباربوون و بێ ئومێد بوونی شاعیر هەڵقولاوی تێڕوانینی ئەوە بۆ بوون و ژیان و مردن .

شاعیر مردنی باوکی وەك ڕووداوێکی تراژیدی دەکاتە میکانیزم و ناوەرۆکی تاقیکردنەوە شیعرییەکەی . ئەو بۆشاییە گەورەیەی کە مەرگی باوکی بەجێیدەهێڵێت دەبێتە بۆشاییەکی ڕووحیی گەورە بە تینوێتییەکی بێ ئامان بۆ سەرۆك و ڕابەر بۆ خۆشەویستی و باوکایەتی . شاعیر تەمەنی شەش ساڵان بووە باوکی کۆچی دوایی

دەکـات . شـاعیر لە پانتـایی دەقەکەدا بەدوای جێگـرەوەی باوکێکـدا دەگەڕێ کە سۆزی باوکێتی پێ ببەخشێ . هەربۆیەش هانا بۆ خدری زیندە دەبات، دەشێ شاعیر خدری زینـدەی وەك رەمـزی بـاوك بەکارهێنابێـت . بەڵام هـیچ کـام لەوانەی شـاعیر کردوونی بە جێگرەوەی باوك، نەیانتوانیوە ئەو بۆشاییە رووحییەی بۆ پڕبکەنەوە .

شاعیر لەڕێگەی وەسفکردنی رابردووی خۆیەوە دەیەوێت باسی رووبەرێکی بەربڵاوتـر بکـات کە ئەویـش بـریتییە لە بەنمـوونەکردنی خـود بـۆ ئاخـاوتن لەسـەر بـابەتیبوون . شـاعیر زۆر خولیـای جیهـانی خـۆیەتی، هەسـت ناکـات کە کـات تێـدەپەڕێت، هەسـت ناکـات کە دەرەوە کـاریگەری بەسـەر ئەزمـوونی ئەوەوە هەیە (ئەحمەدی مەلا، ١٣٦)

**خوداوەند ماڵی منی بە پەسەند زانی**
**دابەزییە ناوی**
**دەبینێ هەموو ژیان لۆکەیەکی زەردە**
**بەبرینی ژوورەکەمەوە**
**ژوورەکەشم ئەژدیهایە کلۆری ددانی ئای کلۆری ددان**
**رژامە شەقامەکان**
**ترووسکەی فسفۆڕی جادووباز**
**قوم لە جغارەی تەمەن دەدات**
**خەناوکەی گیابەندم پێوەیە**
**ڕنۆکی لمیش ئای ڕنۆکی لم**
**تاتەشۆری مزگەفتی گوندی گەنجینەی منداڵیم تەڕە**
**من و حەشاماتی گەردوونی بەرەواژی**
**هەریەك بەجۆری نەشیاو شکست لە پەنجەمان دەئاڵێ**
**هەنجیریش بە لکانەوە ڕزین**
**منداڵیم ئارەقەی شیشەی زیندانان بوو**
**ژووری زیندانیش بۆنی دووکەڵی کزری مێشك گران دەکات**
**گەنجیم کشا**
**وەك بڵێی ئادەم و حەوای خانەوادەی دڵسۆزمان هەست بە هیچ نەکەن**

(سەباح رەنجدەر، ٢٠١٨، ٤١ - ٤٢)

ئەو شایانی ئەو هەموو ئازار و نەهامەتی و شکستەیە، چونکە ئەوە ویستی خواوەندە، کە شاعیری دەستنیشان کردووە رووبەڕووی ئەو ململانێیانەی ژیان ببێتەوە. شاعیر برینی زۆرە هەر لە نەهامەتییەکانی رۆژانی ئاوارەیی و مەرگی باوکی و نەگەیشتنی بە نواڵە و ئازاری جەستەیی و ماندوویی لە گوندێك و لەناو ژوورێك بە تەنها دوور لەو ژینگە رۆشنبیری و ئەدەبییەی لە شار بۆی خولقابوو . هەموو ئەمانە لە ژیان و تەمەنی شاعیر رۆیشت، کە هیچ خۆشییەك نەمایەوە، لە بێ ئومێدبوون دەربازی بکات ئەو تروسکاییەی لێی دەڕوانی جێی هیوا نەبوو شاعیر کەسە نزیك و خۆشەویستەکانی لەو ماوەیەی ماڵیان لە گوند بووە لەدەست داوە هەمیشە تاتەشۆری گوندەکەیانی بە تەڕی بینیوە . خۆی و هەرچی لە گەردووندا بوونی هەیە مەرگ کۆتایی پێ دێنێت هەریەکەو بە جۆرێك کە لە مەزەندەی کەسدا نەبێت بە جۆری نەشیاو تووشی شکستی دەکات . گەردوون هەنجیر لە دوای ماوەیەك هەر بە لقی داری ژیانەوە دەیرزێنێت و وای لێدەکات بەکەڵکی خواردن نەیەت و سیماکەشی بشێوێنێت ئەمە نموونەیەکە لە حەشاماتی گەردوون خۆیشی بە دەردی هەنجیر بردووە هەر لە تەمەنێکی زوودا ئاشنا بوو بە چەندین خەم و تاڵی لە هەردوو قۆناغی منداڵی و گەنجیدا . منداڵی زیندان بووە بۆی و هەژارو دەستکورت بوونە و گەنجێتیی شاعیریش ئاکامەکە شکست و نەگەیشتن بووە بە نواڵە و راکردن بووە لە سەربازی و خۆ قایمکردن بووە لە ژوورێکدا ئەویش بۆ شاعیر هەر وەك زیندان بووە. شاعیرگلەیی لە زەوی دەکات . شاعیر گلەیی لە داهێنەری بوون دەکات.

هەمیشە لە چیرۆکی دروستبوونی حەوادا ئاماژە بەوە دەدرێت کە حەوا لە پەراسووی ئادەمەوە دروست بووە، لە جیهانبینیی دەقەکەدا شاعیر کۆمەڵێك پرسیاری گرنگ و سەرسوڕهێنەر دەوروژێنێت کە لە کۆنەوە مرۆڤایەتی پێیەوەیان سەرقاڵ بووە بە ئامانجی ئەوەی هەم خوێنەر لەگەڵیدا هاوبەش بێت لەو پرسە چارەنووسسازانە و هەمیش شاعیر ئارام بێتەوە لەو دڵەڕاوکێ و نائارامییە دەروونییەی تووشی بووە . لەم دەقەدا شاعیر جارێك وەك کەسێکی باوەڕداری بێ قناع دەبینرێ و جارێکیش وەك کەسێکی بێ باوەڕ دەردەکەوێت کە هێشتا بە گومانەوە لە دیاردەکان و پرسەکانی مردن و زیندووبوونەوە دەڕوانێت گفتوگۆی نێوان شاعیران و

خودا هەر لەکۆنەوە بوونی هەبووە . شاعیر لە تەمەنێکی زوودا راشکاوانە گومان و پرسە گرنگەکانی ناخ و بیرکردنەوەی خۆی نەشاردۆتەوە و بەدوای وەڵامدا گەڕاوە

**پەراسووی نەرمی ئادەم هومای لەناو پێبگات**

**بزمارێك دەکوتمە سینگی مانگ**

**کراسی خوداوەندی پێوە دەکەم**

**گیرفانی پڕۆژەی کوشتنی کەسی تێدا نییە** (سەباح ڕەنجدەر، ٢٠١٨، ٥٦)

شاعیر بەدوای نهێنیی ئەو پرسیارەوەیە کە ئاخۆ بۆچی خوا سێوی لە ئادەم و حەوا قەدەغەکردووە بەهۆی سەرپێچیکردنیان لە فەرمانی خوا لە بەهەشت دەرکران هەروەك لە قورئاندا هاتووە بەهەشت هەموو میوەیەکی تێدایە لەناو هەموویاندا سێو لە ئادەم و حەوا قەدەغەکرا

**کتێبێك دەنووسم تێیدا لە ڕەزەوانەکان دەپرسم**

**ئەرێ سێو بۆ لە میوەکانی دی جیاکرایەوە**

**قەدەغەش کرا**

**کەی ئاسایی دەبێتەوە کەرتێکی بخۆین**

**ژیان باڵی باڵندەیەکی تەنگەتاوکراوە**

**ماڵ لە سێبەری دادەنێین**

**پشوو دەدەین**

**بیر دەکەینەوە**

**بە ئەفسانە دەڵێین برادەر** (سەباح ڕەنجدەر، ٢٠١٨، ٣٦)

تا ئێستا کەس ئەو پرسیارەی نەکردووە ئایا نهێنیی قەدەغەکردنی سێو لەناو ئەو هەموو میوانەی تر چییە ؟ خوا پێی وتوون کە لەو دارە مەخۆن وەها باس دەکرێ کە دارەکە سێو بێت دەبێت نهێنیی ئەو ڕاستییە چی بێت کە خوا خۆی ئادەم و حەوای دروستکردووە کەچی سەرپێچییان لە فەرمانی خوا کردووە سزاکەشیان دەرکردن بووە لە بەهەشت و ناردنیانە بۆ زەوی ئەم ژیانەی ئێستایی مرۆڤایەتی کە بەشێکە لە ئازارچەشتن لە پای ئەو هەڵەیەی کە ئادەم کردی کەواتە ئێمە باجی تاوان و

سەرپێچی ئادەم و حەوا دەدەینەوە بۆیە هەمیشە داوای لێ خۆشبوون لە خوا دەکەین بیگەڕێنێتەوە بۆ بەهەشت ئەی سزای ئەو کەسانەی لەسەر زەوی تاوانی گەورە ئەنجام دەدەن ؟ . سێو خواردن بۆ هەڵەیە بۆ ئادەم و حەوا فەرمانی خوایان شکاند ؟ ئایا سێو خواردن زیانی بە کەس گەیاندووە نهێنی پشت سێو خواردنەکە چییە ؟ ئادەم یان حەوا کامیان سێوەکەی خواردووە ؟

**وەك بڵێی ئادەم و حەوای خانەوادەی دڵسۆزمان هەست بە هیچ نەکەن**

(سەباح رەنجدەر، ٢٠١٨، ٤٢)

**قیژەی قورم بینی /** مرۆڤ کە لە دایك دەبێت بە گریانەوە دێتە دنیاوە قیژە دەبیسترێت نابینرێت

**تەماشای ئەستێرەی خۆڵەمێشیم بیست /** لێرە بە پێچەوانەوە ئەستێرە دەبینرێت نابیسترێت **وێنەی نائاسایی دەکاتە ئاسایی**

شاعیر قۆناغی منداڵی بە گەنجینە وەسف دەکات لە پانتایی دەقەکەدا هەمیشە خەونی پێوە دەبینێت هەروەك زانراوە گەنجینە کۆگا و کاڵایەکی بە بەها و بەنرخە هەتا سەردەم و قۆناغی بەسەردا تێپەڕێت ئەوەندەی تر بە نرختر دەبێت هەر بۆیە لای شاعیر ئەم قۆناغە بەها و نرخی تایبەتی خۆی هەیە .

**منداڵیی جیهانێکە پڕە لە تاج**
**گەنجیەتی بەدواداگەڕانی خۆشنوودی**
**پیریش باخچەی ماڵت بچووك دەکاتەوە** (سەباح رەنجدەر، ٢٠١٨، ٦١)

گەنجێتیی شاعیریش وەك هەوری کورت خایەن و کەم ئاو کە بارانی پێ نییە وەهایە . پیریش کە قۆناغی کۆتایی ژیانی مرۆڤە بەرەو لەدەستدانی ژیان بە شوێنێکی نسرمی شوبهاندووە جێگایەکە ئومێدی ژیانی تێدا قورسە چونکە تیشکی خۆر نایگرێتەوە گەشە و نەشونما ناکات قۆناغی پیریش لە گەشە دەوەستێت و بەرەو لاوازبوون دەڕوات و ئێسك وەك ئەوەی تیشکی خۆری بەرنەکەوتبێت بەرەو پووکانەوە دەچێت

**قاچەکانی شەمشەمەکوێرە بکەونە سەر زەوی**
**سەرگەردانی پتر داگیرمان دەکات** (سەباح رەنجدەر، ٢٠١٨، ٥٠)

شەمشەمەکوێرە رەمزە بۆ تاریکی و ژیانێکی ناخۆش . لێرەدا ئاماژەیە بۆ دیکتاتۆریەتی سەردەم ئەو دەم خۆی لە نیزامی بەعسییەکاندا بەرجەستەکردبوو سەرچاوەی نەهامەتییەکان بوو بۆ خەڵکی عێراق و کوردستان . ئاسۆی بەردەم هەمووان تاریك و لێڵ بوو . راگواستنی گوندی دەربەندی گۆم زێدی شاعیر و داگیرکردنی لەلایەن عەرەبەوە، کاریگەریی قووڵی لەسەر شاعیر جێدەهێڵێت . لەزۆر شوێندا لەبازنەی یەك واتایی و سووڕانەوە بەدەوری قۆناغی منداڵی و گەنجێتی دەچێتە دەرەوە چەند بابەتێکی گرنگ و سەرنج راکێش کە جێی بایەخی مرۆڤایەتییە دەورووژێنێت

**ناڵی ئێسکەکانی خۆی بە خاك و خۆڵ بەخشی**
**تا ببێتەوە خۆڵ**
**بەسەر برینی منداڵییدا بکرێ**
**ژانی بشکێت**
**حاجی قادری کۆیی ئێسکەکانی خۆی بە گۆڕ قەرەج بەخشی**
**تا ببێتەوە خۆڵ**
**بەسەر برینی منداڵییدا بکرێ**
**ژانی بشکێت**
**مەولەوی ئێسکەکانی خۆی بە سەرشاتە بەخشی**
**تا ببێتەوە خۆڵ**
**بەسەر برینی منداڵییدا بکرێ**
**ژانی بشکێت**
**منیش ئێسکەکانی خۆم بە دەربەندی گۆم بەخشی**
**تا ببێتەوە خۆڵ**
**بەسەر برینی منداڵیمیدا بکەم** (سەباح رەنجدەر، ۲۰۱۸، ٥٠)

هاوکێشەی بابەتی لای سەباح رەنجدەر لەو دێڕە شیعرانەدا کە وەك میکانیزمێکی دەروونی بەرجەستەی کردوون . شاعیر ئازارەکانی خۆی لەناو ئازارەکانی شاعیرانی وەك ناڵی و مەولەوی و حاجیدا دەبینێتەوە . کەسێك کە تووشی

نوستالژیا و هەستی دابڕان لە دەوروبەری لا دروست دەبێت بۆ بەرگریکردن و مانەوە و ئارامی دەروونی، پێویستی بەوەیە ئەو هەستە دەرببڕێت، بەڵکو لە ژێر پەردەوە و بە ناڕاستەوخۆ لە ڕێگەی کەسانی ترەوە کە ئەوانیش تووشی هەمان باری دەروونی بوونەتەوە دەهێنێتەوە تا جۆرێك لەو بارە قورسەی سەرشانی خۆی سووك بكات بەم کارەشی دوو خواستی دەروونی دێنێتەدی لەلایەك بەناڕاستەوخۆ ناخی خۆی دەردەبڕێت کە لای داهێنەران دەبێتە بالاْبوون . لەلایەکی ترەوە ئارامیی دەروونی دەستەبەر دەکات و ئەو درزە پڕدەکاتەوە کە کەوتۆتە نێوان شاعیر و دەوروبەرەکەیەوە .

ڕۆڵی نەست لە جیهانبینیی زێواندا پانتاییەکی بەرچاوی بۆخۆی داگیرکردووە و هەمیشە ئامادەیی هەیە .

**گەنجیەتییەکی باوان دوور و خۆڵەمێشیش**

**ئاگادارم باران دەتکێتە ناو گۆڕان** (سەباح رەنجدەر، ٢٠١٨، ٥٤)

یان دەڵێ :

**ژیان کەف و پووشی سەرئاوکەوتووە**

**دوای چی بکەوم با بکشێمەوە ناو تەنیایی بێگەرد و شانازیم**

(سەباح رەنجدەر، ٢٠١٨، ٤٦)

بەلای شاعیرەوە ژیان هیچ بەهایەکی نییە و کەسانی هەلپەرست ڕێزی خۆشەویستی ناگرن و لە مانای خۆشەویستیی پاك و بێگەرد ناگەن ئەوەی ئەو بەدوایدا وێڵە هەرگیز ناگات پێی و کەسیش لێی تێ ناگات ئەو بەو ژینگەیە نامۆیە کە بە دوو ڕوویی داپۆشراوە لە ناوەوە رق و ناحەزی رەگی داکوتاوە ئەم کەسێکی بێگەردە و شانازی بەخۆیەوە دەکات کە لەبەردەم شکستهێنانی لەگەڵ نواڵە و کەسە دڵ رەقەکان و ناحەزەکانی چۆك دانادات و بەردەوامە و خەون بەدوارۆژیکەوە دەبینی کە تیایدا نانی ژیان و کتێبی دانایی بەختەوەری هەتاهەتایی پێ دەبەخشن . شاعیر ژیان لەگەڵ بڵقی سەر ئاودا هاوشێوە دەکات، لەو روانگەیەوە کە بڵقی ئاو چەند بەزوویی دەتەقێت و دەنیشێتەوە و بوونی نامێنێت، بەهەمان شێوە ژیانیش تەمەن کورتە و بەزوویی دەبڕێتەوە . لە کلتووری ئێمەدا ئەو وتەیە باوە کە دەڵێ

(ژیان بڵقی سەر ئاوە یان ژیان پێچی مێزەرێکە) یان پێنج و دوو رۆژێکە ئەمەش دەلالەتی بێ بەهایی و بێ نرخی ژیان هەڵدەگرێت ئەوە دەگەیەنێت پێویست ناکات ئێمە ئەوەندە خۆمان بە ژیانەوە خەریك بکەین لەکاتێکدا دەزانین ژیان کورتە و کۆتایی دێت . کۆتایی هەموومان هەر گۆڕستانە بە چاوی خۆمان دەبینین، کەچی هەر وانەی لێوە فێر نابین .

**وام لە ژووریٚ گەنجیم کەرووی هەڵێناوە** (سەباح رەنجدەر، ٢٠١٨، ٦٣)

**تەنیایی بیابانێکی یەکپارچەیە** (سەباح رەنجدەر، ٢٠١٨، ٦٤)

**با تەنیاییم دەپشکنێ** (سەباح رەنجدەر، ٢٠١٨، ٦٦)

هەستی تەنیایی و تامەزرۆی لەڕادەبەدەری بۆ رابردووی لە کیسچوو هەستی نۆستالژیای لە دەروونی شاعیردا دروستکردووە لە پانتایی دەقی زێواندا ناوەرۆکێکی رۆمانسییانەی لەسەر غەمی نۆستالژیا بنیات ناوە بەوپێیەی دەقەکە زیاتر دەربڕینە لە خودێتی شاعیر بۆیە جۆری نۆستالژیای تاکە کەسی لە دەقەکەدا رەنگی داوەتەوە ((شاعیر لەم جۆرەدا گرینگی بە ماوەیەکی زەمەنی لە ژیانی خۆی دەدات و لە بەرهەمەکەیدا دەیخاتە روو، باسی ئەو شوێنانە دەکات، کەوا تایبەتن بە خۆی و غوربەتی تاکەکەسی)). (سۆران مامەند عەبدوڵلا، نۆستالژیا لە شیعری هاوچەرخی کوردیدا،٢٠١٦، ٥٢) لە ژێر ئەم جۆرە لە نۆستالژیا چەند جۆر و بابەتێکی دیکەی نۆستالژیا هەن دەکەونە ناو بازنەی ئەم هەستە تاکەکەسییەوە . ١- گەڕانەوە بۆ سەردەمی منداڵی ٢- گەڕانەوە بۆ گەنجی و مێرد منداڵی ٣- نۆستالژیای دووری لە مەعشووق دڵدار ٤- نۆستالژیای پیری و بیرکردنەوە لە مردن (نۆستالژیا لە شیعری هاوچەرخی کوردیدا،٢٠١٦، ٥٤)

**تەنیایی یەك دوو گەز بوو بڕیم** (سەباح رەنجدەر، ٦٣،٢٠١٨)

**بە تەنیا خۆم ترپەی پێدزەی خۆم دەژمێرم** (سەباح رەنجدەر، ٦٦،٢٠١٨)

هەستی نامۆبوون لای شاعیر هەمیشە بوونی هەبووە لە کۆچی دوایی باوکییەوە تا دابڕانی لە نواڵە و تەنانەت دوای راگواستنیان بۆ هەولێر و ئاشنابوونیان بە ژینگەی شار ئەوەندەی تر نامۆیی شاعیر بەرەو هەڵکشان رۆیشت . شاعیر خۆی لەم بارەیەوە دەڵێ ((ورووژان و نامۆییەکی بکوژ لە ناخمدا دەستی پێکردبوو، من لەناو وڵات و

کەسوکار وماڵەکەی خۆمدا ئەو دەقەم بەرهەم هێناوە، کەچی نامۆبوون تەواو تانوپۆی چنیوە و بە ئەزموونی تاراوگەکراو نامۆبوون تێدەپەڕیم)) (سەباح رەنجدەر . ئەزموون . ١١٥)

ئەوەتا لە شوێنێکی تر دەڵێ:

**تەنیایی کفنێکی گوڵڕەنگە**

**نامەوێ نا** (سەباح رەنجدەر، ٢٠١٨، ٧٣)

ئەم دەنگ بەرزکردنەوەیەی شاعیر ئەوپەڕی **بێ ئومێدبوونە لە دەست تەنیایی** کە بە دوو جار جەختکردنەوە نامەوێ و نا جەخت دەکاتەوە لەسەر بابەتێکی ئازار بەخش کە ناخی شاعیری لە ناوەوە تووشی تێکشکانی دەروونی کردووە .

لە پانتایی دەقی زێواندا شاعیر بایەخ بە رووداو و بەسەرهاتەکانی رابردوو دەدات و دەیکاتە هەوێنی داهێنان و بە هۆیانەوە جیهانێکی نۆستالژی بەرهەم دەهێنێت .

هەرچەندە بەشی زۆری بنیاتی دەقەکە لە سەر وێستگەی ژیانی منداڵی و گەنجی شاعیرە، بەڵام لەپاڵ ئەوانەشدا کۆمەڵێك پرس و چەمکی گرنگ دەهێنێتە پێشەوە کە گرنگی و بایەخ و کاریگەرییان هێندەی کاریگەری یادەوەرییەکانی قۆناغی منداڵی و گەنجیی شاعیر رۆڵیان هەیە . چونکە دەقی زێوان خاوەنی خەسڵەتێکی تایبەتییە ئەویش ئەوەیە پابەندی یەك بابەت نەبووە بەڵکو چەندین بابەتی لەو دەقەدا کۆکردۆتەوە جگە لە یادەوەری منداڵی و گەنجێتی و خۆشەویستی لەگەڵ نواڵە کە بابەتی سەرەکی و بنچینەیی دەقەکەن چەند بابەتێکی گرنگی تریشی هێناوەتە نێو جیهانی دەقەکە ئەم بابەتانەیشی بە هەستێکی نۆستالژیا بەرهەمهێناوە، لەوانەش مردن، سروشت، مێژووی دروستبوونی گەردوون، ئادەم و حەوا و دروستبوونیان و دەرکردنیشیان لە بەهەشت، نەمری، نادادپەروەری، حەزی سێکسی، پرسی کورد، لە ئەنجامی شیکردنەوەی ئەو چەمکانە بەپێی ئاماژەکانیان و ئەو دەلالەتە زمانانەی لەناو دەقەکەدا هەیانە تێڕوانین و تێگەیشتنی مەعریفیی شاعیرمان بۆ ڕووندەبێتەوە .((جیهانی ئەم شاعیرە وەك نارنجۆکێك هەپروون بە هەپروون بووە، هیچی بەسەر یەکەوە نەماوە، پارچەکانی جارێکی دی مەحاڵە پێکەوە گرێ

بدرێنەوە، بەڵام هەر پارچەیەك خۆی لە خۆیدا پێکهاتەیەکی شیعرییە (ئەحمەدی مەلا، سەردەمی نوێ، ١٣٥) ئەحمەدی مەلا پێی وایە کە جیهانی شیعریی شاعیر پارچە پارچەیە و مەحاڵە پێکەوە گرێ بدرێنەوە . بەڵام بە پێچەوانەوە من لێرەدا هاتووم بەپێی سروشتی بنیاتی بابەتی دەقەکە پارچەکانم پێکەوە گرێ داوە.

**منداڵیم لە ڕاوە ماسی و کۆلارە هەڵدان و هێلکەشکان داماڵدرا**

(سەباح ڕەنجدەر، ١٤،٢٠١٨)

پاش ئەوەی لە گوندەکەیان و لە کەشێکی ئارام و جێگیردا لەگەڵ دایکی و باوکی و منداڵان و کەسەکانیان ژیانێکی بەختەوەری بەسەردەبرد گوندەکەیان تووشی شاڵاوی بەعسییەکان دەبێتەوە و بۆ هەولێریان ڕادەگوێزن جا لەوە ناخۆشتر نییە کە بە زۆر و دوور لە خواستی خۆت لە زێدی باو باپیرانت هەڵتکەنن و دوورتبخەنەوە ئەم ژینگە نوێیە شاعیر تووشی جۆرێك لە دابڕان و نائارامی دەروونی دەکاتەوە لەلایەك بە هۆی ئەوەی ئەو خۆشییانەی منداڵی لەدەست چووە لەلایەکی تریش بە بێ باوکی ڕوو لە جێگایەکی نوێ دەکات .

**دەنگێك لە هەستی جەربەزەیی شیری دایکمەوە**

**ئەو گۆڕە گۆڕی باوکتە** (سەباح ڕەنجدەر، ٢٣،٢٠١٨)

**باوکم پیاوێکی زۆر باش بوو** (سەباح ڕەنجدەر، ٦٠،٢٠١٨)

خۆ گونجاندن لەگەڵ ئەم بارودۆخە نوێیەدا کارێکی قورس دەبێت، چونکە خۆشەویستی بۆ دەوروبەر و کەسەکانی لەدەست داوە .. بەڵام لەدوای ئاشنابوونی بە نواڵە کچێکی خانەدانی هەولێر تارادەیەك کەشێکی ئارامی بۆ دروست دەبێت .

هەر وەك خۆی دەڵێ :

**نواڵە ئەی خانەدان**

**سێبەر و هێشووی درەختی من**

**دەتوانی پرچی بڵاوت لە ناوەندی سەرت کۆکەیتەوە گەشتم لەناوی تەواو دەبێ**

(سەباح ڕەنجدەر، ١٠،٢٠١٨)

**نەرمە دەنگت ئەسپی بەیدەستی مەشقپێکراو بە مۆسیقایە**

(سەباح ڕەنجدەر، ١٥،٢٠١٨)

**نواڵە بۆ هەمیشەیی دەمکاتە دۆستی بێهوودەیی**
**سبەینەی ٣١ ی ٣ی ١٩٨٣ لە درەختی شانازیم خوارد**

(سەباح ڕەنجدەر، ٢٧،٢٠١٨)

لە بری درەختی شانازی گەر درەختی نەمری بوایا مانایەکی قووڵتر و فراوانتری دەبەخشییە بێگەردی و پاکیی پەیوەندییەکەی نێوان شاعیر و نواڵە وەك سۆزێکی ڕاستەقینە کە لە دەروونی شاعیردایە. شاعیر کاتی ئێستا رادەگرێت و لەناو رابردوو هەست بە خۆشی و شانازی ژیانی کۆنی خۆی دەکات **بۆ** کاتێکی دیاریکراو. شاعیر تاڕادەیەك توانی ئەو درزەی کەوتبووە نێوان خۆی و دەوروبەرەکەیەوە بە دروستبوونی ئەو پەیوەندییە خۆشەویستییەی لەگەڵ نواڵەدا پڕبکاتەوە، یادەوەرییەکانی لەگەڵ نواڵە زۆرە . بەڵام ئەم خۆشەویستی و بەختەوەرییە درێژە ناکێشێت بەهۆی شکستهێنانی خۆشەویستییەکەیانەوە و پەشیمانبوونەوەی نواڵە لەو پەیمانەی بە شاعیری دابوو وەك شاعیر دەڵێ :

**هەست دەکەم زەوی بێ پەیمانە**
**خۆی لە پێیەکانمان دەدزێتەوە**
**خۆری ئێرەش روومان ناداتێ** (سەباح ڕەنجدەر، ١٤،٢٠١٨)
**نواڵە ئێستا کاتژمێرەکەی نوستووە**
**ماوەیەکە پیاسەمان بەتاڵکردووە** (سەباح ڕەنجدەر، ٢١،٢٠١٨)

نامۆیی شاعیر لە هەولێر دەگاتە لووتکە ئەو پەیمان شکاندنەی نواڵە وا لە شاعیر دەکات هەموو دنیا بێ پەیمانیان بزانێت . شاعیر لە ١٩٨١ بۆ ١٩٨٣ ژینگەیەکی رۆشنبیریی هاوسەنگی لە هەولێر بەدەست هێنابوو کە بەلای شاعیرەوە رۆژانێکی خۆش بووە .

**گڵکەند و مەچکۆش کۆتی داچۆڕاوی ناو خوێن و ئێسك و گیان**
**کێ دەڵێ بە کۆچکردنی باڵندە خێرخوازەکانیم نەزانیوە**

(سەباح ڕەنجدەر، ١٤،٢٠١٨)

لەهەمان کاتیشدا شاعیر ناوی دێتەوە بۆ سەربازی و بەناچاری خۆی لە ژوورێکی ماڵەکەیاندا حەشار دەدات بۆ ماوەی چوار ساڵ لە دەوروبەر دادەبڕێت

ئەو لەم قۆناغەدا دوو شتی لەدەست داوە خۆشەویستەکەی و ژینگە رۆشـنبیرییەکەی هەولێر .

**جانتای گەنجیم پڕکرد لە خواستەکانی زەوی**
**بۆ لای مانگی بە بەزەیی رادەکەم**
**داوای پەناگەیەکی لێ دەکەم پێشی رادەگەیەنم**
**ئێسکی هوما پایپی پاشایە کوێرەکانە**
**رەژووی جەنگ لە پەنجە داگرتنێك ئاگری دا** (سەباح رەنجدەر، ٢٠١٨، ٧٣)

گەنجێتی خۆی لە ژوورێکدا بەسەر دەبات . شاعیر رووبەڕووی نـا ئومێـدی و رەشبینی دەبێتەوە دیسانەوە درزێکی تر دەکەوێتە نێوان شاعیر و ئەوانی دەوروبەرەوە شاعیر لەبارێکی دەروونیی نائـارام و نـاجێگیردا دەژی بـۆیە هەوڵـدەدات کەشـێکی ئارام بێنێتە ئاراوە و هەم ئەو درزە پڕبکاتەوە و هەمـیش ئـارامیی دەروونـی بـۆ خـۆی بەدەست بهێنێتەوە بۆیە  بە نووسینی دەقی زێوان لەماوەی چـوار سـاڵدا  ئەو خواسـتە دەروونییەی دەهێنێتە دی .

**رۆژانێکە کەسێ دەنگێك لە دەرگای کەسێکی دیکە هەڵناستێنێ**
(سەباح رەنجدەر، ٢٠١٨،٢٤)

درزێکی رووحیی گەورە دەکەوێتە نێوان شاعیر و کەسـانی دەوروبەر ئەوانەی بڕوایان بە هەندێ شت هێناوە بێ بیرکـردنەوە دەربـارەی هەنـدێ دیـاردە کە هەمیشـە خەیاڵ و خولیایی مرۆڤەکان داگیر دەکات ئەمەش لەو پرسیارانەوە دەردەکەوێـت کە شـاعیر لە بنیـاتی دەقەکەیـدا رووبەڕوومـانی دەکـاتەوە و گومـانی لە راسـتێتی بـڕواو لێکدانەوەکان هەیە گەیشتن بە راستییەکانی کارێکی قورس وماندووکەرە .

**ئاوی گومان بەسەر ئەو گیایانە دەڕێژێ**
**لەسەری دادەنیشن** (سەباح رەنجدەر، ٢٠١٨،٣٥)
**برایمۆکیش ئاگری سێبووری ونکردووە**
**ژەنگ لە گۆی مەمك ژەکن** (سەباح رەنجدەر، ٢٠١٨،٤٠)

برایمۆك : بەیتێکـی میللیـی کـۆنی کـوردەواری و داسـتانێکی پـڕ لە کارەسـاتە برایمۆکی هەژارو رووتەڵە حەز لە پەری خان خوشکی میر دەکات و ئاشقی یەکـدی

ئەبن کە میر بەم دڵدارییە دەزانێ لە شەوێکی تۆف و کرێوەدا برایمۆك دەرئەکا... (توحفەی موزەفەرییە. ٢٠١١، ٢٨٣) شاعیر خۆی بە برایمۆك شوبهاندووە کە بە ئەندازەیەك ئاشقی نواڵەیە ئاگرێکی لەناخیدا هەڵکردووە هەرگیز ناگات بە ئارامی کە خۆی لە بەیەکگەیشتنی نواڵەدا دەبینێتەوە بەڵام ئەو ئەو ئەشقەی ونکردووە چیدی نایدۆزێتەوە هەروەك چۆن منداڵ سێبووری بە مەمکێك نایەتەوە کە پڕبێت لە ژەك و واتە نەگەیشتنی منداڵ بە شیری دایك و نەگەیشتنی دەستی کیژان بە رێواس و بەسەرچوونی وادەکەی و داخ بۆ ئەوە دەخوات کە نەیتوانیوە لەکاتی خۆیدا بگات بە خۆشەویستەکەی

**سواری حیلە هاواری فریاکەوتن بەفر داپۆشت**
**ئاگری سێبووری پەریخان گەرمی کردەوە**
**برینی هەڵوەشاوەی داکەوت و کفت نووست** (سەباح رەنجدەر، ٤١،٢٠١٨)
**لەم شەوە چاوڕژاوەدا تەنیا گۆپاڵێکم بۆخۆم دروست کردووە**
**چۆن بتوانم دەست بە برینی کەسێکی دیکەوە بگرم**
**رووم لێنێ رەنگەکان یەکتری ناسڕنەوە**
**لەناو برژانگ و چاوی خودا فڵچەیان تەڕکردووە** (سەباح رەنجدەر، ٤٣،٢٠١٨)

فەرهاد داستانێکی خۆشەویستیی کوردەوارییە زۆربەی شاعیرانی کورد وەکو عاشقێکی راستگۆ لە شیعرەکانیاندا بەکاریانهێناوە.

**پیرێژنێك گرەوی لەگەڵ چیایە**
**دەمی کوڵینگ بپەڕێنێ**
**فەرهاد پەیمان شکێن بکات**
**پەیمان هەورە لەناو ئاسمان خەوتووە** (سەباح رەنجدەر، ٥٥،٢٠١٨)

**پیرێژن کە** رەمزی خراپەیە لێرەدا ئاماژە و دەلالەتە بۆ تێکدانی نێوان دوو خۆشەویست و دیارە کەسێکی خراپ هەبووە لە ژیانی شاعیر و نواڵەدا رۆڵێکی خراپی گێڕاوە و بەشێکی شکستهێنانی شاعیر بۆ ئەو کەسە دەگەڕێتەوە، چونکە شکستی فەرهاد شکستی شاعیرە . شاعیر پەیمانەکەی نێوان خۆی و نواڵە بە هەور

دەشوبهێنێ، کە ئاکامەکەی هیچی لێ شین نەبوو، چونکە هەور، کە دەبێتە باران ئیتر شتێك بەناوی هەورەوە بوونی نامێنێت .

**کێ رەنگی شینی بەدەریا دا**

**باوکی ئاو دڵڕەقە تۆبەرەی خۆی لە رەنگ بێبەری کرد** (سەباح رەنجدەر، ٢٠١٨، ٤٣)

پرسیارەکانی شاعیر بۆ گەیشتنە بە حەقیقەت کە گومانیان لە دڵی شاعیردا دروستکردووە . لەناو ئەندێشەی خولقێنراودا باس لە واقیع دەکات .

**ژیان گەڵای رژاوی ژێر پێی پیادە و نووکی بلیاردە**

**بەدەم لەرینەوەی گەردەلوولەوە کۆتایی دێ** (سەباح رەنجدەر، ٤٤،٢٠١٨)

ئەم رستە شیعرییانە کە رستەی ئاسایی و یاسایی نین بۆخۆیان خاوەن خەسڵەتێکی زمانی تایبەتن دەکرێ لە روانگەی جیاجیاوە لێکدانەوەیان بۆ بکرێ لەلایەن خوێنەرانەوە . تەمەنی ژیانی بە گەڵای وەریو شوبهاندووە دەکەوێتە سەرزەوی و دوای هەڵکردنی گەردەلوولی سەختی ژیان کۆتایی بە بوونمان دێت گۆڕستانەکان دەبنە دوا وێستگەی حەسانەوەمان گۆڕی شاعیر دەبێتە نزرگەی کیژان و ژنان وەك شوێنێکی پیرۆز لیێ دەڕوانن تەنانەت پیرەکانیش بۆ ئازار و سکاڵاکانیان رووی لێ دەکەن .

**بزمارێك دەکوتمە سینگی مانگ**

**کراسی خوداوەندی پێوە دەکەم**

**گیرفانی پڕۆژەی کوشتنی کەسی تێدا نییە** (سەباح رەنجدەر، ٥٦،٢٠١٨)

لەو دەربڕینە شیعرییەدا شاعیر وەك سۆفییەکی شۆڕشگێڕ دەردەکەوێت. (شیعر لای سەباح رەنجدەر لە شێوەی جیهانێکدایە، کە نەسەرەتای دیارە و نەکۆتایی، بەڵکو لە پەڵەی جوانی، لە دەنگی نامۆ، لە بزاوتێك، لە ئاماژەیەك، لە ساتمەیەك، لە بیرەوەرییەك پێکهاتووە، لە کۆتاییدا هەموو شتێك لای شاعیر دەبێتە مادە و مایەی شیعر ).(ئەحمەدی مەلا . سەردەمی نوێ، ١٣٥)

ئەم شیعرە بە چوار ساڵ نووسراوە بەپێی ژمارەکان و رووداو و وێنەی دوور لەیەك و بابەتی جویێ تێدا کۆبۆتەوە بەڵام یەك شت شادەمار و خوێنیان دەداتێ پەرە بە ژیانیان ئەدات ئەویش بابەتی بنەڕەتی بنیاتی شیعرەکەیە کە تاڵی و تەنیایی ژیانی

شاعیره . کارێکی رووحی لەپڕ دەبێ بە کارێکی سێکسی لەپاشدا خامۆشی بەجێ دێڵێ کارە سێکسییەکە نەبۆتە کارێکی ئەبەدی و هەرگیز نەمر لای شاعیر لە کۆپلەی دواتردا نامۆیی کارێکی وەها دەکات کە دڵی شاعیر دڵۆپ دڵۆپ بەسەر رووحیدا بتوێتەوە گەر شاعیر بە نواڵەش بگەیشتایە ئەو هەست و بیرکردنەوانەی بۆ ساتێکیش لە هزر و خەیاڵی شاعیردا دوور ناکەونەوە نەدەبووە مایەی ئەوەی پرسیارە جەوهەرییەکانی دەربارەی بوون و نەبوون و ڕەگەزەکانی سروشت و گەردوونی لەبیر بەرێتەوە یاخود ببنە هۆکاری دامرکاندنەوەی حەز و خولیا سێکسییەکانی کەواتە هەر بەتەنیا نواڵە لە پشت تەنیایی و زێوانی شاعیرەوە نییە بەڵکو ئەبێت شتی تر هەبێت ئەوەی سەرەکییە و دەبێت ئاماژەی پێبدرێ مەسەلەی ترسە لە مردن کە لە پانتاییەکی زۆردا بابەتی بنەڕەتی شیعرەکەیە بێ ئەوەی شاعیر لایەنگری هەستی مەرگ دۆستی بێت، بەڵکو ئەو هاوشێوەی خدری زیندە ئاواتی تەمەندرێژی دەخوازێت تاکو خولیاکانی بە ئاکام بگەیەنێت و ڕاستییەکانی بۆ ڕوونبێتەوە وەڵامی پرسیارە جەوهەرییەکانی دەست کەوێت کە پێی وایە مەرگ بەربەستە و خەونەکانی ناهێنێتە دی.

شاعیر سەوداسەری گەڕانە، گەڕان بەدوای ئامانجێکدا کە دەیەوێت بیدۆزێتەوە یان پێی بگات لێرەوە وای نیشان دەدات، وشەکانی لە حاڵەتی گەڕانن بەدوای شتە نەدۆزراوەکان هەر لەو بەستێنەدا بەرەو ڕابردوو دەگەڕێتەوە، واتە بۆ نێو پانتایی مێژوو . ڕابردوویەك کە پەیوەستە بە ئەوی دڵدارەوە کە پێدەچێت بە گوێرەی ئەم ڕابردوویەکی خۆش و پڕ لە ئاسوودەیی بێت، لەکاتێکدا پێی وایە لە ڕێگای یادەوەرییەوە دەگاتەوە بە ئەوی دڵدار و لە چاوی ئەویشدا ڕێگای خۆی دەدۆزێتەوە لە سەرتاپای دەقەکەدا وێنەی هەستێکی دوولایەنە بە دەربڕینی خۆشەویستی لەلایەك و ڕەخنەگرتن لە لایەك لە یار بەرجەستە دەکات بەڵام هەستی ڕۆمانسییانە و وەسفێکی ڕۆمانسییانەی یار وەك خۆشەویستییەکی پاك و بێگەرد زاڵە بەسەر شاعیردا. لایەنی ژیان دۆستی شاعیر لە ئاستێکی قووڵتردا ئەو هۆکارەیە کە دۆخێك بۆ مرۆڤ دێنێتە کایەوە کە بە ئامانجەکانی خۆی بگات . لەزۆر شوێنی دەقەکەدا ئەو ڕاستییەمان بۆ دەردەکەوێت کە خۆشەویستی و عەشق دوو هۆکاری سەرەکین لە

هێنانەکایەوەی ژینگەیەك بۆ مرۆڤ تـا بتوانێـت بەدوای حەز و خواسـتەکانی خۆیـدا بگەڕێت بێگومان کاتێك مرۆڤ حەز و خواستەکانی هاتە دی جۆرێك لە دڵنیـایی و ئـارامیی دەروونـی بڕوابـوون بە خـود بەدەسـت دەهێنێـت . خۆشەویسـتییە کە مانـا و جوانی بە ژیان دەبەخشێت ئەوەی کە هارمۆنیای گەردوون و پێکهاتەکانی بە گشـتی و هارمۆنیای ژیـانی بەرهەمهێنـاوە . خۆشەویسـتییە واتـا ئەوەی ژیـان رێکـدەخات و مانای جوانی پێ دەبەخشێت، خۆشەویستییە، ئەوەی ژیـان رێکـدەخات و بەڕێـوەی دەبات و مانا و جـوانی پـێ دەبەخشـێت خۆشەویسـتییە . پەنـابردن بـۆ دروسـتکردنی عەشقێکی بێگەرد لەگەڵ نواڵە خەونێکـی گەورەی شـاعیرە لەگەڵ ئەوەشـدا هەوڵـی دروستکردنی جیهانێکی پـاکژو بـێگەرد دەدات کە نمـوونەیی بێـت و دوور بێـت لە خراپەکاری و رق و دووبەرەکی تێیدا هەمـووان هەسـت بە ئـارامی و خۆشـگوزەرانی بکات هەستی نۆستالژیا پاڵنەرێکی بەهێزە بۆ ئەوەی شاعیر پەنا بەرێـتە بەر یۆتۆپیـای عەشق و دروستکردنی شوێنێکی نموونەیی

**دەچمەوە گوندی گەنجینەی منداڵیم**
**خۆڵی رووی بەردەکانی هەموو دەسنووسەکانیم دەداتێ**
**دەمکات بە نووسەری بێهاوتا و بێباك**
**ئەو مانگەی لە مانگگیراندا**
**دەسووتێ و بەدەرەوەیە**
**ئەوە ئاوێنەی تا بڵێی روونی گەشتنامەی منە**
**ئەو گۆرانییەی پاش شەو شکانەوە**
**خورپەی بەهەشتییانەی گوێ دەزرینگێنێتەوە**
**ئەوە دەنگی مردووەکانی گۆڕستانی سنگی منە**
**ئەو چڵە رەیحانە بەژن باریکانەی لە دەمی نەرمی دێراو**
**بای وادە بۆنیان هەڵدەگرێ بۆ ناو شاری رازاوە بە باخچەی گشتی**
**ئەوە بارانی خودایی گوندی گەنجینەی منداڵیی منە**
**ئەو گیایەی تنۆکەی خوناو بەژنی دەشوات**
**دەچێتە ناو گوڵەکانی شانازی**
**ئەوە برژانگی پەرژینی چاوی منە** (سەباح رەنجدەر، ٢٠١٨، ٢٩)

هەموو کەسێك بە ڕادەیەك خەسڵەتی **نەرگسییەت** لە ڕەفتاریاندا هەیە بەبێ ئەوەی هەستی پێ بکات بەو پێیەی هەموو مرۆڤەکان هاوبەشن لە خەم و بیرکردنەوەیان بۆ دیاردەکانی ژیان لە هەمان کاتیشدا نەرگسییەتیان بە ڕادە و ئەندازەیەك تێدا دەردەکەوێت بە گوێرەی ئەو ژیانەی تێدا دەژین بەلەبەر چاوگرتنی ژینگە تایبەتی و گشتیی کەسەکە و پێگەکەی لەناو کۆمەڵدا . نەرگسییەت هەمیشە لای شاعیران و هونەرمەندان زیاتر لە کەسانی ئاسایی دەبینرێت چونکە نەرگسییەت بە ئەندازەیەکی گونجاو وەك میکانیزمێکی دەروونی بۆ ڕەوینەوەی دۆخێکی ناخۆش کە شاعیر هەست بە جۆرێك لە پەراوێز خستن بکات ئاساییە و ڕێگە پێدراوە . ڕەنجدەر لە یەکەم تاقیکردنەوەی شیعریی خۆیدا ئەم خەسڵەتەی نە شاردۆتەوە و لە چەند شوێنێکی زێواندا نەرگسییەتی شاعیر دەخوێنینەوە کە وەك بنەمایەکیش بۆتە بەرهەمهێنانی وێنەی داهێنراو .

شاعیر لەناو سوریالیزمیدا هەستە ڕۆمانسییەکانی تێکەڵ بە خەون و یۆتۆپیای ژیانێکی نموونەیی دەکات کە لەو واقیعە تاڵ و سەختەدا بەدەست ناهێنرێت . واقیعەکە تاڵە، جیهانێکە شتەکان وەکو جیهانی منداڵی شاعیر سادە و پاك نین

**کسپەی تەنیایی**
**پرسیارەکانی نالی**
**ڕنووی دەم زریان**
**بەهاوارەوە چوون**
**ناڵەی گەرمی هێمن**
**هەر هەموویان پێمان دەڵێن چیا جانتای زەنگیانەیە** (سەباح ڕەنجدەر، ٢٠١٨، ٤٩)

شاعیر سەرسامە بە ناوەڕۆکی شیعرەکانی نالی و ئەو پرسیارانەی شاعیر لە جیهانبینیی دەقەکانیدا لەبارەی هەندێ پرسی گرنگەوە ڕووبەڕووی خوێنەری دەکاتەوە . لەگەڵ ڕووحی بەرهەڵستکارانە و خۆبەدەستەوەنەدانی نالی ڕەمزی نامۆیی و نەگەیشتن بە حەبیبە و لە جیهانبینی و خۆزگە قووڵە پەستێنراوەکانی شاعیر بەرەو بردنی ئاشکراکردنی نهێنییەکانی ناوەوەی دەروونی خۆیان لە بنهۆشی شاعیردا حەشاردراوە . چیاکان ڕەمزی مانەوەی کوردن و شوێنی حەوانەوەمان بوونە لێرەوە ئەوە

ڕووندەبێتەوە کە لە پرسیارەکانی نالییەوە وانەیەك فێربین ئەوەیە، کە چیا –رەمزە بۆ شوێنی دێرینی کوردستان - شوێنی پاراستنی هەمووممان لە هەر پەلامار و هێرشێك و ئافاتێك .

**زەویش جەنگەڵێکە پڕ لە ستایشکەری کیسەڵ و چرا کوژێنەرەوە**
**بوێری ئەوە دەکات زێوان بێتە ناوی ناڕێکییەکانی ببینن**
**گومان دەڵێ من ماوم**
**ئومێدێکی خودابەخش و نایابم**
**بەختی گوڵەکان دەکەمەوە**
**رەگیشیان دەبەمەوە ناو زەویی نەرم**
**نانی گەرم و باوەڕ و زیندووبوونەوە**
**لە دیداری پیری حیکمەتدا دەکەمە یادگار**
**ژیان جوانە**
**منداڵەکانی لاستیکێکی خەت سڕینەوەیان بەدەستەوەیە**
**ئەم دێڕە دەکوژێننەوە**
**لەشکرکێشی بۆ بەرماڵی ئێمەیە**
**تەشقەڵەچییەکانیش لە پاقژگەوە نەهاتوون** (سەباح رەنجدەر، ٢٠١٨،٧٥)

لە دیدی شاعیرەوە جوانیی ژیان هەرگیز لە دەروون و ئاواتی مرۆڤدا ناسڕێتەوە هەرچەندە لە پانتایی دەقەکەدا ئەوەمان پێ دەڵێ کە ژیانی شاعیر پڕە لە نائومێدی و نامۆیی و دابڕان و رەشبینی، بەڵام لە ئاستی نەوتراوی دەقدا و هەندێ جار بە ناڕاستەوخۆ لە تاکە دێڕێکیشدا بێت ئەو هەستە ژیان دۆستییەی نەشاردۆتەوە و دەریبڕیوە، کە دەڵێ (ژیان جوانە) ئەمە ئاواتی سەرەکی شاعیرە، بەڵام لەبەرانبەر ئەم راستییە ئەوەمان پێ دەڵێ، کە لە واقیعدا ژیان جۆرێکی ترە جوانییەکانی شێوێنراوە و کەسانی خراپ بەڕێوەی دەبەن، هەر بۆیە ژیانی بە جەنگەڵ پێناسە کردووە، کە پڕە لە کەسانی دووڕوو و ماستاوچی، کە هەمیشە دژی جوانییەکانی ژیان رادەوەستنەوە فوو لە مۆمی تەمەنمان دەکەن . شاعیر خۆی واپیشان دەدات کە هەڵە و کەموکورتی نییە و ئامادەیە و لەخۆی رادەبینێت لەناو ئەو جەنگەڵستانەدا بۆ دادگاییکردن کە وەك

جوانپەرستێك و مرۆڤدۆستێك هەمیشە تـۆویی خۆشەویسـتی دەچێنێت و بـڕوای بە بوونی خـۆی هەیە و ئامـادەیە لە پێنـاوی چـاکەی مرۆڤـدا قوربـانی بـدات . ئەو بـێ بیرکردنەوە لەسەر بابەتەکان بڕیاری کۆتایی نادات گومان لە هەبوونی هەموو شتەکان دەکات ئەم رایەیی شاعیر لەوە هاتووە کە دەڵێ (مـن بیـر دەکەمەوە کەواتە مـن هەم) لێرەدا مەرجی گەیشتن بە راستی گومانە . کەی مـرۆڤ گومـانی لا دروسـت بـوو ئەو کات ئەو کەسە بوونێکی راستییە .

ئومێدێکی خودا بەخش و نایابم لێرەوە شاعیر دەڵێ من کەسێکی جیاوازم خوا منی بە پاکی بە ئێـوە بەخشیوە کەسێکی بە سـوود و نایـابم بـۆ ئێـوە و بـۆ سروشـت لەلایەك تۆوی خۆشەویستی دەچێنم و سەوزایی و جـوانی لەسـەر ئەو جەنگەڵسـتانە دەخولقێنم لەلایەکی تریشەوە مـژدەی ژیـان و مـانەوە دەبەخشـێنمەوە کە نـانی گەرم وەك رەمز بۆ بوونی یەکەم هەوڵی مرۆڤایەتی لە کوردستان کە گەنمی چاندووە ژیـان بەردەوام بـووە و وشـەی بـاوەڕ رەگوڕیشـەی قـووڵی دەگەڕێـتەوە بـۆ سـەرهەڵدانی ئاینەکان بە تایبەتی ئەوانەی بڕوایان بە زیندووبوونەوە هەیە . چـرا رەمـزی روونـاکییە جەنــگەڵ و هەمــوو زەوی روونــاك دەکــاتەوە بەڵام بە نەمــانی روونــاکی گەردوون (سروشت) جوانییەکەی دەرناکەوێت هەروەها لە واقیعشدا گەر تیشکی خـۆر نەبێـت زەوی شـوێنێکی تاریـك و ترسـناك دەردەکەوێـت کە بەکەڵکـی ژیـان نایـەت . ئەو دەیەوێت پێمان بڵێت کە ژیان جوانە و ئاواتیشی ئەو جۆرە ژیانەیە، بەڵام کەسـانێك هەن رەفتاریــان، وەکــو منــداڵ وایە،کە لە نەزانیــانەوەیە هەوڵــی ئەوە دەدەن، کە ئەم هەستە جوانەی شاعیر لەناوبەرن، چونکە بەرەی ستایشـکەرەکان و تەشـقەڵەچییەکان ئەوەندە زۆرن لە شـێوەی لەشـکرێکی بـێ بەزەییـدان کە هێـرش دەکەنە سـەر مـاڵی شاعیر خەون و ئاواتی شاعیر لەگۆڕ دەنێن، کە بە ئاماژەکانی سـڕینەوە و کوژانـدنەوە هەیــانە، کە مانــای مــردن و نەمــان دەگەیەنــن هەر بەدوای شــاعیرەوەیە و بەرۆکــی بەرنـادات تەشـقەڵەچییەکان رەمـزە بـۆ کەسـانی خـراپ، کە بە چـاوێکی کەمەوە لە شتەکان دەڕوانن بە کەسانی دووڕوو باسیان دەکات، کە ئەمـانە (لە پـاقژگەی دانتـی-یەوە نەهاتوون تا بەرەو بەهەشت بچن، بەڵکو ئەوانە ژیـان تـاڵ دەکەن)(عەبدولرەزاق بیمار،٢٠٠٦، ٨٤)، چـونکە کەسـانی سـەر ئەم زەوییـەن و بەدەر نـین لەکەمـو کـوری و

خراپەکاری. ئەم جۆرە کەسانە کە دوژمنی بەها مرۆڤایەتییەکانن رێز لە پاکی و بێگەردیی پێکهاتەی رەگەزی مرۆڤ و ژیاندۆستی ناگرن . لەشکرکێشی دەلالەتی سوپایەك دەگەیەنێ بۆ لەناوبردنی شتە جوانەکان لە ژیان چ گیاندار بێ و چ بێ گیان . کەواتە سەربازەکانی ئەم جەنگەڵستانە کەسانی ستایشکەر و تەشقەڵەچی و خراپەکارانن کە دوژمنی رووناکی و خۆشەویستی و جوانی و مرۆڤایەتین . درزی نێوان شاعیر و ئەوان لە ئاستی منی شاعیر و ئەوانی دەوروبەر . شاعیر لەگەل ژینگە رۆشنبیرییە کۆمەڵایەتییە سیاسییەکە ناتەبایە بەهۆی رێگرییەکانەوە .

**ئەنجام**

١- دەقی کراوە لە بەرهەمی ئەدەب و هونەر بەگشتی بوونی هەیە وەك چەمکێکی رەخنەیی لە دوای رێبازی بونیادگەری هاتۆتە نێو رەخنەی جیهانییەوە . دەقی کراوە بەپێی هەردوو میتۆدی هەڵوەشاندنەوەگەرایی و وەرگرتن، زیاتر لە خوێندنەوەیەك هەڵدەگرێ. دەناسرێتەوە بە پتەوی بنیاتەکەی و لێڵی و فرەڕەهەندی لە واتادا .

٢- ئێستاتیکای شیعرییەت لە شیعری کراوەدا بە پلەی یەکەم لە فرەواتایی و بنیاتەکەیدایە و لایەنەکانی تر رۆڵیان لە پێکهێنانیدا لاوەکییە. واتای ئەدەبی دۆزینەوەی واتای جوانییە لە دیوە شاراوەکانی دەقدا کە خوێنەر لە روانگەی مەعریفیی خۆیەوە ئەیبەخشێ بە دەقەکە . دەقی کراوە پەیوەندییەکی تیۆری و زەینی لە خوێنەر دەخوازێ کە دەبێتە مایەی بنیاتنانی ئاڵوگۆڕکردنی پەیوەندیی نێوان خوێنەر و رەگەزەکانی دەق .

٣- دەقی زێوان یەکێکە لەو دەقە شیعرییانەی تایبەتمەندیی کراوەیی و خەسڵەتی فرەواتایی هەیە لەبەردەم خوێنەردا . کە وەك دەقێکی زیندوو بە تۆکمەیی و دەوڵەمەندی لە زمان و تەکنیك و فرە بنیاتدا دەمێنێتەوە . بەجۆرێك خوێنەر لەگەڵ هەر خوێندنەوەیەکدا کۆمەڵێك جوانیی دیکە دەدۆزێتەوە کە لە خوێندنەوەکانی پێشووتردا پەی پێ نەبراوە . پابەندی زمانی شیعری جیاوازە، چونکە روو لە تەقاندنەوەی زمان و بارگاویکردن و پێکاندنی لە سەیرترین بەکارهێنانیدا دەکات.

٤- سیمایەکی دیاری دەقەکە ئەوەیە کە ئەم دەقە پەیوەستە به ژیانی تایبەتی قۆناغی منداڵی و گەنجێتیی شاعیرەوە . کە سۆزێکی راستەقینەی لە پشتەوەیە و شاعیر راستگۆیە لە گێڕانەوەی رابوردوو بە خۆشی و ناخۆشییەکانیەوە.

٥- بابەت و پرسی نهێنییەکانی بوون لە بنیات و جیهانبینیی شیعرەکەدا جۆرێك لە نەمری و زیندوویێتی بە دەقەکە بەخشیوە، چونکە ئەو بابەتانە لە هەموو قۆناغەکانی مرۆڤایەتیدا جێی بایەخ و تێڕامان بوونە لە گەڕان بەدوای راستییەکان و کردنەوەی دەرگاکان بەڕووی راستییە نەدۆزراوەکاندا.

٦- حەزی سێکس وەك بنەمایەکی غەریزەیی و وەك پاڵنەرێکی دەروونی هۆکاری بنچینەیی پرۆسەی تاقیکردنەوەی دەقی زێوانە، شاعیر نەیشاردۆتەوە، کە خەفەکردنی خواستە سێکسییەکانی و نەگەیشتن بە یارەکەی، تووشی نائارامی دەروونی کردۆتەوە خۆی وەك کەسێکی تەنیا و نامۆ دەردەخات .

٧- شاعیر دەیەوێ لەڕێگەی مردنی ئەوانی ترەوە ئەزموونی مردنی خۆی بکات دەیەوێ مردن بکات بەو چەمکەی کە دنیای پێ راڤەبکات یاخود مردن لە میتافیزیکەوە بێنێتەوە بۆ دنیای واقیع و لەم رێگەیەوە تەموومژی مردن بڕەوێنێتەوە و بڵێت ئێمە لە مردن تێدەگەین .

٨- هەستی تەنیایی و تامەزرۆی لەڕادەبەدەری بۆ رابردووی لەکیسچوو هەستی نۆستالژیای لە دەروونی شاعیردا دروستکردووە لە پانتایی دەقی زێواندا ناوەرۆکێکی رۆمانسییانەی لەسەر غەمی نۆستالژیا بنیات ناوە بەو پێیەیی دەقەکە زیاتر دەربڕینە لە خودێتیی شاعیر بۆیە جۆری نۆستالژیای تاکە کەسی لە دەقەکەدا رەنگی داوەتەوە . نامۆیی

دیاردەیەکە هەر لە سەرەتاوە رەگی خۆی لەناو دەروون و رەفتاری شاعیر داکوتیوە .

٩- شکستی بەیەك نەگەیشتنی بە نواڵە کاریگەری لەسەر تاقیکردنەوە شیعرییەکەی دەبێت لە رووی دەروونییەوە وەك کەسێکی تێکشکاو دەردەکەوێت هەر بۆیە لە دیدێکی رەشبینانەوە وێنای پەیوەندیی خۆی بەدەوروبەرەوە دەستنیشان دەکات.

١٠- نەرگسییەت و داهێنان، ڕەنجدەر لە یەکەم تاقیکردنەوەی شیعری خۆیدا ئەم خەسڵەتەی نە شاردۆتەوە و لە چەند شوێنێکی زێواندا نەرگسییەتی شاعیر دەخوێنینەوە کە وەك بنەمایەکیش بۆتە بەرهەمهێنانی وێنەی داهێنراو .

١١- کارەکتەرە کلتووری و ئەدەبییەکان لە زێواندا یەکسانە بە خودی شاعیر و ناوهێنانی هەریەکەیان بۆ بابەتێك دەگەڕێتەوە نالی بۆ غەریبی و نەگەیشتن بە یارەکەی. حاجی بیری نەتەوەیی. مەولەوی سروشت و بێگەردیی بۆچوونەکانی. هەموویان لە ئەزموونی خۆشەویستییاندا بێ ئاکام بوون .

١٢- لە زێواندا شاعیر بەردەوام لە هەوڵی ئەوەدایە کە مامەڵەیەکی ئەفسانەیی لەگەڵ واقیعدا بکات سەرجەمی ئەندێشەکان بەرهەمهێنراوی خەیاڵی شاعیرە و لەزۆر بابەت و هەڵوێستی گرنگ و هەستیاردا خۆی دەخاتە ئاست پیاوە پاك و بێگەردەکان کە ئاشقێکی ڕاستگۆیە و شاعیرێکی بێ هاوتا و کەسێکی ژیاندۆستە .

**سەرچاوە:**


١- **امبرتو ايكو**، الاثر المفتوح، ترجمة عبدالرحمن بو علي، الطبعة الثانية، ٢٠٠١، دار الحوار للنشر، سورية.

٢- **ئەحمەدی مەلا**، باجی جیا نووسین : ئەزموونی سەباح ڕەنجدەر، سەردەمی نوێ، ژمارە (١)، ٢٠١٩، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی.

٣- **ئـازاد عەبدولواحیـد**، د. مـارف خەزنەدار لە گۆڤـاری رامـان دا، ئەکادیمیـای کـوردی، چاپخانەی زانکۆی سەلاحەددین، هەولێر، ٢٠١٨ .

٤- **د. ئیبراهیم مەحموود خەلیل**، ڕەخنەی ئەدەبی نوێ، وەرگێڕانی : د. محەمەد تاتانی، چ١، ٢٠١٧، کەرکوك .

٥- **ئۆسکارمان**، توحفەی موزەفەرییە، پێشەکی و ساغکردنەوەی هێمن موکریـانی، دەزگـای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، چ٣، هەولێر، ٢٠١١ .

٦- **د. انور عبدالحميد الموسى**، علم النفس الادبي، منهج السيكولوجي في قـراءة الاعـماق، بيروت، لبنان، ٢٠١١ .

٧- **پیتەر هالبێرگ و دانەرانی تر**، تیـۆریی ئەدەبـی و شێوازناسـی، ئامـادەکردن و وەرگێڕانـی **ئەنوەر قادر محەمەد**، چ ٣، ئەندێشە سلێمانی، ٢٠١٨ .

٨- **د. زاهیر لەتیف** . جێگۆڕکێی دەقی کراوە و دەقی داخراو، سایتی ناوەنـدی چـاپەمەنی و ڕاگەیاندنی خاك، ٢٠١٩ .

٩- **د. رباب هاشم حسين**، النص المفتوح، مفهومه ومرجعياته، دكتـورا، جامعـة بغـداد، كليـة التربية، https://www.google.com.

١٠- **ڕێبوار سیوەیلی**، کتێبی نـالی، چ ١، هەولێـر، چاپخـانەی وەزارەتـی پەروەردە، دەزگـای چاپ و بڵاوکردنەوەی موکریانی.

١١- **حەمە سەعید حەسەن** . فڕین بە باڵی شیعر . ناوەندی ئاوێر، هەولێر، ٢٠١٨ .

١٢- **حوسێن لەتیف**، دەق لە چاوەڕوانی خوێنەردا، رامان، ژمارە (٢٤٤)، ٢٠١٧، هەولێر.

١٣- **چارلز برێسلێر**، وەرگێڕانی لە ئینگلیزییەوە : **عەبـدولخالق یەعقـوبی**، دەزگـای چـاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٢ .

١٤- **سەباح ڕەنجـدەر**، ئەزمـوون وەك ئاخاوتنێـك لەنـاو ژیـان، چاپخـانەی حـاجی هاشـم، هەولێر، ٢٠١٤.

١٥- **سەباح ڕەنجدەر**، ئەزموون وەك ئاخاوتنێك لەناو ژیان، هەولێر، ٢٠١٤ .
١٦- **سەباح ڕەنجدەر .** (٢٠١٨) دیوانی سەباح ڕەنجدەر . بەرگی یەکەم . چاپی یەکەم، تاران
١٧- **سەباح ڕەنجدەر.** (٢٠١٩) چوار کتێب لەبارەی شیعرەوە . وەزارەتی ڕۆشنبیری و لاوان، هەولێر.
١٨- **سامان عیزەدین سەعدوون**، دەقە شیعرییەکانی گۆران لە ڕوانگەی دەروونناسییەوە،٢٠١٥.
١٩- **سەلاح حەسەن پاڵەوان**، شیعری کراوە لە ئەزموونی شیعری نوێی کوردیدا، چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، هەولێر، ٢٠١٠ .
٢٠- **سۆران مامەند عەبدوڵڵا**، نۆستالژیا لە شیعری هاوچەرخی کوردیدا، چاپی یەکەم، ٢٠١٦، تاران .
٢١- **سيڤا علي عارف**، النص المفتوح في الادب، فلك الدين كاكەيی، اطروحة دكتورا، جامعة السليمانية، كلية اللغات قسم اللغة العربية، ٢٠١٩ .
٢٢- **سرور حسن محمد**، ملامح سريالية في شعر، ادونيس و صباح رنجدر، اربيل، ٢٠١٣ .
٢٣- **د. صلاح فضل** . التخيل من فئات الادب والنقد . الشركة المصرية العالمية للنشر ، القاهرة، ١٩٩٦.
٢٤- **لوقمان ڕەئووف**، بنەماکانی مۆدێرنە لە شیعرەکانی شێرکۆ بێکەسدا، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، چ ١، سلێمانی، ٢٠٠٩ .
٢٥- **لوقمان ڕەئووف.** ٢٠١٢ ڕەهەندەکانی شوێنکات لە دەقە واڵاکانی شێرکۆ بێکەس، چاپ و بڵاوکردنەوەی سلێمانی، چاپخانەی کەمال.
٢٦- **نەوزاد ئەحمەد ئەسوەد**، ئەزموونی خوێندنەوەی چەند لاپەڕەیەکی ڕەخنەیی، چاپی یەکەم، سلێمانی، سەردەم، ٢٠٠٦.
٢٧- **نەجات حەمید ئەحمەد**، تیۆری بنیاتی شاراوە، چاپی یەکەم هەولێر، ٢٠٠٨، بڵاوکراوەی ئاراس .
٢٨- **عەبدوڵڵا ڕەحمان**، ڕۆمان شیعر مێژوو سەرهەڵدان چ ١، چ ڕۆژهەڵات، هەولێر، ٢٠١٢.
٢٩- **کەمال غەمبار**، بەرەو جیهانی شیعری چەند شاعیرێك، ئاراس، چ ١، هەولێر، ٢٠٠٨ .
٣٠- **کەمال غەمبار**، چنینەوەی چەند وتارێکی ڕەخنەیی، چ١، چاپخانەی خانی ، دهۆك، دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریان، ٢٠١٢.

٣١- **د. میجان الرویلی، د. سعد البازعی** : دنیا الناقد الادبی، المرکز الثقافي العربي، الدار البیضاء – المغرب، بیروت لبنان، الطبعة الرابعة ٢٠٠٥ .
٣٢- دەربارەی دەقی کراوە و دەقی داخراو، وەرگێڕانی : **عەبدوڵڵا تاهیر بەرزنجی**، رەخنەی چاودێر، ژ ٣٥، ٢٠٠٦ .
٣٣- **عەتـا قەرەداخـی**، بەدوای شیعردا لەنێوان وەهمی تازەگەری و واقیعیەتی تەقلیددا، گۆڤاری ئێستا، ژمارە (٧) ئابی ١٩٩٧، سلێمانی.
٣٤- **د. عبدالقادر عبو** . فلسفة الجمال في فضاء الشعرية العربية المعاصرة، دمشق ٢٠٠٧.
٣٥- **د. فوئـاد رەشـید مـحەمەد**، زاراوەی دەقی کراوە لە رەخنەی ئەدەبی کوردیدا، بژوهشنامەی ادبیاتی کوردی، دەورەی (٥)، ژمارە (٦)، ٢٠١٩ .
٣٦- https://en.wikipedia.org/wiki/Open_text

## النص المفتوح، الأسس والتطبيق
## نص السادن لصباح رنجدر انموذجا-

**ا.م.د. سامان عزالدين سعدون**
قسم اللغة الكوردية/ جامعة چرمو

يتناول هذا البحث نص السادن للشاعر صباح رنجدر في ضوء مصطلح النص المفتوح بنظرة ثاقبة وبمفهوم امرتوئيكو، حيث يقوم بتحليل النص وبقراءته بشكل مختلف عما سبق من نصوصه.

يخص الفصل الأول من البحث بالحديث عن مصطلح النص المفتوح عند نقاد الغرب والعرب والكورد، وإعطاء تفسيرا عما ورد من الاستعمالات الخاطئة لهذا المصطلح عند بعض الباحثين من العرب والكورد. وقد ركزنا فيه على الدور الرئيسي للقارئ كونه متلقي للبحث عن معاني هذه المصطلحات، لأن عملية القراءة حسب نظرية النص المفتوح لا تهمل نظرية هرمينوتيكا ونظرية التلقي في تحليل النصوص. وبذلك هذه النظرية تستطيع أن تستفيد من جميع نظريات النقد. الفصل الثاني من البحث يتناول تحليل نص السادن وقراءته ودراسة صلب النص من وجهة نظرية النص المفتوح، بهدف البحث عن معان ومواضيع خفية في النص. قد قُسِّم النص إلى مجموعة مواضيع وأحداث وشخصيات ومصطلحات من خلالهم نقدم للنص تفسيرا وشرحا وتفسيرا جديدا عن طريق الإعانة بالنظريات النقدية، بغية الإفادة من رموز ودلالات نص زيوان. وفي النهاية عرضنا مجموعة من النتائج بغية إفادة الجميع.

**الكلمات المفتاحية: صباح رنجدر، النص المفتوح،** السادن، **امرتوئيكو، القارئ، نظرية التلقي**

# The Open Text, its Principles and Practice, Sabah Ranjdar's Text 'Ziwan' as a Sample

By: Saman Ezzaddin Sadoun, Assistant Professor at Kurdish Department, Charmo University, Chamchamal

## Abstract:

This paper, under the light of 'Open Text" from Umber to ECO insight, deals with the text os 'Zewan' by the poet Sabah Ranjdar. This study shows a different analyses and readings, different from the previous ones, about the text. The first chapter of the paper is devoted to study the concept of 'Open Text' in the European, Arab and Kurdish criticisms and exposes an explanation about the misuses of the concept by some Arab and Kurdish researchers. In addition, the role of the readers is tackled as recipients having major roles in seeking for meanings. That is because the process of reading according to the concept of open text for text analysis does not overlook Hermeneutics Theory and reception theory. Thus, the theory of open text can take benefit from all the methods of criticisim.

Chapter two of the study deals with 'Zewan' text and reads its internal structure from open text perspectives that aims at seeking for the meaning and the untold subjects on the text level. The whole text is divided into subjects, events, characters and some concepts; that is to achieve new understandings about the text and take benefit from any methods of criticism that might be beneficial in analyzing the symbols and connotations of Zewan text. Finally, a number of results are displayed.

**Key words**: Sabah Ranjdar, open text, Zewan, Imertiko, reader, reception theory.

# گونجان د تێکستێ هۆزانێدا
# (دەردێ مە) ژ مەم و زینا خانی وەک نموونە

**پ. هـ. د. محسن عارف صالح**
پشکا زمانێ کوردی/ کۆلێژا زمانان
زانکویا دهۆك

پێشەکی:

ل پێشی سەرهلدانا ڤەکولینێن زمانی د بیاڤێ رەخنا ئەدەبیدا بڕیار ل سەر تێکستی ب هندەك پیڤەرێن رێژەیی دهاتەدان، بەلێ ل پشتی کو تێکستێ ئەدەبی وەکو تێکستەکێ نڤێسای و زمانی سەرەدەری ل گەل هاتیەکرن، هینگێ قۆناغەکا نوی د بیاڤێ شرۆڤەکرنا تێکستێن ئەدەبیدا دەستپێکر، ئەوژی ب ئارمانجا شرۆڤەکرنا هەمی رەگەزێن پێکهاتەیا تێکستی و ب هویری دەستنیشانکرنا هەمی بنیاتێن پێکهێنەرێن کو تێکستێ ئەدەبی ل سەر ئاڤابووی و هەروەسان دەستنیشانکرنا ئەوان هەمی پەیوەندیێن ئیستاتیکی و سیمانتیکیێن د ناڤبەرا وان رەگەزێن پێکهاتەیێن تێکستیدا پەیدادبن .

ئەڤجا هەر قوتابخانەیەکا زمانی هەمی هەولدان خۆ ژ کێم و کاسیێن شرۆڤەیی رزگاربکەت و تێکستی ل دویڤ بنەمایەکێ زانستی شرۆڤەبکەت، ب ئەوێ ئارمانجێ کو بگەهیتە وێ راستیا ڤەشارتی د ناڤ تێکستیدا. بەلێ هەر دیسان چ قوتابخانە ژ کێموکاسییان بێ بارنەبوو، بۆ نموونە ڤەکۆلینێن شێوازگەری بەرێخۆدانە رستێ کو ئەو مەزنترین یەکەیا زمانیەن، ژبەر هندێ شرۆڤەکرنا شێوازگەران شرۆڤەکرنەکا بەشی بوو، چونکی ئەوان پویتە نەدا بنیاتێ گشتی یێ تێکستی وەکو یەکەیەکا تەڤگر.

هەروەسان ڤەکۆلینێن سیمانتیکیژی بەرێخۆدانە تێکستی وەکو هندەك سیمایێن تەڤگر، یان کومەکا ل دویڤ ئێکداهاتیان ژ هێمایان، هەرچەندە ئەو ب ڤێ چەندێ

شیان بچنە ل ناڤ بیاڤێ تێکستی و شرۆڤەکرنەکا گشتی بدەنە تێکستی ب رێکا شرۆڤەکرنا هندەك رێڕەوێن تێکستی، بەلێ کێماسی ل دەڤ وان ئەڤە بوو کو ئەو رێڕەو ل هەمی دەما دجێگیر نینن، ژ بەر هندێ نەشیان ئاراستەیەکێ دیار و ئاشکەرا بدەنە شرۆڤەکرنێن خۆ.

ل پشتی هینگێ زمانڤانیا تێکستی هات و شیا خۆ ژ شرۆڤەکرنەکا بەشی رزگار بکەت ب رێکا سوود و مفا وەرگرتن ژ شێوازگەری و بونیادگەریێ و ئەوان گرنگی دا رێکخستنا ناڤخوویی بۆ یەکەیێن تێکستی، ئەڤجا پێدڤی بوو کو رێك و رێبازێن شرۆڤەکاری بهێنە رێکخستن و پویتەی ب هەمی یەکەیێن تێکستی وەکو یەکەیەکا تەڤگر بهێتەدان، چونکی رێبازێن دی نەشیان ژ سنۆرێ رستێ دەرکەڤن و بەرەڤ دەلالەتا گشتیا بنیاتێ تێکستی بچن، ئەڤ ڤەکۆلینە ل ژێر ناڤێ (گونجان د تێکستێ هۆزانێدا (دەردێ مە) ژ مەم و زینا خانی وەك نموونە) و بۆچی تێکستێ (دەردێ مە) هاتییە هەلبژارتن چونکی وەسان هاتیە زانین کو ئێکەتیا بابەتی و ئورگانیزمی د ناڤ شیعرا کلاسیکیدا نینە بەلێ مە ڤیایە بسەلمینین کو ل جهێ وێ گونجان دناڤبەرا بەشێن تێکستێدا یا هەی، چونکی تێگەهێ پێکهاتەیی پالپشتیێ ل سەر رێڕەو و چەندین پەیوەندیێن ناڤخوویی دکەت و پێدڤیە هەمی ل بەرچاڤ بهێنە گرتن بۆ شرۆڤەکرن و گەهشتن ب مەبەستا تێکستی یا راستەقینە.

**ئێك: گونجان تێگەهـ و پێناسە:**

زاراڤێ (coherence) گونجای، یان هەڤگرتی ژ وان زاراڤانە یێن بوچوونێن جودا ژ لایێ ڤەکولەرانڤە ل سەر پەیدابووی، ل سەرەڕای ئەڤێ جوداهیێ ئەم دشێین بێژین (گونجانێ، یان چنینێ گرنگییەکا تایبەت د مژارا زانستێ زمانێ تێکستێدا هەیە، (ل دەڤ نڤیسەر (کلاوس برینکر-Klaus Brinker)ی ئەڤ تێگەهە د پێناسەکرنا تێکستێدا کاکلە، هەروەسان ژ ئەوان رەگەزێن سەرەکییە ئەوێن (ڤان دایك - van Dijk)ی د ڤەکولینێن خودا ل دەربارەی پەیوەندیا د ناڤبەرا تێکستی و رێڕەویدا ئاماژەپێدای، ب ئەڤێ چەندێ دهێتە هژمارتن وەکو بنیاتەکێ گرنگ ژ بنیاتێن ڤەکولینا تێکستی، چونکی یێ پسپورە ب بەردەوامیا سیمانتیکێ ئەوێ ل پێکهاتەیا

تێگەهان و پەیوەندیێن گرێدانێ دناڤا تێکستاندا دیاردبن. ژڤێ چەندێ تنێ هەر ئەوە ڕێکا پێکڤەگرێدانا هزران دناڤ تێکستێدا) (قواوة: ٢٠١٢، ص٦٢). هەروەسان زاراڤێ گونجان (ب لایەنەك ژ لایەنێن گرنگ د ڤەکۆلینێن تێکستی، یان شرۆڤەکرنا تێکستیدا دهێتە هەژمارتن، چونکی ئەو یەکەیا هەرە مەزنە و ب سروشتێ خۆ یێ سیمانتیکی یێ پەیوەندیدار و مەرجدارە ب رادەیێ پێکڤەگرێدانا هەڤگرتنا هەمی تێکستێ، ئەڤجا ژبەر هندێ وەرگرە یێ چارچوڤە و سنۆرێ وێ دەستنیشان دکەت) (فضل: ١٩٩٢، ص٣٣٨).

گونجان کاردکەت بۆ ئاڤاکرنا تێکستەکێ پتر تەڤگر و هەڤگر کو پتر پەیوەندیێ د ناڤبەرا وەرگری و بەرهەمهێنەری و تێکستیدا پەیدابکەت. (ب ڕێکا وی ئەم دێ گەهینە مەرەما داهێنانا وێ، (ئەلسیوتی) هوسان دایە ناساندن کو ((پێدڤیە ئاخاڤتن یا ڤالابیت ژ ئالوزیێ و یا ژوردا بیت ب ژورداهییا ئاڤەکا گونجای، هەتا وێ رادێ کو ئاسانییا پێکهاتا وێ و خوشییا پەیڤێن وێ نازکیێ ئاسان بکەت، قورئانا پیرۆز هەمی یا وەسایە... کو خواندنا وێ هەر بخۆ بێ مەرەم هەڤسەنگ یا هاتی دروستکرن ژبەر موکومییا گونجانا وێ)). چونکی ئاسانییا پێکهات و ئاڤاکرنێ، ڕێزبەندییا رستان و د دویڤ ئێکدا هاتن و پەیوەندییا وان گونجانێ دروستدکەن، پشتی هینگێ تێگەهشتنێ ل سەر خوانەڤانی ئاسان دکەت، چونکی نە هەر کومکرنەك تێکستەکی ئاڤا دکەن، بەلکو پێدڤیە رەگەزێ هەڤگرتن و گونجانا رەگەزان د ناڤدا هەبیت، ئەوژی چونکی وەرگر هەولا لێکیدانەڤە و راڤە کرنێ و هەر تشتەکێ پەیوەندیی هەی ب گونجانا تێکستیڤە دکەت و هندی تێکست یێ گونجای بیت، ڕێژا راڤەکرنێ زێدە دبیت و تێکستیا وی پتر ب دەستڤە دهێت) (بن مخلوف: ٢٠٠٩، ص٤٦).

ئەڤجا زاراڤێ (coherence) ئانکو گونجان، یان هەڤگرتنا تێکستی، واتە ئەو پەیوەندیێن واتاییێن رستەییێن د ناڤ تێکستیدا ب هەڤدوڤە گرێددەن. ئەڤ پەیوەندییە پالپشتیێ ل سەر ئاخاڤتنکەر و ڕێرەوێن ل دەوروبەرێ وان دکەت و هەروەسا پەیوەندیدار دبیت ب چاڤدێرییا هوکارێن بەردەوامییا سیمانتیکی د جیهانا تێکستیدا، یان کارکرن ژبۆ ڤەدیتنا وێ پەیوەندییا تێگەهی. واتە ئەو پوتیەی ب

پەیوەندیێن سیمانتیکیێن د زانستێ تێکستیدا ب دەستڤەهاتی ددەت، ب پێچەوانەی ڕێکخستن (cohesion)، یان هەڤگرتنێ ئەوا پویتەی ب پەیوەندیێن رووکەشیێن بەرجەستەبووی د روویێ سەرڤە یێ تێکستیدا ددەت، ئەڤجا گونجان گشتگیر و کویرترە ژ ڕێکخستنێ، ئەڤەژی ژ ئەگەرێ گرێدانا وێ ب پەیوەندیێن ڤەشارتیڤە ئەوێن تێکستی ڕێکدئێخن و بەرهەمدهینن کو ئەڤان پەیوەندییان کوشش و ماندیبوون و راڤەکرن و لێکدان و ب ئەرککرنێ و هەروەسان کانێ چ د پاشخانەیا وان یا زانیارییاندا هەیە ژ زانین و سەربوران بۆ ڤەدویتنا وان پەیوەندییان و ئەنجامدانا کریارا گەهاندن و ئاوێتەبوونا جڤاکی ل سەر خواندەڤانی پێدڤی دکەن (قواوة: ٢٠١٢، ص٦٢).

گەلەك ڤەکۆلەر هەر ئێك ژ گونجان و ڕێکخستنێ دکەنە دەلالە بۆ ئێك واتا کو ئەوژی دهێتە نواندن د ئەوان پەیوەندیێن کو پێکهاتەیێن تێکستی و ڕێرەوی ئەوێن تێدا هاتین هەمیان پێکڤە گرێددەن و هندەك کەس ڕێکخستنێ دکەنە پێنگاڤەکا گرنگ بۆ گەهشتن ب گونجانا تێکستێ. بەلێ (ڤان دایك van dijk) جوداهیێ دئێخیتە د ناڤبەرا واندا کو ((گونجان: بنیاتیێن سیمانتیکیێن تەوەرێن مەزنن کو ئەڤە هندەك بنیاتێن کویرن، ب پێچەوانەی وێ ڕێکخستن: هندەك بنیاتێن سینتاکسیێن بچویکن ئانکو ئەو بنیاتن ئەوێن ل سەر ئاستێ سەرڤە یێ تێکستی دیاردبن)) (السعید: ٢٠١٢، ص١١٠). ژ ئەڤێ چەندێ وەسان دیاردبیت کو ڕێکخستنێ پەیوەندی ب لایەنێ زمانیێ سینتاکسیێ پێکهاتەییڤە هەیە و گونجانێ پەیوەندی ب لایەنێ سیمانتیکیڤە هەیە و تەکەسێ ل سەر هەردوو رەگەزێن ڤەهاندن و پەیوەندیێن گونجای دکەت، واتە ئەو گرنگیێ ب پەیوەندیێن سیمانتیکی ئەوێن ب دەستڤەهاتی د ناڤ جیهانا تێکستیدا ددەت. پێچەوانەی ڕێکخستنێ ئەوا پویتەی ب پەیوەندیێن فورمیێن بەرجەستەکری د رووکەشێ تێکستیدا ددەت.

ژ ئەڤێ چەندێ چەندین زاراڤێن جۆراوجۆر و ب ناڤئێکداچووی ل دۆر ڤێ چەندێ پەیدابوون و بوونە هۆکارێ هندێ کو ئالوزی و سەرگێژییەك د دەستنیشانکرنا واتایا هویرا زاراڤیدا ل دەڤ عەرەبان پەیدابیت و چەندین زاراڤێن وەك (گونجان –الانسجام، ڕێکخستن –الاتساق، هەڤگرتن –التماسك، پێکڤەگرێدان –

الترابط،...هتد)، هەروەسان ل دەڤ رۆژئاڤاییانژی ب هەمان شێوە هەردوو زاراڤێن وەك )coherence ,cohesion) ب تایبەت کو ژ لایێ (داڤید کارتر - David carter) ی وەکو هەڤواتا - (مورادف) بۆ زاراڤێ (coherence) وی زاراڤێ (cohesion) بکارهینان، ئانکو واتە پەیوەندییا ئالاڤێن فورمی و سیمانتیکی ئەوێن هاریکار و بەشدار د گێرانا رەگەزێن تێکستیدا چ یێن ناڤخویی، یان بنیاتیێن ژینگەها دەوروبەر پێکڤەگرێدان) (بن مخلوف: ٢٠٠٩، ص٤٧).

گونجان بۆ تێکستی ناهێتە بەخشین، بەلکو ژ ئەنجامێ خواندنێ و خواندەڤانی پەیدادبیت، دەمێ کو پویتەی ددەتە پەیوەندیێن ڤەشارتی ئەوێن تێکستی رێکدئێخن و ل دەرئەنجامدە دەربازی چاڤدێرییا بدەستڤەهاتی یان ب دەستڤەهاتیان دکەت. تێککارکرنا خواندەڤانی و تێکستی بهایێن ئەدەبی و ئیستاتیکیێن تێکستی دیاردکەن، ئەڤجا واتایا گشتی ب دەستڤە دهینیت و ژ ئەنجامێ ب دەستڤەهینانا گەهاندنێ د ناڤبەرا بەرهەمهێنەری و وەرگریدا، یێ داویێ چێژ دکەتە تێکستی و هەست ب خوشی و چێژا وی دکەت، دەمێ دخوینیت و راڤە دکەت و لێکددەت، ئەوژی ب پالپشتیکرن ل سەر کومەکا رەگەزان، ئەوێن پێکدهینن و پەیوەندیێن وان پێکڤە گرێددەن واتە گونجان ژ ئەنجامێ لێکدانا رەگەزێن زمانی ب دەستڤە ناهێت، بەلکو ژ ئەنجامێ رەگەزێن نەزمانێ ب دەستڤە دهێت، چونکی ئەو تەکەسێ ل سەر ئاستێ سیمانتیکی و کارلێکرنێ دکەت، لەورا ژ ڤێ چەندێ بۆ مە دیاردبیت کو ((گونجان ب دەستڤە ناهێت تنێ ب رێکا رێکخستنێ نەبیت و هژمارتنا تێکستی وەك یەکەیەکا مەزن یا رێکخستی، ئانکو نە رێزکرن و پرکرنەکا نەرێك یا رستانە. بەلکو راڤەکەرێ وێ ب ڤەگوهازتنێ ژ ئاستێ ئاسویی هەتا دگەهیتە ئاستێ ستوینی ژبۆ ل دویڤچوونا رادێ هەبوونا گونجانێ رادبیت، ئەوژی ب رێکا راڤەکرن و دیارکرنا گشتگیریێ، یان تەڤگەریێ و ڤەدیتنا نهێنێ وێ)) (هـ. ژ، ص٤٨).

**دوو: میکانیزمێن گونجانا تێکستێ:**

ل ڤێرێ وەکو میکانیزمەك بۆ دیاردکەن و ئاشکەراکرنا گونجانا تێکستی چەند رەگەز و بنەمایێن گرنگ هاتینە دەستنیشانکرن وەك:

**١. بنەمایێ بەشداریکرنی: ئەڤ بنەمایە داکوکیێ ل سەر لایەنێ پەیوەندی و لایەنگیریێ دکەت، واتە کا چاوا پەیوەندی و لایەنگیری د ناڤبەرا پەیڤاندا هەیە، هەروەسان هەمان پەیوەندی و لایەنگیری د ناڤبەرا رستانژیدا هەیە، چونکی د بیاڤێ زمانیدا ((دیاردا پەیوەندی و لایەنگیری - (العطف) یێ دوویێ بەشداری یێ ئێکێ د بریارا شرۆڤەکرنا زمانیدا دکەت کو هەر پیتەك یا هاتیە رێکخستن دا ئەو د ناڤبەرا یێ ئێکێ و یا بەری وێدا بیت، ئەڤ ئاراستەیە دبێژنی ئاراستەیا تەڤگر)) (موسی: ٢٠١٥، ص٣٢).**

بەشداریکرن دبیت ب پەیوەندی و لایەنگرییا دوو رەگەزان پەیدابیت کو ب رێژەیا زۆر بیاڤێ واتایی د ناڤبەرا واندا یێ دویرە، بەلێ ل سەرەڕای هندێ بەردەوام راوەستانەکا تەڤگر د ناڤبەرا واندا پەیدادکەت، یانژی بەشداریکرنەکێ د ناڤبەرا دوو رستەیاندا دروستدکەت، ئانکو ((چەندین پەیوەندییێن سیمانتیکی ب رێکا کومەکا سیمایێن تێکستی یێن سینتاکسی و یەکەیێن واتایی پەیدادبن)) (فارکلوف: ٢٠٠٩، ص١٨٣-١٨٤)، ئەڤە هەمی ب رێکا چەندین پەیوەندییێن سینتاکسی یێن هەڤلێکهاتی و ل دویڤئێکدا هاتی پەیدادبن و ب شێوەیەکێ ئاسایی و پەیوەندیدار رێز دبن.

بۆ نموونە:

**قەط مومکنە ئەڤ ژ چەرخێ لەولەب    طالع بیتن ژبو مە کەوکەب**
**بەختێ مە ژبو مەرا ببت یار    جارك بیتن ژ خوا ب هشیار**
**رابت ژ مەرا ژی جهان پەناهەك    پەیدابتن مە پادشاهەك**
**شیرێ هونەرا مە بێتە دابین    قەدەرێ قەلەما مە بێتە زانین**
**دەردێ مە ببینتن عیلاجێ    عیلمێ مە ببینتن رەواجێ**

**(خانی: ١٩٩٠، ل٤٨-٤٩)**

ئەگەر ب هویری سەحکەینە ئەڤێ پارچا هۆزانێ ژ تێکستێ (دەردێ مە)، ئەوا د مەم و زینا خانیدا هاتی، وەسان خویادبیت کو هەر پەیڤەك، یان گرێیەك، یان رستەك ئەوا د ڤێ پەرەگرافێدا هاتی بەشداری و پەیوەندی و لایەنگیرییەك ل گەل پەیڤ و رستە و پارچێێن دەوروبەری خۆ دروست کریە، واتە بەشدارییەکا راستەوخۆ ل گەل گەهاندنا واتایا گشتی هەیە و ب لادانا هەر پەیڤەکێ، یان رستەیەکێ دێ بیتە

هۆکارێ تێکدانا واتا مەبەست، چونکی واتایا ئەڤان هەمی دێرێن هۆزانێ ب شێوەیەکێ زنجیرەی و ب هەڤرا د واتاییدا د بەشدار و پەیوەندیدار و لایەنگرن، هەروەکی د شرۆڤەکرنێدا ئەڤ چەندە پتر خویا دبیت. واتە: ئەرێ گەلو قەت دەرفەتەك هەیە کو ل گەل گەڕ و زڤڕینا چەرخا فەلەکێ ستێرا بەختێ مەژی سەرهلبدەت و بەختێ مەژی ب مەرا بیتە یار و هەڤال و جارەکێ ژ خەو هشیاربیت و جیهانپەناهەك، یان رزگارکەرەك ژ ناڤ مە رابیت و پاشایەك ل مە پەیدابیت، داکو شیرهە و دیوارێ کەلها هونەرێ مە بهێتە دیتن و بهایێ پێنووس و زانینا مە بهێتە زانین، داکو دەردێ مە دەرمان بیت و زانستێ مە رەواجا خۆ پەیدابکەت.

د ئەڤێ پەرەگرافێ و چەندین پەرەگرافێن دیتردا ب ڤی رەنگی بەشدارییا رستەیان پێکڤە ب رێکا پەیوەندیێن سینتاکسی و لایەنگرییا واتایی گونجانەکێ د ناڤ تێکستیدا پەیدادکەن.

٢. رێڕەو: زمانڤانان زۆر گرنگی دایە رێڕەوی و رۆلێ وی د دەستنیشانکرنا واتایێ و تێگەهشتنا تێکستیدا. لەورا (دی سوسیر - Ferdinand de Saussure) بەرەڤ هندێ دچیت کو (پەیڤ ئەگەر کەڤتە د رێڕەوەکیدا بهایێ خۆ یێ دروست وەرناگریت، تنێ ب هاریکارییا بەرامبەرکرنا وێ ل گەل ئەو تشتێن ل بەراهیا وێ، یان پشتی وێ، یان هەردووکان ب هەڤرا نەبیت) (محمد: ٢٠٠٧، ص٢).

پشتی هینگی زانایێ زمانڤان (روبرت فیرث - R.Firth) دبینیت کو (هەر پەیڤەکا بکارهاتی د هەر رێڕەوەکێ تازەدا، ئەو ب پەیڤەکا تازە دهێتە هژمارتن) (موسی: ٢٠١٥، ص٣٤). فیرث داکوکیێ ل سەر رۆلێ رێڕەوی د دەستنیشانکرنا واتاییدا دکەت، ئەوی تیورا رێڕەوی دامەزراند، ئەڤ تیورە بەرێ خۆ ددەتە واتایێ ب سالوخدانا وێ وەکو ئەرکەك د رێڕەویدا و ب ڤێ چەندێ گۆهورینەکا جەوهەری دنیرینا واتاییدا سازکر، ئەوژی ژ رەهندێ پەیوەندییەکا ژیری د ناڤبەرا راستیاندا و چەڤەنگیێن ئاماژەیێ وێ دکەن، وەکی ئەوی سێگوشەیێ سیمانتیکیێ ناڤدار بەرەڤ پێکهاتەیەك ژ پەیوەندیێن رێڕەوی، ئەوێ هەردوو زانایان (ئوجدن و ریتشارد - Agden and Richard) ی وێنەکرین ل دویڤ دەربڕینا (فیرث)ی رێڕەو د ڤێ تیورێدا ب تێگەهەکێ بەرفرەهـ هاتیە بکارهینان کو رێڕەوێن دەنگی و مورفۆلۆژی و

سینتاکسی و فەرهەنگیژی ڤەگرتن، واتایا مەبەست ژێ ژ لایێ ئاخاڤتنکەریڤە دەرناکەڤیت، ب تنێ ب بەرچاڤگرتنا ئەرکێ سیمانتکیێ پەیڤێن بکارهاتی نەبیت، ل سەر بنەمایێ ڤێ چەندێ وی پێنج ئەرکێن بنەڕەتێن پێکهینەرێن واتایێ دەستنیشانکرن، وەك: (ئەرکێ دەنگسازی، ئەرکێ مورفۆلۆژی، ئەرکێ لێکیسیکۆلۆژی، ئەرکێ سینتاکسی - پێکهاتەیی، ئەرکێ سیمانتیکی)، د دەستنیشانکرنا واتایێدا ل سەر ڤان خالان رادوەستیت:

(أ.شرۆڤەکرنا ڕێڕەوی.

ب. دەستنیشانکرنا کەسێ ئاخاڤتنکەر و بارودوخێ دۆرپێچی ئاخاڤتنێ.

ت. دیارکرنا جۆرێ ئەرکێ ئاخاڤتنێ

پ. دیارکرنا جۆرێ کاریگەرییا ئاخاڤتنێ) (علي: ٢٠٠٤، ص٢٧-٢٨).

ئەڤجا هەر نامەیەکێ ژێدەرەك یێ هەی بۆ ڤەدگەرییت و ڕێڕەوەکێ گونجای یێ هەی کو تێدا هاتیە ئاراستەکرن، لەوڕا ناهێتە تێگەهشتن ئەگەر نەڤەگەڕینین بۆ وی دوخی و وی دەمی و وی هەلویستێ تێدا هاتیە گوتن، دا واتایەکا تەڤگر ب مەرا ببەخشیت، لەوڕا ئەڤ پرسە دهێتە ئارا، ئایە (پەیام) کەنگی و چاوا و بووچی دهێتە فڕێکرن.

ژ ڤێ چەندێ زمانڤان ڕێڕەوێ دابەشکەنە:

١) ڕێڕەوێ زمانی (verbal context): ئەو ڕێڕەون یێن ب تێکستێ ب خوڤە دگرێدای، ئانکو ب هەمی ئاستێن زمانی و پێکهاتیێن وی یێن تێکستی، چونکی واتایا پەیڤێ ب دەستڤە ناهێت بێی پەیوەندییا وێ ل گەل پەیڤێن دیتر د زنجیرەیا ئاخاڤتنێدا و جهێ وێ ل گەل پەیڤێن دیتر د ئێك ڕێڕەودا.

٢) ڕێڕەوێن نەزمانی (comtext of situation): واتە ئەو کاودانێ تێکستیە و پەیوەندیێن وی یێن دەرەکینە، ئەوێن کو تەخێن پلەیێن جودا و جۆراوجۆر ڤەدگریت ب تایبەت یێن تێکست د ناڤ واندا پەیدادبیت و ل دەڤ وان ئاوایێ گوتارێ ب شێوێ نامەیەکا زمانی د پلەیەکا دەستنیشانکریدا ب دوماهی دهێت و کاریگەریێ ل مەدلولان دکەت، دەمێ گۆهوڕین، یان جیاوازی د هەلویستاندا پەیدادبن، ئەوێن پەیڤ تێدا دهێنە بکارهینان (قواوة: ٢٠١٢، ص٦٦).

زانایێن زمانی ڕێڕەو کرە بنیات بۆ شرۆڤەکرنا تێکستێ ژ وی ڕەهندێ کو تێکست ب تنێ دوخەکێ تایبەتە د وێ ژینگەها دەوربەردا. ئەڤجا هەر شرۆڤەکرنەك بۆ هەر زنجیرەیەکا زمانی بێی ل بەرچاڤگرتنا ڕێڕەوی دێ بیتە جهێ گومانێ، ئەڤجا شرۆڤەکرن و تێگەهشتنا هەر تێکستەکی پێدڤیە رویدانێن ئاخاڤتنێ بهێنە گوشەگیرکرن ژ پێخەمەت سالوخدانا پێکهاتەیێن سینتاکسی-و سیمانتیکی، ئانکو شرۆڤەکرنا ڕێڕەوێن تایبەت ئەوێن ژێ پەیدادبن، ئەڤژی ئەگەر تێکست د دوو ڕێڕەواندا هات هینگی دێ دوو راڤەکرنان دەت، ئەڤجا ڤەگەڕیان بۆ ڕێڕەوی وەکی (ڤان دایك) دبینیت، دەمێ کو راڤەکرنان و بۆچوونان و رامانان گوشەگیر دکەت و هەولا پشتەڤانیا بۆچوون و رامانا مەبەست پێ دکەت. واتە بێی دەستنیشانکرنا ڕێڕەوی دێ بەردەوامیا گوتارێ و گونجانا وێ ڤەبریت، لەوڕا هەڤگرتنا تێکستی پەیوەندیدارە ب ڕێڕەوێن جودایێن تێکستی چ یێن دەرەکی، یان ناڤخویی بن (هـ.ژ، ص٦٧).

ئەرکێ ڕێڕەوی د ئیکگرتنا تێکستیدا د وێ چەندێدا دیاردبیت، دەمێ کو ئاڤاکرنا ڕێڕەوی هەولەك بیت بۆ گەهشتن ب تێگەهشتنا تێکستی، بێگومان تێکستێ شیعری ل پلەیا ئێکێ تێکستەکێ زمانییە و ل سەر پەیوەندیێن هەڤسیاتی د ناڤبەرا بنیاتێن تیکستی ل گەل هەڤدوو پەیدابیت. واتایا تێکستی ژ لایێ ڕێڕەویڤە یێ دیار و ئاشکەرایە، ئەو تشتێ تێکست مەبەست دکەتێ پالپشتیێ ل سەر شێوێ درکاندنا وی دکەت و کا بووچی و کەنگی و گوهدار کییە و چاوانیا گەهاندنێ و ب چ هۆکار و رێك پەیدابوویە و ئەرکێ گەهاندنێ چییە، ئانکو د ڤی بواریدا هەر چ پەیوەندییەکا پێکگۆهور دناڤبەرا تێکستی و ڕێڕەویدا هەیە بخوڤە دگریت. لەورا گرنگترین تایبەتمەندییا تیورا تێکستی (نەدەرکەڤتنە ژ بنیاتێ زمانی و ڕێڕەوێ ڕەوشەنبیری یێ دۆرپێچی تێکستی، ئەڤجا ڕێبازا وی یا ڕێڕەوی ڕێکێ خوش دکەت بۆ ئەوان کەسێن پویتەی ددەنە زمانی ل بەری پویتەدان ب ڕەگەزێن نەزمانی و جۆرێن تێدا دهێنە رێکخستن ل جهێ ئاوروی نەدان ب پەیوەندیێن دەروونی، ئەوێن د ناڤ مێشکیدا پەیدادبن) (علي: ٢٠٠٤، ص٣١).

هەر چەنـدە هنـدەك ڤەكـولەر و رەخنەگـر تیگەهـێ تێكسـتی ب تنـێ ل سـەر یەكەیێن زمانی گوشەگیر ناكەن، بەلكو هندەك بزاڤێن دەست و سیماییێن سـەروچاڤان و هندەك كریارێن ئاوێتەبوونێ ل دەمێ دانوستاندنێ دناڤبەرا كەسـاندا ل سـەر زێـدە دكەن، بەلێ هەر تێگەهێ تێكستی ژ رەهندەكێ نـاڤخوویی ل دۆر دۆرپێچـێ زمـانی یێ سینتاكسی تایبەتمەند دبیت، لەورا زمانڤانیا نوی گرنگییەكا زۆر دایە رۆلێ رێڕەوی بۆ دەستنیشـانكرنا واتـایێ د ئێكگرتنـا تێكسـتیدا، وەكـو وێ هـزرا (دی سوسـیر) بـۆ دچووی (محمد: ٢٠٠٧، ص٢).

واتە (بۆچوون و رامانان گوشەگیر دكەت و پشتەڤانیا بۆچوون و رامانا مەبەست پێ دكەت، چونكی بێی دەستنیشانكرنا رێـڕەوی بەردەوامییـا گوتـارێ و گونجانـا وێ دێ هێـتە ڤەبـرین، لەورا هەڤگرتنـا تێكسـتی پەیوەندیـدارە ب رێـڕەوێن جـودا یـێن تێكستی چ یێن دەرەكی، یان ناڤخوویی بن) (قواوة: ٢٠١٢، ص٦٧).

وەكو شرۆڤەكرن بۆ رێڕەوی بۆ نموونە:

ئەمما ژ ئەزەل خودێ وسـا كر　　ئەڤ روم و عەجەم ل سەرمە راكر
تەبەعیەت وان ئەگەر چ عـارە　　ئـەو عـار ل خەلقـێ نامـدارە
نـامـوس ل حـاكم و ئەمیـران　　تـاوان چییە شـاعیر و فەقیـران

(خانی: ١٩٩٠، ل٥٠)

وەكو شرۆڤەكرنا ئەڤێ نموونێ واتە: لێ ژ بەرێدا خودێ وەسان حەزكریە، یان وەكریە كو ئەڤان رۆم و عەجەمان ل سەر مە زاڵبكەت، دویڤەلانكی و بندەستییا رۆم و عەرەب و عەجەمان شـەرم و فهێتییەكـا مەزن، بەلـێ ئەو شـەرموزاری و فهێتییـە بـۆ خەلكێ ناڤدار و سەركردە و مەزنێن مللەتی ڤەدگەریت، شەرمەكا مەزنە ژ سەركردە و مێرێن كوردا كو ئەم ل بن دەستێ وان هێلاین و ب دویڤەلانكیا وان رازیبووین و ژبۆ بەرژەوەندییا خۆ ل دویڤ بەرژەوەنـدیێن وان دچـن ل دویـڤ گوتنـا وان دكەن و ل دژی وان ناڕابن، ئەڤە سویچ و گونەها هۆزانڤان و هەژار و بەلەنگازان نینە.

بەلێ دەمێ ئەم ب هویری دهێنە ل سـەر ڤـێ كێشـەیا ژ تێكسـتێ (دەردێ مە) ئەوا د ڤـێ نموونێـدا هـاتیە ورژانـدن ب دوو هۆكـاران دهێـتە لێكـدان، یـێ ئێكـێ: هۆكارێ فیـزیكیە وەكـو ژ رەوشـت و تیتـالێ مللەتـێ كـورد و دۆژمنكارییـا وان بـۆ

هەڤـدوو و نە دئیکگرتـی و نە تفـاقی و ناکوکییـا سـەرکردەیێن کـورد و کەس ل بەر کەسێ نادانین و رازیبوون ب دویڤەلانکیا دۆژمنان ژبـۆ پاراسـتنا بەرژەوەنـدیێن خـۆ یین کەسی، ئەڤە هەمی دبنە هۆکار کو مللەتێ کورد نەگەهیتە مافێن خۆ.

هۆکارێ دوویێ: هۆکارێ میتافیزیکی. ئەڤ هۆکارە گرێـدای حەزا خـوداییە. هەژی ئاماژەکرنێیە کو هەمی ئەو کەسێن بەحسا ئەنجامێ نەگەهشتنا مللەتێ کورد ب ئارامانجیێن خۆ کرین، واتە بووچی مللەتێ کورد نەبوویە خـوەدی دەولەت و مـافێن خۆ یێن رەوا ب دەستخوڤە نەهینایـن، زێدەتر ل سەر هۆکارێن فیزیکـی راوەسـتاینە و بەحس لێ کرینە و هوکارێ میتافیزیکی ل پشتگوە خستینە، هەر چەندە ئەڤ هۆکارە دەربڕینێ ژ جەبریيەتا خانی وەکو مرۆڤ دکەت، ئەڤ چەندەژی ب ئەرکێ خۆ رەد و نەفییا هەمی هوکارێن دیترێن فیزیکی دکەت و ئەنجامەکێ پێچەوانە دەردئێخیـت، چونکی هەمی هۆکارێن فیزیکی دکەڤنە ل ژێر کاریگەرییـا هۆکـارێ میتـافیزیکی و دبنە ئەنجام بۆ ڤی هوکاری و هزرا سەرەکییا ئەڤی تێکستی پێکـدهینن، ئەڤجـا مـادەم خانی مرۆڤەکێ موسلمانە و وەکو ((بنەڕەتێکـی ئـاینی: هەمـوو شـتەکان ئافەریـدەی خودان، هەڵسووڕاوی خواستی ئەون، ملکەچی حیکمەتی ئەون، ئەوەی خودا بیەوێ دەبێـت ئەگەرچـی ویسـتی خەڵکـیش نەبێـت، ئەوەیشـی خـودا نەیەوێـت نابێـت ئەگەرچی ویستی خەڵکیش بێت. بۆیە (خانی)ش هەر لەو ڕاستییەوە بۆچوونی خۆی سەبارەت بە پێوەندیی نێوان خودا و مـرۆڤ: لە سـەر ئەو بنـاغەیە دادەمەزرێنیـت کە کاروبارەکـان هەموویـان بـۆ خـودا دەگـەڕێنەوە و مـرۆڤ لەو کارەیـدا کە دەیکـات سەرپشك و بەرپرسیار نییە و... هەموو ئەو کـارانەش لە ئەزەلەوە بە زانـین و خواسـتی خودا پێشبین کراون)) (محمد: ٢٠٠٨، گ ٣٧) واتە ل ئەڤێرێ ملکەچیـوون بـۆ حەزا خـودایی د ئەنجـامێ داوییێـدا گونجـان و تەبـایی د نـاڤبەرا هەردوو جەمسـەراندا دروستدبیت.

مرۆڤ = خودا

بەلـێ ئەگەر نەڕازیبـوون و یـاخیبوونەك ل سـەر هۆکـارێ میتـافیزیکی هـاتە ئەنجامــدان، هنگــێ وەك لێکــدان و کارڤەدانەکـا ڤەشــارتی ژ لایــێ هۆزانڤــانیڤە

نەڕازیبوونەك ل هەمبەر وێ ملکەچیبوونێ خویا دبیت، واتە نەڕازیبوونەك ل هەمبەر ئەنجامێ داویێ پەیدادبیت، ب تایبەت دەما دبێژیت: (تاوان چییە شاعیر و فەقیران)، ل ڤێرێ نەتەباییەك د ناڤبەرا هەردوو جەمسەراندا دروست دبیت و هەڤدوو ناگرن.

| هۆزانڤان = خودا |
| --- |

بەلێ ب بۆچوونا (خانی) ب رێکا گۆهورینا هۆکارێن فیزیکی دەرئەنجام هۆکارێ میتافیزیکی دهێتە گۆهورین، ئانکو هۆکارێن فیزیکیژی دشێن چارەنڤیسێ قەدەرێ بگۆهورن وەکو بەردوامیدان ب پەیوەندیێن سیمانتیکیێن ئەڤی تێکستی و پەسەندکرنا گونجانا تێکستی د نموونەیەکا دی یا هەمان تێکستدا ب تایبەتی دەما بەحسا پەیوەندییا هەڤگرتنا تێکستی ب وەرگریڤە دهێتەکرن، ئەڤ چەند باش خویادبیت.

پەیوەندییا هەڤگرتنا تێکستێ ب وەرگریڤە: د ئەڤێ پەیوەندییێدا ((رولێ وەرگری یێ سەرەکییە د کریارا راڤەکرنێدا و کێمتر نینە ژیێ بەرهەمهێنەری، چونکی ل دەڤ وی واتا دروست دبیت)) (بحيري: ٢٠٠٤، ص ٤٠).

ل دویڤ بۆچوونا زۆربەی تیورێن رەخنەییێن تازە (هەر ئەوە واتا و دەلالەتان دبەخشیت ل پشتی خواندنا وی بۆ تێکستی و رەگەزێن وی پێکڤە گرێددەت، د چارچووڤێ هندەك پەیوەندیێن دانوستاندکار و راڤەییدا، ئەوێن ل دەرڤەی تێکستی و هەروەسان ڤەدوزینا دەلالاتان د هەردوو کریارێن هەلوەشێنکار و بیناکاردا. ب ڤێ چەندێ ئەو نامینیت ب تنێ وەرگر، ئانکو نامینیت کەسێ نێگەتیڤێ بێ دەستهەلات بەلکو وەرگر بوویە کەسەکێ بکار د ڤێ کریارێدا، ب ئەڤێ چەندێ پەیوەندییا تێکستێ ب وەرگریڤە بەرەڤ دوو ئاراستەییێن پێچەوانە دچیت، ئانکو ژ تێکستی بەرەڤ خواندەڤانی و ژ خواندەڤانی بەرەڤ تێکستی دچیت، داکو خواندەڤان ببیتە نڤیسەر و بەژداری تێکستی بیت، نە ب تنێ ببیتە بکارهێنەر و ڤەبینەرێ تێکستی، بەلکو واتا و گرنگی و بهایێ وی دەستنیشان بکەت) (هـ . ژ، ص١٧٧).

زمان هەر چ جۆرێ بیت، واتایا وی و بنیاتێ وی ژ دەرئەنجامێ کارلێکرنێ د ناڤبەرا تێکستی و خواندەڤانیدا دەرئەنجام دبیت، ئەوژی مادەم راڤەکرن تێکستێ بەرهەم دهێنیت، ئەڤجا ئەو نە ب تنێ سیماییَن بابەتێین تێکستی ب خۆڤە دگریت، بەلکو هندەك سیمایان ب خۆڤە دگریت کو ئەو سیما بۆ راڤەکەری، ئانکو خواندەڤانی ب ئاوایەکێ کارلێکەر ل سەر تێکستی، یان رێرەوێ ڤەدگەڕن، ئەڤجا ئارمانج ژ خواندنێ نە ب تنێ تێگەهشتنا پەیڤێن بکارهاتیە، بەلکو بەشداریکرنە د ئالوگۆڕکرنا هزرێن نویدا د ئەوی بابەتێ هاتیە خواندندا، ب ئەوێ بۆچوونێ کو تێکست چالاکییەکە دانەری و خواندەڤانی ب خۆڤە دگریت (قواوة: ٢٠١٢، ص٦٧).

ل ڤێرێ هندەك رەگەز پەیدادبن، واتە (ئەو رەگەزێن هەڤپشك، یان ڤەهینوك ئەوێن بابەتی بەرێکڤە دهێن و رەنگڤەدانا هەستێن دانەری دکەن و کارتێکرنێ ل دەروونێ خواندەڤانی دکەن، ئەڤ رەگەزێن هەڤپشك بریتینە ژ (زمان، هەست، سۆز، وێنە)، بێگومان دەمێ ئەڤ رەگەزە ل گەل هەڤدوو دگونجن کارتێکرنێ ل دەروونێ خواندەڤانان دکەن) (الخليل: ٢٠٠٩، ص٩).

ئەڤجا ژبەر هندێ پێدڤیە (خواندەڤان پالپشتیێ ل سەر بنیاتەکێ موکومێ رەوشەنبیریا گشتی و پسپور بکەت و یێ ئاگەهداری لایەنێین ئەوی تێکستی بیت، ئەوێ هەولدەدەت شرۆڤە بکەت، چونکی یا پێدڤیە خواندەڤان ب خۆ خودانێ چێژەکا ئیستاتیکی و لێڤگەرێ رەوشەنبیریەکا بەرفرەهـ بیت) (قواوة: ٢٠١٢، ص٦٨). هەتا بشێت هندەك لێکدانەڤەیێن جوان ڤەبینیت.

هەروەسان رەخنەگرێ ئەلمانی (یوس واینەر - Yoss Woayner) داکوکیێ ل سەر وەرگری دکەت، ژبەر گرنگیا وی د ڤەکولینێن ئەدەبیدا، (ئەڤ گرنگیە بۆ وێ بەردەوامیێ ڤەدگەریت، ئەوا ئەو ددەتە بەرهەمێن ئەدەبێ، ئەوژی ب رێکا ئالوگۆڕکرنا کومەکا بهایێن ئیستاتیکی کو پێکڤە بابەتەکێ ئیستاتیکی ئاڤا دکەن و سالوخەتەکێ نموونەیی وەردگریت و وەرگرتنا د ناڤبەرا خودا ئالوگۆڕدکەن و ب ئێك کاریگەر دبن، ئەوژی ب رێکا زنجیرەیەك ژ دەمێ ل دویڤ ئێکداهاتی، هەتا ل داویێ بهایێ خۆ ژ دەست ددەت کو ئیدی نەشێت بەرسڤ و چارەیا ئاریشێن

سەردەمێ خۆ بکەت، هینگێ دێ هێتە لادان و بەرەڤ نموونەیەکا دی یا نوی چیت کو جهێ وێ نموونەیا کەڤن بگریت (سمیر: ٢٠٠٥، ص٢١).

رۆلێ گونجانێ د ئێککگرتنا تێکستیدا هەر دیسان ل سەر ئاستێ زمانی دروست دبیت، لەورا (سوسێر)ی د ڤەکولینێن خۆدا تەکەس ل سەر زمانی کر، وەکو سیستەمەك ژ هێمایان کو دەربڕینێ ژ هزر و بیرا دکەت و هێما ب خۆژی هژمارت کیانەك ژ دال ومەدلولی پێکدهێت، دال دکەڤیتە بەرامبەری هەستێ و مەدلول دکەڤیتە بەرامبەری هزرێ و پشتی هنگێ هەردوو د مێشکێ مروڤیدا ل سەر بنەمایێ گونجانێ هەڤدگرن. ئەڤجا د بوارێ ئەدەبیدا سیمیۆتیکا وەکو زانستێ هێمایان ب رۆلێ خۆ وەسان دهێتە نیاسین جۆرەك ژ پێکداچوون و ب ناڤێکدا چوونێ ل ناڤ بۆچوون و تیور و رێبازێن جۆراوجۆردا کو هەر ئەڤەیە وێنەیێ وێ ل دەڤ هندەك ڤەکولەران مژدار دکەت. بەلێ د رەخنا سیمیوتیکیدا پالپشتی ل سەر ڤێکڕاگەهشتنا هەردوو روویێن پێکهێنان و تەڤاهیێ، یان جوداهیێ دکەت، واتە گونجان د ناڤ زمانێ شیعرێدا دهێتە دروستکرن بۆ شرۆڤەکرنا هەر تێکستەکێ ئەدەبی (صالح: ٢٠١٢، ل١٩٧-١٩٨).

نموونە ل سەر ئەڤێ چەندێ دێ ڤێ نموونێ وەرگرین.

ئەز مامە د حکمەتا خودێدا — کرمانج د دەولەتا دنێدا

ئایە ب چ وەجهێ مانە مەحروم — بلجوملە ژ بو چ بوونە مەحکوم

(خانی: ١٩٩٠، ل٥١)

شرۆڤەیا وێ ب ڤی رەنگییە: ئەز ل حکمەت و پێزانینا خودای ڤەمام و تێنەگەهشتم، گەلو ژبەر چ ئەگەرەکی گەلێ کورد ل سەر روویێ ئەردی و د ناڤا ژیانا مرۆڤاندا بێ بار و بێ پشك بوون ژ مافێن خۆ و بووچی هەمی پێکڤە مەحکوم و بندەست بوون د دەولەتا دونیایێدا، واتە هەمی سەروەت و سامان و نعمەتێن ڤێ جیهانێ ژ هەمی مرۆڤانرا هاتییە بەخشین و هەر کەسەکی دەولەت و حوکومڕانییا خۆ هەیە، بەلێ ب تنێ مللەتێ کورد ژ ڤێ چەندێ بێ بار بووینە.

ل ڤێرێ پێدڤیە تێبینیا دوو پەیڤێن کۆدێن بونیاتێ تێکستی د ڤێ نموونێدا بکەین، ئەوژی (ئەز مامە) و ئامرازێ پرسیارێ (ئایا)، ل دویڤ ئاستێن یەکەیێن

ئاخاڤتنێ د ڤێ نموونێدا، واتە ئاستێ گوتنا ئاخاڤتنێ و ئاستێ هێزا نەگوتنا ئاخاڤتنێ، دوو جۆرێن پەیوەندییان د ناڤبەرا واندا دروست دبن، پەیوەندییا ئێکێ گونجان ل سەر ئاستێ گوتنێ و پەیوەندییا دوویێ هەڤدژییە ل سەر ئاستێ هێزا نەگوتنێ، واتە هێزا نەگوتنا ئاخاڤتنێ.

د پەیوەندییا ئێکێدا ئەگەر د چارچوڤێ رێڕەوێ گشتیێ تێکستیدا بچینە د ناڤ ئەڤێ کیلگەیا سیمانتیکیدا، واتە دەستەواژەیا (ئەز مامە) ئانکو سەرسوڕمانە ژ نەشیانا لێکدانەڤەیا رەفتارەکێ دگەهیت. هەروەسان نیشان پرسیارێ (ئایا) کو سەر ب هەمان کێلگەیا واتاینە د هەمان ڕێڕەوێ ئەوی تێکستیدا و هەر ژبەر ئەوی ئەگەرێ ل پێشیێ هاتیە دیارکرن دەما خانی گوتی: (ئەمما ژ ئەزەل خودێ وسا کر) پەیوەندییا گونجانێ د ناڤبەرا یەکەیێن سیمانتیکیێن هەردوو گوتناندا واتە (ئەمما ژ ئەزەل خودێ وسا کر، ئەڤ رۆم و عەجەم ل سەرمە راکر) = (ئەز مامە د حکمەتا خودێدا کرمانج د دەولەتا دنێدا، ئایا ب چ وەجهی مانە مەحروم بلجوملە ژبۆ چ بونە مەحکوم)، واتە ئەڤ هەردوو دەستەواژەیە یەکسانن و هەڤ دگرن، ئانکو ژ سنۆرێ یەکەیا ئاخاڤتنا گوتی یا تێکستی ئەڤە سەرسوڕمانە ژ حکمەتا خودا و بۆ نەزانینا نهێنییێن وێ حکمەتا خودایی ڤەدگەڕیت.

بەلێ دەمێ ئەم دهێینە ل سەر پەیوەندییا هەڤدژ د هەمان نموونێدا، واتە وەکو بەحس ل هێزا نەگوتنا ئاخڤتنا تێکستی دکەین کو مەبەست ژێ رێڕەوەکێ جودایە ژ ڕێڕەوێ گشتی یێ ئەڤ تێکستە بەرهەمهینای، وەکو هەمان بۆچوونا (د. محمد بکری) دیارکری دەما دبێژیت: ((ئەگەر ڕێڕەوی دەقی دووەم هەر ئەو ڕێڕەو بێت تێڕامان و پرسیاری (ئایا ب چ وەجهی) دەبێتە پرسیارێکی بێ واتا، لە بەر ئەوە شاعیر، زۆر بە باشی درکی بە هۆکارە فیزیکی و میتافیزیکییەکانی ژێردەستیی کرمانج کردووە، ئیتر دەبێت ئەگەری ئاراستەکردنی پرسیاری لە بارەی (وەجهی) ئەو ژێردەستییە و (حکمەتا خودێ) وە چیبێت)) (محمد: ٢٠٠٨، ل٣٩-٤٠).

بەلێ رەنگە بەرسڤەك ل دویڤ هۆکارێن فیزیکی د ڤان مالکێن هۆزانێدا دیاربیت و دبینن خانی زنجیرەیەکا دەستەواژان ب ستایش و تایبەتمەندیێن هەرە بەرز وەکو سیما و سالوخەتێن کرمانجان خویا دکەت دەما ل جهەکێ دی دبێژیت:

وان گرت ب شیری شەهر شوهرەت    تـەسخیر کـرن بلا د هـــــــمەت
هەر مـــیرەکێ وان ب بەزلی حاتم    هەر مێرەکێ وان ب رەزمی روستەم
(خانی: ١٩٩٠، ل ٥١-٥٢)

د بوارێ لێکدانەڤەیا هەمـان بۆچوونێـدا (د. محمـد بکـر) دبێژیـت: ((ئیسـتا لە بواری دەقی دووەمدا و بەهۆی بەربوونەوەی پلەی هەڵچوونی هەسـتی شـاعیرەوە، لە ئاستی پەیوەندییەکی هاودژداین لە نێوان ڕێڕەوێکی پۆزەتیڤ و یەکەیەکی ئاخاوتنی نێگەتیڤـدا، ڕێڕەوێـك کە پـلەی هەڵچـوونەکەی لەوپەڕی گەرمیـدایە و یەکەی ئاخـاوتنەکەی ئەوپەڕی ملکەچـی و تەسـلیمبوون دەنوێنێـت، ڕێڕەوێـك هێـزە نەگوتراوەکەی داکۆکیکردن و بەگژداچوونە لەوەیدا کە میللەتێك خاوەنی ئەو هەموو سیفاتانە بێت، چۆن ڕەوایە (مەحکوم) و (مەحروم) بێت؟

کاتێك خانی لەم ڕێڕەوەوە هەوڵدەدات پرسیارەکەی ئاراستە بکات، مەبەسـتی وەڵام وەرگـرتنەوە نیـیە، بەڵکـو دەیەوێـت لە ڕێـگەی ئەو تـرازانە دەروونیـیە، یەکەی ئاخـاوتن لە سـنووری واتـا فەرهەنگییەکـان بترازێنێـت و لەگەڵ سـۆز و هەڵچـوونە مرۆڤاتییەکـان کرمـانجێکی سـتەملێکراودا ئـاوێتە بکـات، بـا ئەو سـتەمە خواسـتی خـوداییش بێـت، ئەو دەربڕینـی نـاڕەزایـی و ڕەتکـردنەوەی دۆخەکەیە، ئەگەرچـی هۆکـارەکەش حیکمەتـی خـودایی بێـت، هەر ئەم تـرازانە دەروونییەشـە کە دەبێـتە هۆکاری ترازاندنی پرسیارەکە، لە خواستنی وەڵامەوە بۆ چەند مەبەستێکی تری وەکو، ئەرێنی و نکووڵیکردن و ڕەتکردنەوە... هتد، ئەم مەبەستەش لە ڕەوانبێژیی کلاسیکیدا بە وردی چارەسەر کراوە. بەو شێوەیە، دێڕەکان لە ڕووی شێواز و سۆزی دەربڕینەوە، بەرزترین پلەی ئاوازەیی وەردەگرن:

ئەز مامە د حکمەتا خودێدا /↖/    کرمانج د دەولەتا دنێدا /↖/
ئایا ب چ وەجهی مانە مەحروم /↘/ بیلجوملە ژ بو چ بونە مەحکوم/↘/

خانی کاتێ ئەو دژە هەڵوێستە دەنوێنێـت، ئنیجـا راسـت بێـت یـان هەڵە ئەو لە بەرانبەریدا بەرپرسیارە)) (محمد: ٢٠٠٨، ل ٤٠-٤١).

بێگومان کەس ژ گونەهـ و خەلەتییان یێ بێ بـار و پاراسـتی نینە، هەروەکـی د وێ دانوستاندنا ل داویا تێکستێ مەم و زینێدا، ئەحمەدێ خانی ل گەل خامەی کری

و ئاماژە پێدای کو ئەگەر مروڤەکێ خرابکار نەبیت دێ چاوان ئەڤان شاشی و سەرپێچییان کەت، ئەڤجا ل ڤێرێ ئایە پەیاما خانی چ ژ ڤان هەردوویان بوویە، لێکدانەڤە ل دویڤ هێزا گوتنا ئاخاڤتنێ یان هێزا نەگوتنا ئاخاڤتنێ، واتە مەبەستا وی نەزانین و نەتێگەهشتنا حکمەتا خودایی بوو، یان نەڕازیبوون و یاخیبوون ل سەر وێ حکمەتێ بوو، ئەگەر نەزانین بیت، مە چ بەرسڤ ل سەر نینە و ئەگەر نەڕازیبوون و یاخیبوون بیت، بەرسڤ ل دوایێ ئەوی ب خۆ گوتیە ئەڤە کارخرابییە کو ئەڤەژی دبیت ئێك ژ رێ لادانێن سوفیگەران بهێتە هژمارتن ، ئانکو شەتەحاتێن سوفییان.

هەڤتێکستی: هەڤتێکستی ژ بنیات و ئالاڤێن لێك نێزیکبوونێن رەخنەیە، واتە ((ئاڤاکرنا تێکستەکێ نویە ژ تێکستێن بەرێ کو خواندەڤان نەشێت یێ رەسەن ڤەدوزیت تنێ ب رێکا چوونە ناڤا پەیوەندیێن ئەڤی تێکستی ل گەل تێکستێن بەراهیێ نەبیت، تێکست د ئەڤێ پەیوەندییێدا کارلێکرنەکێ ل گەل دەمێ بووری و نهو و ئایندەیدا دکەت و هەروەسان کارلێکرنا وێ ل گەل خواندەڤانی و تێکستێن دیتر دکەت (موسی: ٢٠١٥، ص٣٣).

ل دور ئەڤێ چەندێ (جولیا کرستڤان - Julia Kristeva) ئاماژە ب وێ رێکێ ددەت، یاکو تێکست ژ گوتارا بەری هینگێ هەی دروست دبیت، دەما دبێژیت: ((نڤیسەر تێکستێن خۆ ژ مێشکێ خۆ یێ داهێنەر نا ئاڤرینن، بەلکو ئەو ب کومکرنا هندەك تێکستێن ل بەراهیێ هەین رادبن، ئانکو تێکستێ وان راستڤەکرنەکە بۆ هندەك تێکستێن دیتر، واتە هەڤتێکستی دکەشەیێ تێکستەك یان چەند تێکستێن دەستنیشانکریدا پەیدا دبیت)) (الان: ٢٠١١، ص٥٥).

ئەڤجا هوسان ل هەڤدەقیێ دهێتە نێرین کو (هەر ب تنێ ئێخستنا کەلتوورییە د تێکستیدا، یان پێچەوانە ئێخستنا تێکستیە د کەلتووریدا ل میانێ بەرسڤدان و دانوستاندن ودووبارە درکاندنێ، ب رێکا ئاگەهی و هوشیاریا کەلتووری د ئەوی تەڤنێ نویدا یێ کو نڤێسەر پێ دگەهیتە بەرهەمهینانا هندەك بنیاتێن نوی ل ڤێرێ تێکست دبێتە تابلویەکێ خەملاندی و پرشنگدار ژ وەرگرتنان، یان تێکستێ نوی ل سەر وەرگرتن و گۆهورینا هندەك تێکستێن دیێن ل پێشی، یان هەڤدەمی خۆ ئاڤا دبیت، لەورا زۆر یا سەختە واتا، یان دەلالەتێن تێکستی ڤەبڕی زانینا کویراتیا بنیاتێ ل

سـەر ئاڤـابووی هەر ب رێکـا هەمـان وان تێکسـتێن بنـاڤ تەڤنـێ وێـدا چـووین دەستنیشان بکەین، ئەڤجا تێکست بنیاتەکێ داختی پێك ناهینیـت، بەلکـو هەر وی بنیاتی د هندەك تێکستێن دیتردا بکاردهینیت و چالاك دکەت، ل سـەر بنەمـایێ کـو هەر تێکستەك ڤەگوهـازتنەکە ژ گەلەك تێکسـتێن دی) (محمـد: ٢٠٠٧، ص٧٥). واتە هەڤتێکستی ئەوە کو تێکستەك ژ تێکستەکێ بەری خۆ بهێتە وەرگرتن. نموونە ل سەر ئەڤێ چەندێ.

بۆ نموونە:

شـــیرێ هونەرا مە بێتە دانین قەدرێ قەلەما مە بێتە زانین

(خانی: ١٩٩٠، ل٤٩)

د ئەڤێ نموونەیێدا راستڤەکرنەك ژ لایێ (پەرویز جیهـانی) د پەرتووکـا (مەم و زیـن راڤە و شرۆڤەیەك نـوو)دا هـاتیە کـرن کـو ئەڤ نمـوونە ب ڤـی رەنگـی هـاتیە راستڤەکرن و شرۆڤەکرن، ئانکو ئەڤ نمـوونەیە ب ڤـی رەنگـی هەڤـبەر کـریە، دەمـا دبێژیـت: ((ل گشـتی دەسـتنڤیس و ژێـدەرێن ل بەر دەسـتێ مـن دا ل جیهـێ پەیڤـا (شووری)، (شیرێ) هاتیە، لێ من هەرچەند بیر لێ کر، من بەرا خو دایێ کـو "شـیرێ هونەرا مە بێتە دانین" ل زمانێ کوردیدا چ واتایێ نادە، ئەم دزانـین کـو شـیر، رابێـژەك دییە ژ شووری، ل زاراڤێ کرمانجیدا ل ناڤ دەڤۆکێن جوربە جوردا پیتـێن "ئـوو U" و "ئی I" و "وی wi" جهێنێ هەڤـدوو دگـرن، هەر ئەڤ پەیڤـا شـوور یـان شـیر دانـان ل زمانێ کوردیدا واتە شوور دانانە ئەردی و ژ چەك بوون، خو بـێ چەك کـرن، تەسـلیم بوون راستی ما خانی داخوازا ژ چەکبوون و تەسلیمبوونێ کرییە. ئەز گەلەك ل واتایـا ڤێ نیڤمالکێ گەڕیام، لێ من چ بەرسڤ ژێ راپەیدا نەکـر، داکـو مـن چـاڤەك ل وێ مەم و زینا کو مـن ل سـالا ١٩٨٩ ل ئـورمی یێـدا وەشـاندبوو خشـاند، ل وێ چاپێـدا جیهێ شیرێ، شوورێ هاتیە دیسان واتە هەریەکە، ڤێجا ئەز ل واتەیا شوورێ گەڕیام. ما کورد ژ حەسار و دیوارێن بلند دکەلایان را شوورە نابێژن، تازە من زانی کو مەبەستا خانی ژ ڤێ پەیڤێ چییە، ل تۆرەیا فارسیدا ب دەهان جاری هۆزانان شوونەوارێن خـو شوبهاندنە کەلا و حەسار و کوشکێن بلند، بۆ نموونە فردەوسی دبێژە:

پێ افکندم از نظم کاخی بلند
که از باد و باران نیابد گـزند

واتە: من خیمێ کۆشکەك وەسان لند ژ هەلبەستان دانی، کو ژ با و بارانێ زەدەیێ نەبینە. سەعدی یێ شیرازی ژی پرتووکا خوە وەکاندییە کاخێ دەولەت واتە کۆشکا هەبوون و سەرفەرازی یێ. خانی ژی خوازییان داخوازە، کو پادشاهەك ژمە کوردان رابە، داکو ل سایا ویدا خیمێ حەسارا هونەرا مە بێتە دانینێ و قەدەرێ قەلەما مە بێتە زانینێ. ب ڤێ جورەیی ژمەڕا رۆن و ئەشکەرا دبە کو لێرەدا خانی شوور نڤیسییە، ل دوورا روو نڤیسکاران وەکی دەهان پەیڤێن دی دەست تێ وەردانە و ئەو گۆرکی دەڤۆکا خو گوهۆڕینە و کرنە شیر)) (جیهانی: ٢٠٠٧، ل١٩٥-١٩٦). ل ڤێرێ ئەڤە ژ لایێ پەروێز جیهانی ئاماژەیەکە کو خانی تێکستێ خو ژ تێکستێ فارسی یێ فردەوسی و سەعدیێ شیرازی وەرگرتیە. ئانکو ل پشتی ئاشنابوون ب واتایا دروست ئەوا ب رێکا ڤەدویتنا هەڤتێکستیێ ب دەستڤە دهێت، ل وی دەمی دەلالەتا راست و دروست ب دەستڤە دهێت و تێکستی ژ هەر دابڕان و ڤالاهیەکێ دپارێزیت و پەیوەندیێن سیمانتیکی و واتایێن تێکستی بۆ خواندەڤانی پتر خۆیا دبن و گونجانا تێکستی پتر دیاردبیت.

**سێ: پەیوەندیێن سیمانتیکی د ناڤبەرا بەشێن تێکستیدا:**

ژ ئەوان خالێن هەرە گرنگ و پەیوەندی ب ڤەکولینێن سیمانتیکڤە هەی، ئەوێن ب شێوەیەکێ رەها دەربڕین ژێ دهێتە کرن، (پەیوەندیێن سیمانتیکیێن پەیڤانە د ناڤ تێکستیدا، یان وەرارا زمانینە، چونکی هندەك دەلالەتێن جۆراوجۆر ب رێکا ڤان پەیوەندیێن سیمانتیکی بەرهەم دهێن) (لوشن: ٢٠٠٦، ص١٠٥).

گەلەك داکوکی ل سەر ئاستێن سیمانتیکی د زمانڤانیا تێکستیدا دهێتەکرن، (ب تایبەتی پەیوەندیێن سیمانتیکی ئەوێن د بەشدار ل ب دەستڤەهینانا تەڤگرتنا تێکستیدا، ئەوژی هندەك پەیوەندینە کو هیچ تێکستەك ژێ ڤالانابیت، بتایبەتی ئەوێن مەرجێ راگەهاندن و روونیێ تێدابیت، ب ئارمانجا ب دەستڤە هینانا پلەیەکا دەستنیشانکری ژ گەهاندنێ، ئەوژی ب رێکا ئاڤاکرنا ئەوێ ل دویڤدا هاتی ل سەر یێ ل بەراهیا وی، ئەڤ پەیوەندییە کاردکەت بۆ رێکخستنا رویدانان و کار و ئەرکان

د نـاڤ پێکهاتەیـا ڤـی تێکسـتیدا. ئەڤجـا هەمـی بەشـێن وێ کـوم دکەت و پـێکڤە گرێـددەت، بیـێ هنـدەك هۆکـارێن رووکەشـی و سەرڤەسـەرڤە ب ڤـێ چەنـدێ ئەو پالپشتیێ ل سەر تێکستی دکەت، وەکو یەکەیەکا تەڤگر و گونجای ل ژێر ریزبەنـدی و رێکخستنەکا دەستنیشانکری کو وەلێدکەت یێ گونجای و تەڤگر بیت، لەورا بۆ ب دەستڤە هینانـا ئەڤـێ چەنـدێ پێـدڤیە هنـدەك پەیوەنـدی هەبـن، دەربـازی هەڤگرتنـا رووکەشی ببن و بەرەڤ هندەك رەهندێن دویرتر و کویرتر بچن) (قواوة: ٢٠١٢، ص٧٧-٧٨).

ژ وان پەیوەندییان:

١. گشـتگیری و درێژەپێـدان –الاجـمال و التفصـیل: ئەڤ پەیوەنـدییە ب گرنگترین پەیوەندیێن سیمانتیکیێن دهێتە هژمارتن کو زانستێ تێکستی تەکەسێ ل سەر دکەت، چونکی پەیوەندییا پارچێن تێکسـتی ب هەڤـدوڤە مسـوگەر دکەت، ب رێکا ئەوێ چەندێ، یا کو ئەڤ پەیوەندییە بەردەوامییا سیمانتیکی د نـاڤبەرا پـارچێن تێکسـتیدا ب هەڤـدوو دبەخشـت، ل ڤێـرە هەژی ئامـاژەکرنێیە کـو ئەڤ پەیوەنـدییە هەمی گاڤا د کەشەیێ تێکستیدا ب ئێك ئاراستە ناچیت، یان ئێك ئاراستە نـاگریتە ل بەر خۆ، بەلکو ئەو هندەك جاران بەرەڤ دوو ئاراستەیێن پـێچەوانە دچیـت، وەکـو د ڤی نەخشەیەدا دیارە:




ئەڤ پەیـوەنـدییا دوو ئاراسـتەیی تێکسـتی ژ ئێـك ئاراسـتەیێ رێـك بەرەڤ ئاراستەیەکێ پـێچەوانە دبەت، واتە ئەڤ پەیوەنـدییە هەردەم ئاراسـتەیێ گشـتگیریێ بەرەڤ درێژەپێدانێ پەیڕەو ناکەت، بەلکو هنـدەك جـاران د ئاراسـتەیدا درێژەپێـدان دهێتە ل بەراهیا گشتگیریێ (هـ. ژ، ص٧٨).

هەر ل سەر ئەڤێ بوچوونێ وەکو ل دەمێ (ئبن عاشور) بۆ دچیت و دبێژیـت: ((گشتگیری ل پشتی درێژە پێدانێ کاریگەرییەکـا ب هێـز ل دەروونـێ گوهـداری د کەت، ئەو ب ئەڤێ رێکخستنێ بەربەلاڤبوونە و ب پێچەوانەی یـێ ئێکێـیە ئەوێ ب پیڤەری دهێتە هژمارتن)) (هـ. ژ، ص٧٨).

د ئەڤێ نموونێدا درێژەپێدان بەرەڤ گشتگیریێ هاتیە ئاراستەکرن، ژبەر ئەوێ چەندێ کو دا ئەڤ پەیامە ل سەر وەرگری یا کاریگەرتر بیت.

بۆ نموونە:

ساقی تو ژ بـو خـودێ کەرەمکـە     یەك جرعەتێ مەیێ دجام جەمکە
دا جام ب مەیێ جهـان نومابـت     هەر چ مـە ئرادەیـە خــویا بت
دا کەشف ببن ل بەر مە ئەحـوال     کانــی دبتـن میە ســەر ئقبـال
ئەدبارێ مە وێ گەهـا کەمالـێ     ئایــە بـووە قابلــی زەوالــێ
یا هـەر وەهــە دێ ل ئستـوابـت     حـەتتـا وەکــو دور منتەهابــت
قەط مومکنە ئەڤ ژ چەرخ لەولەب     طـالع ببتـن ژ بومــە کەوکـەب
بەختێ مە ژ بو مەرا بیــت یــار     جارەك ببتــن ژ خــواب هشیـار

(خانی: ١٩٩٠، ل٤٨-٤٩)

شرۆڤە: مەیگێڕ بۆ خاترا خودێ و ژ کەرەم و دلوڤانیا خۆ ئێك قورچا مەیێ بەردە پەرداغی و کومکە سەر ئێك دا ئەو پەرداغ وەك جاما جەمێ لێ بهێت و جیهانێ بۆ مە ئاشکرابکەت و هەر چ مە بڤێت و دخوازین د وێ جامێدا دیاربیت، ئەڤە وەك واتایەکا مەجازییە، بەلێ واتایا وێ یا حەقیقی (ئەی خودا ڤیانێ بەردە دلێن مە، داکو دلێن مە ب رێکا ئەڤین و ڤینداریا تە پاقژبیت و هەر چ یا مە بڤێت و دخوازین بۆ مە بهێتە دیتن). داکو رەوش و دوخێن نەدیار ل بەرمە روون و ئاشکەرا و دیاربن و بزانین ئایە بەختێ مە ل پاشەڕۆژێ دێ ل مە خوش هێت، بەلەنگازی و بەدبەختیا مە یا گەهشتیە ئاستێ خۆ یێ هەرە بلند و تەکوزبووی، ئایە بەلەنگازی و بەدبەختیا مە بوویە هەژی نەمانێ و بدوماهیهاتنێ، یانژی هەما هەرە هوسان هەتا دووماهیا ژیانێ دێ ل سەر ئەڤی دوخی و ئەڤێ رەوشێ مینیت، گەلو دبیت ژ گەر و چەرخا فەلەکێ ستێرا بەختێ مەژی سەرهەلبدەت و بەختێ مە ل مە خوش بهێت و جارەکێ ژ خەو هشیار بیت و رزگارکەرەك ژ ناڤمە رابیت و پادشاهەك ل مە پەیدابیت.

ئەڤ هەمی درێژەپێدانە هاتیە دراشتن، هەتاکو ل دوماهیێ خانی د پەیاما خودا ڤیایە د ڤێ رستێدا ب ئاوایەکێ گشتگیر بێژیتە مە: هینگێ دێ (شیرێ هونەرا مە هێتە

دانین قەدرێ قەلەما مە هێتە زانین، دەردێ مە بینتن علاجێ علمێ مە بینیتن رەواجێ).
هەر چەندە ل بەری نووکە مە ئاماژە ب وێ چەندێ دایە کو خانی چەند هوکارە بۆ دەردێ مللەتێ کورد دەستنیشان کرینە، بەلێ وەکو بەردەوامیدان بۆ هەبوونا پەیوەندییا سیمانتیکی مە ئاماژە ب ڤێ یەکێ دایە.

پەیوەندییا گشتی و تایبەتی –العموم و الخصوص: ئەم دشێین دیڤچوونا ئەڤێ پەیوەندییا سیمانتیکی هەر ب ناڤونیشانێ هەلبەستێ یان تێکستی دەستپێبکەین، چونکی بەهرا پتر ناڤونیشان ب شێوازەکێ گشتی دەستپێدکەت و د دویڤدا تێکستێ مایی یێ تایبەتمەندە ب ویڤە، ئەڤەژی چونکی هندەك رەگەزێن ناڤەندی ب خۆڤە دگریت و ب کاکلا وی دهێنە هژمارتن کو ب رێکا تێکستی و د ناڤا ویدا گەشە و وەرارێ دکەت، هەتا تەمام دبن، ئەڤە ل دەربارەی تێکستی و ناڤونیشانی، هەروەسان ئەڤ پەیوەندییە د ناڤبەرا پارچێن تێکستیژیدا پەیدادبن، ئەڤجا هندەك دەربڕین ب شێوەیەکێ گشتی دەردکەڤن، هندەك بەشێن تێکستی هەولا تایبەتمەندیکرنا وی دکەن، ئەڤ پەیوەندییە سروشتەکێ بەرهەمهینانێ ددەتە تێکستی و وەلێدکەت کو بەردەوام د کارلێکرنەکا سیمانتیکیا بەرداوامدا ل گەل هەڤدوو بمینن (قواوة: ٢٠١٢، ص٧٩).

د ڤێ نموونا ل خوارێدا ئەڤ پەیوەندییا سیمانتیکی، ئانکو پەیوەندییا گشتی و تایبەتی د ناڤبەرا پارچێن تێکستیدا دیاردبیت دەما کو خانی دبێژیت:

گەردێ هەبوا مە پادشاهەك — لائق بدیا خودێ کولاهەك
تەعیین ببو ژبو وی تەختەك — ظاهر ڤە دبو ژبو مە بەختەك
حاصل ببو ژبو وی تاجەك — ئەلبەتتە دبو مەژی رەواجەك
غەمخواری دکر ل مە یەتیمان — تینانە دەرێ ژدەست لەئیمان

(خانی: ١٩٩٠، ل٤٩)

شرۆڤەیا ئەڤان دێران: ئەگەر مەژی پاشایەك هەبا و خودێ تاجەکێ هەژی وی کربا سەرێ وی و تەختەك بۆ هاتبا دەستنیشانکرن ب شێوەیەکێ دیار و ئاشکەرادا گرێیا بەختێ مەژی ڤەبیت، ئەگەر تاجەك ژ ئەوی شاهیرا پەیدابا، کاروبارێن مەژی

دا رەواجا خۆ هەبن، ئەو دا خەمەکێ ل مە خوت و دا مە ل ژێر دەستێن خرابکاران دەرهینیت.

د ڤێ کوپلا شیعرێدا دوو کود دهێنە دیتن، یێ ئێکێ (مە) و یێ دوویێ (وی)یە. کودێ (مە) جهناڤێ کەسێ جودایە بۆ کەسێ ئێکێ یێ کوم و کودێ دوویێ (وی) جهناڤێ کەسێ جوادیە بۆ کەسێ سێیێ یێ تاك. ل ڤێرێ وەك پەیوەندییەکا دوولایەنی د ناڤبەرا بەش و گشت یان گشت و بەشدا هێمایەکێ سیمانتیکی پەیدادبیت، ئەوژی ب رێکا ئەڤان واتایێن سیمانتیکی کو ئەگەر (وی تەختەك) هەبا دا مەژی (بەختەك) هەبیت، ل ڤێری پەیوەندییەکا سیمانتیکی د ناڤبەرا (وی تەختەك = تایبەتی)دا ل گە (مە بەختەك= گشتی) پەیداکریە، واتە پەیوەندییەکا سیمانتیکیا تایبەتی و گشتی، یان بەش و گشت پەیداکریە د ئەنجامدا گونجانەکا واتایی د ناڤ تێکستیدا پەیداکریە. یان ب پێچەوانە پەیوەندییەکا گشتی و تایبەتی وەك (مە پادشاهەك= گشتی) ل گەل (وی تاجەك= تایبەتی).

**٢. روونی و راڤەیی - البیان والتفسیر: ب رێکا روونکرن و راڤەکرنێ وەرگر دشێت پتر د وان پەیوەندیێن سیمانتیکی ل سەرانسەری تێکستی بگەهیت و دەستنیشان بکەت و لێکبدەت. ب تایبەتی دەما نڤیسەری بڤێت هندەك روونکرنان ل سەر هندەك مەبەستێن خۆ دیاربکەت.**

د تێکستێ (دەردێ مە)دا دەما خانی بەحسێ هۆکارێن نەگەهشتنا مللەتێ کورد ب ئارمانجێن خۆ دکەت، وەك هۆکارەکێ هەرە سەرەکی (نە ئێکگرتن)، یان (نە رێکەڤتنا) مللەتێ کورد دەستنیشان کریە، بەلێ خانی ل دەستنیشانکرنا هۆکاری ب تنێ نەڕاوەستیایە، ئانکو هەولا روونکرن و راڤەکرنا ئەڤی هۆکاریژی کریە کو ئەگەر چییە مللەتێ کورد نەیێ ئێکگرتییە و بۆچی نەگەهشتینە ئارمانجێن خۆ ل سەرەڕای کو د مەرد و مێرخاسن، ژبەر داکو خواندەڤان، یان وەرگر پتر ل سەر ڤی هۆکاری یێ هایداربیت، ئەوێ وی پتر راڤەکرن و روونکرن ل سەر دای، دەما ل چەندین جهان ل دور ڤی هۆکاری ب ڤی رنگی دبێژیت:

بۆ نموونە:

هەر میرەکێ وان ب بەزلی حاتم     هەر مێرەکێ وان ب رەزمێ روستەم

* * *

جوامێری و همەت و سەخاوەت     مێرینـــی و غیـرەت و جـــەلادەت

* * *

هندی ژ شـەجاعەتی غەیـورن     ئـــەو چـــەندە ژ منەتـــی نفـورن
ئەڤ غیرەت و ئەڤ علو هممەت     بـــو مـــانعێ حەملێ بارێ مننـەت
لـــەو پێکڤە هەمیشە بێ تفاقـن     دائـــم ب تـــەمـــەرود و شـقاقـن

(هـ. ژ، ل٥٢-٥٣)

شرۆڤە: هەر میرەکێ کوردان ل بەخشین و هاریکارییا وان بـۆ هەژار و نەدار و بەلەنگازان د بەخشینێدا وەکی (حاتەمـێ تـائیی)نە و هەر مێرەکـێ وانـژی ل مەیـدانا شەڕی وەکی روستەمێ زالن د هێز و شیانانداو دمێر و مێرخاسـن، ئـانکو جـامێری و هێزداری و بەخشینکاری و مێرانی و بـوێری و مێرخاسـی ژ سـالوخەتێن وانـن، بەلـێ هندی ل بەر ئەڤێ مێرانی و دلێریێ ب غیرەت و د دفن بلندن، تەمەتی وێ ژمنەت و خۆشکاندنێ د دویـرن و منەتـا ئێـك و دوو و یـا کەسـێ هەلنـاگرن، ئەڤ غیـرەت و بوێری و سەربلندی و دفن بلندییا وان ناهێلیت ئەو بارێ مننەتێ ژ هەڤدوو هەلگرن و خـۆ ل بەر هەڤـدوو بشـکێنن، ل بەر هنـدێ هەردەم د نەئیککگرتـی و دبـێ تفـاقن و هەردەم ل هەمبەری هەڤدوو دیـاخینە و د لێکڤەبـووینە و دۆژمنکـاری ل نـاڤ وانـدا هەیە.

ل دویڤ ڤێ چەنـدێ ئەڤ پەیوەنـدیێن هەنـێ بەشـدارییەکا ب هێـز ل سـەر هەڤبەندی و گونجانـا تێکسـتی دکەن، ب رێکـا بەردەوامییـا پەیوەنـدییا واتـایی، یـان سیمانتیکی یا هەر بەشەك، یان پارچەیەکا تێکستی ب پارچەیێن دیـێن ل بەری، یـان پشتی وێ پـارچێڤە، ئـانکو ئەڤەیە ئەوا پەیوەنـدییا ناڤەرۆکـا تێکسـتی و گونجانـا وی بەرهەم دهینیت.

**چوار: بنیاتێ گشتیێ گوتارا تێکستی:**

ئەم دشێن بێژین بنیاتێ گشتی ئەوە بنیاتێ سـەرەکی بـۆ تێگەهشـتنا تێکسـتی و گونجانا وی، ژ ئەنجامێ ئەوی کار و ئەرکێ پێ رادبیت، چونکی ئەو وەکـی هنـدەك ڤەکولەرێن تێکسـتی بـۆ دچـن، ئـالاڤەکێ کریـاریە و بنیـاتەکێ سـیمانتیکیە هنـدەك

راگەهاندنێن سیمانتیکی رێکدئێخیت و پولێندکەت، هەروەسان هندەکێن دی دبینن بابەتێ گوتارێ، یان بنیاتێ گشتی یێ گوتارێ ئەوە بنیاتێ ناڤەندی یێ رێکخستی بۆ بەشێ هەرە زور ژ وێ تێکستێ و ئەوە ئەو کێشەیا گەلەك پویتە پێ دهێتەدان.

بابەتێ گوتارێ ب ناڤەندەکا سەرەکی دهێتە هژمارتن کو گوتنێن گوتارێ ل دۆر دزڤرن، ئەوێن کریارا بەردەوامی و درێژەپێدانی ل سەر هەمی تێکستی وەردگریت، چونکی ((درێژە پێدان د بنیاتیدا درێژەپێدانە د واتاییدا)) (مفتاح: ١٩٨٥، ص٧٥).

ئەم دشێن تێگەهێ بابەتی ب رێکا هەستا خۆ یا زمانی دەستنیشان بکەین، هەروەکی شارەزا و ڤەکولەرێن زمانی ئاماژەپێدای کو بابەتێ گوتارێ ب تایبەت د تێکستێ شیعریدا ب رێکا پارچەیێن دانوستاندکار و ئاخاڤتنێ دیاردبیت و هەر پارچەیەك بەشداریێ د هەمی پارچەیاندا و د ئاڤاکرنا بابەتێ گوتارێدا دکەت (موسی: ٢٠١٥، ص٣٣).

بەلێ (ڤان دایك) دبینیت: کو بابەتێ گوتارێ زانیاریێن سیمانتیکی - دەلالی ڤەدکوهێزیت و ب هندەك پێکهاتەیێن ل دویڤ ئێکداهاتیێن تەڤگر رێك دئێخیت، ئانکو کریارا لێگەریان و ڤەدویتنا چرخالا - بۆرە ناڤەندی د بابەتیدا ب رێکا دووبارەکرنا رێکخستنا ناڤەرۆکا گوتارێ کو ل ڤێرێ مەبەست ب بابەتێ گوتارێ هەر هەمان بنیاتێ سیمانتیکیێ کومەکا ل دویڤ ئێکداهاتیانە ب هەڤکاری ل گەل هەڤدوو کو دبیت درێژاهیێ پێ بدەن، یان دبیت کورت ڤەبرن ل دویڤ پێدڤیا گوتارێ ئەوا ب بنیاتێ گشتی دهێتە نیاسین (قواوة: ٢٠١٢، ص٧١).

دیارترین رەگەزێن کاریگەر بۆ دەستنیشانکرنا بنیاتێ گشتیێ گوتارێ:

ناڤونیشان: گرنگیا ناڤونیشانی د وێ یەکێدا دیاردبیت کو (یەکەم دەروازەیە و پەیوەندی ل وێری دەستپێدکەت) (حسين: ٢٠٠٧، ص١٦٨). هەروەسان ب گرنگترین ئالاڤێن ڤەکرنا کودێن تێکستی دهێتە هەژمارتن، دەمێ ئەم بەحسا ئەڤێ چەندێ دکەین ئەم نابەرێخۆ دەینە ئەوی ناڤونیشانێ هەروە و بێ مەرەم هاتیە دانان، بەلکو مەبەستا مە ئەو ناڤونیشانە ئەوێ ب هویری هاتیە دانان و هەمی هویرکاتیێن تێکستی ب خۆڤە دگریت، و هەر وەسان (ئەوە یێ هاریکاریێ بۆ راڤەکرنا تێکستی پێشکێش

دکەت و ئەوە یێ ل بەراهیێ دهێت، ل دویڤ ئەڤێ چەندێ ئەو یەکەم دیدارا داهێنەری و وەرگرییە ل بەری چوونا ل ناڤ تێکستی) (قطوس: ٢٠٠١، ص٣٦). دیسان (ناڤونیشان دبیتە ناسنامەك بۆ تێکستی و هەمی هویرکاریێن سیمانتیکیێن وی ل ناڤدا دهێنە رستن) (ئورمانی: ٢٠٠٩، ل٥٦).

ئەو تێکستێ هاتیە دەستنیشانکرن بۆ شرۆڤەکرنێ ل ژێر ناڤونیشانێ (دەردێ مە)یە، ئەڤ ناڤونیشانە گەلەك دەلالاتان ل ناڤ خۆ هەلدگریت، ب تایبەت ئەگەر ب رەهندەکێ مێژوویی لێ بنێرین، وەکو دیار هەر د کەڤندا تاکێ کورد هەست ب غەدر و ستەمەکا مێژوویی دکەت، هەتا گەهشتیە وێ رادێ کو د هوشێ مرۆڤێ کوردا ئەڤ کێشەیە ببیتە کێشەیەکا ئەزەلی، لەورا خانی دبێژیت: (ئەمما ژ ئەزەل خودێ وەسا کر)، چونکی د هەمی قۆناغێن مێژوویدا مرۆڤێ کورد هەست ب بێدادیێ کریە و ژ سەدەما نەبوونا دەستهەلاتەکا کوردی غەدر و ستەم ل مللەتێ کورد هاتیەکرن، هەتا ئەوێ رادێ کو ئەڤ بێدادییە بوویە دەردەك بۆ مللەتێ کورد و هەمی دەما ژبەر نالیە، هەر وەسان ئەڤ ناڤونیشانە یێ خەمگینە و هەستەکا خەمناك ل دەڤ مروڤی پەیدادکەت، لەورا هەر ل دەستپێکێ مرۆڤ هەست ب وێ خەمێ دکەت، ئەوا تێکستی ڤیای دەربرینێ ژێ بکەت، بێگومان ئەڤە ئاماژەی هندێ دکەت کو ئەڤ ناڤونیشانە ب شارەزاهی هاتیە دانان و شیایە هەمی دەلالاتێن خەمگین ل ناڤ خۆ هەلگریت.

دووبارەبوون: دبیت دووبارەبوون ببیتە ئالاڤەك ژ ئالاڤێن رێکخستنێ و هەروەسان دشێت ببیتە ئالاڤەکێ گونجانێژی، چونکی ئەو دشێت وێ دیتنێ بگەهینیت ئەوا تێکست ب خوڤە هەلدگریت، هەروەسان دشێت رابردوویێ تێکستی ب داهاتیێ ویڤە گرێبدەت و پێچەوانەژی. ب ئەڤێ چەندێ ئەو هەولددەت بۆ وێ یەکێ دا ل سەر د دسەردابرنا تێکستیدا زال بیت، یان هەر ب کێمی بگەهینیتە نزمترین ئاست ژ سنۆرێن وێ (عباىنة ؛الزعبي: ٢٠١٣، ص٥٤٠).

هەروەسان دووبارەکرن، دیسان دووبارە بیرهینان هزرێیە، چونکی ب درێژاهی و درێژەپێدانا ئاخاڤتنێ دبیت دابڕانەك بکەڤیتە د ناڤبەرا دەستپێکا ئاخاڤتنێ و دوماهیا وێدا و ئەڤ چەندە ببیتە هۆکار بۆ ژبیرکرنێ، ئەڤجا ئەگەر دووبارە بوو دێ بیرهینانەك

د هزرێدا پەیدابیت و هەروەسان دێ ئەوێ پەیوەندیێ دیارکەت ئەوا د دویڤدا دهێت یان ئەوا دکەڤیتە د گەلدا (زیاد: ٢٠١٥، ص١١١).

وەکی بەری نووکە مە ئاماژەپێدای کو دیاردا دووبارەکرنێ ئێکە ژ ئالاڤێن رێکخستنا تێکستی، بەلێ ل گەل هندێژی دشێت ببیتە رێکەك، یان ئالاڤەك بۆ گونجانا تێکستی، ئەوژی ب رێکا دووبارە بیرهینانا خواندەڤانی ب هندەك هزرێن سەرەکی و هەروەسان پێکڤەگرێدانا پەیوەندیێن سیمانتیکی ئەوێن کاریگەری ل سەر پەیاما گوتارا تێکستی هەی، لەورا خانی هەولدایە ب درێژاهیا تێکستی ئەڤێ پەیوەندیێ ب رێکا دووبارەکرنا هندەك دەربرینان بپارێزیت و ئەوێ دابرانا هزرێ کێم بکەت، ئەوژی کو دووبارە مەبەستا خۆ بینیتە هزرا خواندەڤانی، وەکی د ڤان نموونەیاندا ئەڤ چەندە دیاردبیت.

بۆ نموونە:

رابت ژ مەژی جهان پەناهەك　　پەیدا ببتن مە پادشاهەك

* * *

گەر دێ هەوا مە سەرفەرازەك　　صاحب کەرەمەك سوخەن نەوازەك

* * *

گەر دێ هەبوا مە پادشاهەك　　لائق بدیا خودێ کولاهەك

گەردێ هەبوا مە ئتفاقەك　　ڤێکرا بکرا مە ئنقیادەك

(خانی: ١٩٩٠، ل٤٩-٥٣)

شرۆڤەکرن: ئەڤ دێرێن شیعری هەر هەمی ئێك رامان ددەن، ئەوژی واتە و رامانا (ئەگەر مە سەرکردەیەك هەبایە)، ئانکو واتە ئەگەر جیهان پەناهەك، یان لێڤەگەرەك ل ناڤ مە رابیت و پاشایەك ل مە پەیدابیت، ئەگەر مە سەرکردەیەکێ سەربلند و سەرفەراز هەبایە یێ ب رێز و قەدرگربا و یێ ئاخاڤتن خوش با، ئەگەر مە پاشایەك هەبا و خودێ تاجەکێ هەژی وی کربا سەرێ وی و ئەگەر مە ئێکگرتنەك هەبا و ئەم هەمی پێکڤە ل بن فەرمانا یەك سەرکردەباین.

ئەڤجا ل ڤێرێ ئەڤ دێرێن شیعرێ هەمی دووبارە بووینە و هەر هەمی ئێك رامان دگەهینن، ئەوژی (ئەگەر مە سەرکردەیەك هەبا). ئانکو ل ڤێرێ وەکو جەخت

و دووبارەكرنەكێ خانی ڤیایە، ئەڤێ چەندێ بینیتە هزرا مە كو ئەو دەردێ مللەتێ كورد ژێ دنالیت هۆكارێ وێ نەبوون، یان ڤالاهیا سەركردایەتیا مللەتێ كوردە و ژ سەدەما ئەڤێ ڤالاهیێ رەوش ئەڤەیە یا مللەتێ كورد ژ دێرین زەمان بەردەوام ژێ دنالیت، ژبەر هندێ خانی ئەڤ بانگەوازیە بەردەوام راگەهاندیە و چەندین جاران دووبارەكریە، ئەڤێ دووبارەكرنێ كاریگەریەكا ب هێز ل سەر گونجان و بەردەواميا پەیوەندییا سیمانتیكی و واتاییا تێكستی سازكریە، ئەڤ چەندەژی ب ئەركێ خۆ تێگەهشتنەكا كویرتر بۆ كێشا مێژوویا كوردی و بنیاتێ گوتارا تێكستی بەرهەڤ دكەت، ئەوژی ب رێكا پێكڤەگرێدان و پابەندكرنا سیماێن سیمانتیكێن تێكستی، چونكی ئەڤ بانگەوازا وی یا بەردەوام تەكەسێ ل سەر گوشەنێرینا هوزانڤانی و خەما وی ل سەر ئەوێ ڤالاهیا سەركردایەتیێ دكەت، ئەوا بوویە دەرد و كارەساتەكا مێژوویا مەزن بۆ تەڤایا مللەتێ كورد.

مەبەستداری: ئەڤە وەكی (براون و یول - Yeol and Brown) پێناسە دكەن: كو خالا دەستپێكیا ئاخاڤتنێیە، هەر چەندە خالا دەستپێكا هەر تێكستەكی د ناڤونیشانیدا، یان د رستا ئێكێدا ژ تێكستی خویا دبیت، هەروەسان ناڤونیشان رەگەزەكێ گرنگە ژ رەگەزێن دەلالیێن تێكستی، د ناڤدا كومەكا دەلالەتێن ناڤەندیێن تێكستێ ئەدەبێ خویادبن، چونكی گەلەك پێشبینیێن ب هێز ددەتە خوانەڤانی كو چ د ناڤ تێكستیدا هەیە، ژبەر هندێ (براون و یول)ی ئەڤە كرینە ب هێزترین هۆكار ژ هۆكارێن مەبەستداریێ، چونكی هندەك ئەگەرێن جەڤەنگكاریێن كودكری ب سیستەمێ هێماكاریێن ئاماژەكارڤە بۆ كومەكا ڤەگوهازتیان ڤەدگەرینیت، ئەڤ كارە هەر ئەو ب خۆ ئارمانج و مەبەستا تێكستیە، بەلێ رستا ئێكێ یا دەستپێك دهێتە هژمارتن و هوسان هاتیە زانین كو د دویڤداهاتی ژ وێ دەستپێدكەن و بۆ وێ ڤەدگرن، ئەوا كارتێكرنێ ل سەر راڤەكرنا هەر تشتەكێ د تێكستیدا دهێتە ل پێش دكەت. بەلێ (گریماسی- Greimas) مەبەستداریێ ب تێگەهەكێ گشتیتر پێناسە دكەت، واتە هەر ئاخاڤتنەك، هەر رستەیەك، هەر پەرەگرافەك، هەر بازنەیەك، هەر گوتارەكا رێكخستی ل دۆر رەگەزەكێ تایبەت خالەكا دەستپێكی وەردگریت (قواوة: ۲۰۱۲، ص ۷۰).

ژ بەر هندێ نەمەرجە کو مەبەستا داهێنەری د رستا ئێکێدا دیاربیت، بەلێ زۆربەیا پێناسان تەکەسێ ل سەر ناڤونیشانی، یان رستا دەستپێکی دکەن، وەك گرنگترین ئالاڤێن مەبەستداریێ، چونکی (هندەك پێشبینیێن ب هێز ل دۆر بابەتی ددەتە وەرگری و هەتا رادەکێ باش ناڤونیشان بڕیارێ ل سەر شرۆڤەکرن و راڤەکرن و لێکدانا وەرگری دکەت) (موسی: ٢٠١٥، ص٣٣).

ل ڤێرێ ئەگەر ب هویری سەحکەینە رستەیا ئێکێ ژ تێکستێ (دەردێ مە) دبیت مەبەستا سەرەکی یا دانەری تێدا دیارنەبیت، بەلێ پێشبینیەکێ ددەتە مە کو ئەو دێ بەحسێ هندەك تشتان کەت، رەنگە ئەو سحبەت و ئاخاڤتن ل دویڤ حەز و ڤیانا هەمی کەسان نەبیت، واتە ئەو گوتن دبیت ب دلێ هندەك کەسێن دلسۆز بۆ دۆزا مللەتێ کورد نەبیت، بەلێ ئەڤە راستییە، لەورا دڤێت بهێتە گوتن، ژبەر هندێ خانی ل دەستپێکێ دبێژیت:

| | |
|---|---|
| ساقی تو ژبو خودێ کەرەمکە | یەك جرعەتی مەیێ دجام جەمکە |
| داجام ب مەیێ جهان نومابت | هەر چ مە ئرادەیە خویا بت |

(خانی: ١٩٩٠، ل٤٨)

دیسان ل ڤێری هەژیە ئاماژەی ئەوێ چەندێ بکەین کو د رێبازا سوفیگەرییێدا دوو قوتابخانە هەنە سوفی ژبۆ دەربڕینا راز و نیازێن نهێنیێن ناخێ خۆ پەیڕەو دکەن، ئەوژی قوتابخانا مەستی و قوتابخانا هەستییە.

د ڤێ نموونێدا خانی ڤیایە ل سەر رێبازا قوتابخانەیا مەستیێ بچیت و هەمی نیازێن ناخێ خۆ بۆ مە روون و ئاشکرا بکەت، چونکی د دوخێ مەستی و بێ هۆشییێدا هیچ گرفتەك پێشیا سوفیگەری بۆ دەربڕینێن ناخێ خۆ ناگریت، بێگومان خانیژی وەك سوفیگەرەك ڤیایە پەیڕەوی ئەڤێ رێبازێ بیت و هەمی راستییان بێی دوودلی ئاشکەرا بکەت و هیچ ئاستەنگەك پێشیا وی نەگریت، چونکی ئەو دێ هندەك تشتا بێژیت نە ب دلێ وەرگرینە.

مەبەستا سەرەکیا خانی ژ تێکستێ (دەردێ مە) ئەڤە بوویە کو ڤیایە ئەڤێ راستیێ بێژیتە مە کو هۆکارێ نەگەهشتنا مللەتێ کورد ب ئارمانجێن خۆ نەبوونا ئێکگرتنا مللەتێ کوردە وەکی د ئەڤان دێرێن شیعریدا دبێژیت:

گەر دێ هەبوا مە ئیتفاقەك ... ڤێكرا بكرا مە ئنقیادەك
روم و ئەرەب و عەجەم تمامی ... هەمیان ژمەرا دكر غولامی
تەكمیل دكر مە دین و دەولەت ... تەحصیل دكر مە علم و حكمەت

(هـ. ژ، ل٥٣)

شرۆڤەیا ئەڤان دێران: ئەگەر مە هەڤگرتن و ئێكەتییەك هەبا و ئەم هەمی پێكڤە ل ژێر فەرمانا یەك سەركردایەتی باین، روم و عەرەب و عەجەمان هەر هەمی ب هەڤرا دا خولامینیا مەكەن، هینگێ ئەم دا دین و دەولەتا خو تەكوز كەین و دا زانین و زانیاری و مەعریفێ ب دەستخوڤە هینین.

مەبەستا سەرەكییا خانی ئەڤە بوو ئەوا د ڤی بازنەیێ سەریدا ب ئاوایەكێ رێكخستی و گونجای هاتییە دارشتن كو وەكو خالەكا دەستپێكی ئاماژە پێ هاتیە دان، ڤیایە ئەوێ پەیامێ بگەهینیتە مە، ئەم وەكو خواندەڤان، یان وەرگر.

پاشخانێ زانیارییان: هەبوونا سەربوران چ یێن گشتی، یان تایبەتی هاریكارییا مرۆڤی دكەن بۆ زانین و تێگەهشتنا جیهانا دەوروبەر، زانیاری و باگراوەندێ گشتی ئالاڤەكە ژ ئالاڤێن گونجانا تێكستی كو مەبەست ژێ رەوشەنبیری و لایەنێ ئەپستمی یێ وەرگریە، ئەوا هاریكار بۆ وێنەكرن و هزركرنا هوشی ل دۆر تشتان و هندی دیتنا مە یا رێژەیی بیت بۆ جیهانێ، بنیاتێ تێكستی پتر دشێت بنیاتەكێ سەرەكیێ تازە بەرهەم بینیت بۆ زانینا مرۆڤی یا گشتی، چونكی ئەو دیتن و وێنەیێن خواندەڤان دروستدكەت، نە مەرجە یێ وەكهەڤی وی وێنەی بیت، ئەوێ د تێكستیدا هاتی، ئەڤجا ل دویڤ ئەڤێ چەندێ شروڤەكرنا تێكستی، یان زانینا رادێ گونجانا وی و هەروەسان بریاردان ل سەر تێكستبوون، یان نە تێكستبوونا وی پالپشتیێ ل سەر وێ خرڤەبوونا هەی چ ل سەر راڤەكرنا تێكستی، یان وەرگرتنەكا بەراهی ژ زانیارییان ئەوێن ل دەڤ وی خرڤەبووین ب رێكا خواندنەكا وەسان كو بشێت تەكەسێ ل سەر پاراستنا هێلێن بەرفرەهێن تێكستی و ئەزموون و سەربوورێن بەرێ ئەوێن خواندین، یان چارەكرین بكەت (عبابنة ؛الزعبي: ٢٠١٣، ص٥٤١-٥٤٢).

ل ڤێرێ ئەگەر ل سەبارەت باگراوەندێ زانیارییان لێكبدەینەڤە ئەو وێنە و خواندنا خانی د ڤی تێكستیدا دروستكرین دهاریكارن بۆ پتر شرۆڤەكرنا تێكستی ب

ئاوایەکی کو مرۆڤ وەکو خواندەڤان بشێت هویرتر ل پەیاما وی بگەهیت و هەست ب گونجانەکا سەرانسەری ل سەر ئاستێ هەمی تێکستی بکەت، ئەوژی ب رێکا هەلبژارتنا مە بۆ ڤان نموونان، ئەڤ چەندە دهێتە سەلماندن کو خانی پەیاما خۆ یا گشتی د سێ رەهەندێن سەرەکیدا پێشکێشی خواندەڤانی دکەت و پالپشتیێ ل سەر باگراوەندێ زانیارییان بۆ ئاشکراکرنا پەیاما گشتی یا تێکستێ (دەردێ مە) دکەت و هەروەسان دیارکرنا رادێ گونجانا تێکستی دەستنیشان دکەت.

رەهندێ ئێکێ: ل دەستپێکێ خانی دایە دیارکرن وەکو بڕیارەکا خودایی، هەر ژ ئەزەل، واتە هەر ل بەری هەبوونێ خودای وەسان حەزکریە کو مللەتێ کورد بکەڤیتە دەردێ بندەستیێ دەما دبێژیت:

ئەمما ژ ئەزەل خودێ وەسا کر    ئەڤ روم و عەجەم سەر مە راکر

(خانی: ١٩٩٠، ل٥٠)

رەهەندێ دووێ: ل پشتی هینگێ خانی دهێت و راڤەکرنەکێ ددەتە بۆچوونا خۆ و هۆکارەکێ میتافیزیکی بۆ دەردێ مللەتێ کورد دەستنیشان دکەت، ئەوژی ب دوو ئاراستەیان.

ئاراستەیێ ئێکێ: نەزانین و نەتێگەهشتنا حکمەتا خودایی ل ڤێرێ چ بەرسڤ بۆ ڤێ چەندێ نابن، چونکی ئەم حکمەتا خودێ نزانین.

ئاراستەیێ دووێ: نەڕازیبوونە ژ حکمەتا خودێ ب رێکا رەتکرن و یاخیبوون ل سەر ئەوێ حیکمەتێ، چونکی هۆکار زانینا وێ حکمەتێیە و بەرسڤ زالبونا دۆژمنێن مللەتێ کوردە، ئانکو بندەستیبوونە، ئەڤەژی نەڕازیبوونێ ل پەی خۆ دهینیت، چونکی مللەتێ کورد ملکەچی ئەوێ بڕیارێ نەبوو و خۆ تەسلیم وێ قەدەرێ و حکمەتێ نەکر.

بۆ نموونە:

ئەز مامە دحکمەتا خودێدا    کرمانج د دەولەتا دنێدا
ئایە ب چ وەجهی مانە مەحروم    بلجوملە ژ بو چ بونە مەحکوم

(هـ. ژ، ل٥١)

ئەڤ بۆچوونە ب هەردوو ئاراستەیانڤە ل بەری نووکە مە ب هویری شرۆڤەکریە ڤەگەریێ هەڤگرتنا تێکستی ب وەرگریڤە.

رەهندێ سێیێ: ئەڤ رەهندە پتر د هۆکارەکێ فیزیکیدا بەرجەستە دبیت و ب بۆچوونا خانی ئەڤ هۆکارە دشێت ب سەر هۆکاری میتافیزیکی سەرکەڤیت، چونکی ئەڤ هۆکارە دشێت چارەنڤیسێ مللەتێ کورد بگۆهوڕیت و هەروەسان حکمەتا خودایی ژی بهێتە گۆهوڕین و مللەتێ کورد ژ دەردێ بندەستێ رزگاربیت، واتە هۆکارێ فیزیکی ب سەر هۆکارێ میتافیزیکی بکەڤیت و هۆکارێ میتافیزیکی بهێتە گۆهوڕین، بەلێ ب مەرجێ کو مللەتێ کورد ئەڤان هوکاران جێبەجێبکەن، ئەوژی یەك ریزی و یەکگرتن و تفاقی و کارکرن ل ژێر فەرمانا یەك سەرکردایەتی دەما دبێژیت:

| | |
|---|---|
| گەر دێ هەبوا مە ئیتفاقەك | ڤێکر بکرا مە ئنقیادەك |
| روم و ئەرەب و عەجەم تمامی | هەمیان ژمەرا داکر غولامی |
| تەکمیل دکر مە دین و دەولەت | تەحصیل دکر مە علم و حکمەت |

(هـ. ژ، ل٥٣)

واتە ل ڤێرێ خانی تەکەسێ ل ئەڤان هۆکاران دکەت، وەکو هندەك سیمایێن سیمانتیکی و دهێنیتە هزرا وەرگری کو ئەگەر ئەڤ هۆکارە جێبەجێبن دێ بنە رێ چارەیەك بۆ دەردێ مللەتێ کورد و پێکڤەگرێدانا ئەڤان هەمی هۆکاران ب هەر سێ رەهندێن خۆڤە د باگراوەندێ زانیاریێن وەرگریدا گونجانەکا بهێز دێ دەتە تێکستی.

بژالەبوون و ڤالاهی و دابڕان: ئەڤ زاراڤێن هەنێ بێی هەبوونا ئالاڤێن بەندکرنێژی هەر دەربڕینێ ژ لێك نێزیکبوونا پارچێن زمانیێن تێکستی دکەت، ئەڤە ئەوێ چەندێ دگەهینت و سەرباردکەت کو وەرگرژی بەشداری پروسا داهێنانێ دبیت، چونکی (وەرگر پالپشتیێ ل سەر دروستبوونا واتایێ دکەت، ئەوا پێکهاتەیا جۆرەکێ واتایێ مسوگەر دکەت و هاریکارییا وەرگری دکەت بۆ پتر تێگەهشتنا گوتارا تێکستی، یان ئاخاڤتنێ، ئەڤەژی ژ ئەنجامێ دووبارەبوونا هندەك هۆکار و بهاداریێن رێڕەوینە) (مفتاح: ١٩٨٥، ص٢٧).

ل سەرباری ئەڤێ چەندێ، (بژالەبوون و ڤالاهی و دابڕان و لابران، هەرچەندە دوخەکێ لاوازییا پەیوەندیێن رێکخستنێ دروستدکەن، بەلێ ل سەر هندێڕا کەشەیەکی بۆ گونجان و پابەندییەکا سیمانتیکی پێشکێش دکەت و ئەوی یێ لاواز قەرپودکەت) (عبابنة ؛الزعبي: ٢٠١٣، ص٥٤٥).

هەر دیسان بۆ دروستکرنا ئەڤی دوخی هۆزانڤان د پەياما خۆ يا شيعريدا هەولددەت هندەك بۆچوون و وێنەیێن دژی ئێك دەرببڕیت، دا بژالەبوون و ڤالاهی و دابڕانەکێ پەیدابکەت.

ب هەمان شێوە د تێکستی (دەردێ مە)دا خانی گەلەك بەحسێ ڤالاهيا سەرکردايەتيا کوردی دکەت و ل چەندين جها گوتيە (گەردێ هەبوا مە پادشاهەك)، واتە ئەگەر مەژی پاشايەك هەبا، ل ڤێری ئەڤ پرسيارە دهێتە ئارا و بژالەبوونەکێ د هزرێدا دروستدکەت کو ئايە مللەتێ کورد دبێ سەرکردە بوون و ژبەر هندێ دەردێ مللەتێ کورد ئەڤە بوويە، پاشی خانی ل جهەکێ دی ئەوێ هەبوونێ دسەلمينيت واتە هەبوونا سەرکردەيان و ب کومەکا ساخلەتێن باش پەسنا مير و سەرکردەیێن مللەتێ کورد دکەت، د دويڤدا هەر ئەوان سالوخەتان دکەتە هوکارێ نەرێککەڤتن و ژێکڤەبوونێ و د ئەنجامدا تەمومژی يان ڤالاهييەك د هزرا وەرگريدا بۆ نەبوونا سەرکردايەتيێ پەيدا دبيت و دەرئەنجام ئەو بۆ مللەتێ کورد کەڤتيە ڤی دەردی.

وەکو دەما خانی دبێژيت:

جوامير و همەت و سەخاوەت — مێرينی و غيرەت و جەلادەت
ئەو خەتمە ژ و قەبيلێ ئەکراد — وان دانە ب شير و همەت داد
هندە ژ شەجاعەتێ غەيورن — ئەو چەندە ژ مننەتێ نفورن
ئەڤ غيرەت و ئەڤ علو هممەت — بو مانعێ حەملێ بارێ مننەت
لەو پێکڤە هەميشە بێ تفاقن — دائم ب تەمەررود و شقاقن

(خانی: ١٩٩٠، ل٥٢-٥٣)

ئەڤ بۆچوونا هەڤدژ پەرت و بەلاڤيەکێ، يان بژالەبوون و ڤالاهی و دابڕانەکێ و تەمومژيەکێ د هزرا وەرگريدا پەيدادکەت. چونکی چاوا رەوابيت مللەتەك خودانێ ئەڤان سەرکردە و کەسان بيت و ب ئەڤی رەنگی يێ نەئێکگرتی بيت و ژ دەردێ بێ تفاقيێ هەردەم بناليت.

ل ڤێرێ پێدڤيە وەرگر ب ئاوايەکێ گشتی ل واتايا گوتارێ و پەياما تێکستی بنێڕيت، هەتا بشێت لێکدانەيەکا دروست بۆ پەيوەندیێن سيمانتيکی ڤەدوزيت،

چونکی هۆزانڤان د گوتارا خۆ یا شیعریدا هەمی زانیاریێن تێکستی ب شێوەیەکێ بـژاله و دابـری هەڤـدوو ئاراسـته دکەت، دا ئیسـتاتیکایەکێ د تێکسـتێ خـۆدا دروستبکەت، ئەڤجا یا پێدڤیە ل سەر وەرگری، یان خواندەڤانی دوێڤچوونێ ل ئەڤان هەمی زانیارییان بکەت، هەتا بگەهیته واتایا گشتی یـا گوتـارا تێکستی و ل هەمـی رەهند و مەبەستێن پەیاما فـرێکەری بگەهیـت، هینگـی وەرگـر دێ د پەیاما گشـتی گەهیت و هەست ب گونجانا تێکستی وەك یەکەیکا مەزن یا ئێکگرتـی و تەڤگـر کەت.

**ئەنجام:**

١. میکانیزما کاریگەر بۆ دیارکرن و ئاشکەراکرنا گونجانا تێکستی ب رێکا هندەك رەگەز و بنەمایێن گرنگێن مینا: (بەشداریکرن، رێرەو، پەیوەندییا هەڤگرتنا تێکستی ب وەرگریڤە، هەڤتێکستی) دهێتە دەستنیشانکرن.

٢. گونجانا تێکستێ (دەردێ مە) ب رێکا پەیوەندیێن سیمانتیکی د ناڤبەرا بەشێن تێکستیدا ب رێکا پەیوەندیێن (گشتگیری و درێژەپێدان، یان گشتی و تایبەتی) و هەروەسان دیارکرنا ئەگەر و ئەنجامان کو د هاریکارن ل سەر پێکڤەگرێدان و پەیوەندیێن پارچەیێن تێکستی هەمیێ ب هەڤرا. ئەڤ پەیوەندییە د جۆراوجۆر و هەمەرەنگن، بەلێ ل دویڤ لێکدانەڤەیەکا گشتی ئەوێ گونجانا د ناڤ تێکستیدا هەی دسەلمینن.

٣. مەبەستاری ئێك ژ هۆکارێن هەرە گرنگە کو وەرگر د مەبەستا هوزانڤانی و هەستا وی بگەهیت، چونکی د مەبەستێدا پەیاما سەرەکی دگەهیت و ئەوژی پێدڤی ب لێکدانەکا گشتییە و ئەڤ لێکدانا گشت ب ئەرکێ خۆ پێدڤی گونجانێیە، لەورا مەبەستا خانی د تێکستێ (دەردێ مە)دا بێی لێکدانەکا گشتی و دیارکرنا گونجانێ ب دەستڤە ناهێت، چونکی خانی د ئەڤی تێکستیدا پالپشتی ل سەر هندەك رەگەزێن وەك (بژالەبوون و دابڕان و ڤالاهی)، کرییە ئەوێن ب ئەرکێ خۆ جۆرە تەمومژیەکێ د مەبەستێدا پەیدادکەن.

٤. بابەتێ گوتارا تێکستێ (دەردێ مە) ئەوێ د بنیاتێ گشتیێ گوتارێدا دیاردبیت کو بابەت هەمی ل سەر کێشەیا مللەتێ کوردە.

٥. رەگەزێن گونجانێ ئەوێن د تێکستێ (دەردێ مە)دا هەین، شیاینە ب رێکا ڤەگوهازتنان و هندەك پەیوەندیێن سیمانتیکی هەمی پارچێن تێکستی ب هەڤدووڤە پابەند بکەن و گونجانا وی بسەلمینن.

٦. خانی د تێکستێ (دەردێ مە)دا ب رێکا زانیارییێن باگراوەندێ گشتی جۆرە ئاسانکارییەك بۆ وەرگری بەرهەڤکریە بۆ لێکدان و راڤەکرن و شرۆڤەکرنێ ئەوا هاریکار بۆ دیارکرنا گونجان و رێکخستنا تێکستی.

**لیستا ژێدەرا:**

١. الان، جراهام (٢٠١١)، نظرية التناص، ت، باسل سالمة، دار التكوين، دمشق.
٢. ئورمانی، نزار سەلمان طاهر (٢٠٠٩)، ناڤونیشان وەکو ناسناما تێکستێ هوزانێ هوزانێن "محسن قوجانی" وەکو نموونە -ڤەکولینەکا سیمیوتیکی شلوڤەکاریە، ژ وەشانێن مەتین، چاپخانا هاوار، دهوك.
٣. بحيري، سعيد حسن (٢٠٠٤)، علم لغة النص والمفاهيم والاتجاهات، مؤسسة المختار للنشر والتوزيع، القاهرة.
٤. بن مخلوف، ربيعة (٢٠٠٩)، الانسجام النصي في الرسالة الهزلية ل (بن زيدون)، جامعة العقيد الحاج لخضر باتنة، كلية الاداب والعلوم الإنسانية، قسم اللغة العربية.
٥. جیهانی، پەرویز (٢٠٠٧)، مەم و زین ب راڤە و شرۆڤەیەك نوو، بەرگێ ئێکێ، سپیرێز، چاپخانا خانی، دهوك.
٦. حسين، خالد حسين (٢٠٠٧)، في نظرية العنوان مغامرات تأويلية في شؤون العتبة النصية، التكوين، دمشق.
٧. خانی، ئەحمەدێ (١٩٩٠)، مەم و زین، شروڤەکرن، ئەمینێ ئوسمان، مطبعه الجاحظ، بغداد.
٨. الخليل، سحر سليمان (٢٠٠٩)، المدخل الى تذوق النص الادبي، دار البداية، عمان.
٩. زياد، فاطمة (٢٠١٥)، ثنائية الاتساق والانسجام في الخطاب الشعري عند سميح القاسم "ليلى العدنية انموذجا"، مجلة العلوم الاجتماعية، العدد ٢١.
١٠. السعيد، حمودي (٢٠١٢)، الانسجام والاتساق النصي المفهوم والاشكال، عدد خاص، اشغال الملتقى الوطني الأول حول: السانيات والرواية، ٢٢-٢٣ فيفري.
١١. سمير، حميد (٢٠٠٥)، النص وتفاعل اللمتلقي في الخطاب الادبي عند المعري، اتحاد الكتا العرب، دمشق.
١٢. صالح، محسن عارف (٢٠١٢)، پراکتیزەکرنا تیورا دەقی د مەم و زینا خانیدا، زانکۆیا دهوك، کۆلیژا ئادابێ، پشکا زمانی کوردی، ناما دکتورایێ.
١٣. عبابنة، يحيى ؛الزعبي، امنة صالح (٢٠١٣)، عناصر الاتساق والانسجام النصي-قراءة نصية تحليلية في قصيدة "اغنية لشهر أيار" لاحمد عبدالمعطي حجازي، مجلة جامعة دمشق، المجلد ٢٩، العدد ١+٢.
١٤. علي، محمد محمد يونس (٢٠٠٤)، مقدمة في علم الدلالة والتخاطب، دار الكتب الجديد المتحدة، بيروت.
١٥. فاركلوف، نورمان (٢٠٠٩)، تحليل الخطاب التحليل النصي في البحث الاجتماعي، ت: طلال وهبة، مركز دراسات الوحدة العربية، بيروت.

١٦. فضل، صلاح (١٩٩٢)، بلاغة الخطاب وعلم النص، سلسلة عالم المعرفة، الكويت.
١٧. قطوس، بسام (٢٠٠١)، سيمياء العنوان، وزارة الثقافة، عمان.
١٨. قواوة، الطيب العزالي (٢٠١٢)، الانسجام النصي وادواته، مجلة المخبر، العدد الثامن.
١٩. لوشن، نورا لاهدى (٢٠٠٦)، علم الدلالة، دراسة وتطبيق، المكتب الجامعي الحديث، الإسكندرية.
٢٠. محمد، عزة شبل (٢٠٠٧)، علم لغة النص النظرية والتطبيق، الناشر مكتبة الاداب، القاهرة.
٢١. محمد، محمد بكر (٢٠٠٨)، دژە دەق دوالیزمی (ڕێڕەو) لە دەقی شیعریدا دەقی (دەردێ مە)ی (ئەحمەدێ خانی) وەك نموونە، زانكۆ/ گۆڤاری زانستە مرۆڤایەتییەكانی، زانكۆی سەلاحەددین، ژمارە ٣٤، هەولێر.
٢٢. مفتاح، محمد (١٩٨٥)، تحليل الخطاب الشعري (استراتيجية التناص)، دار التنوير للطباعة والنشر، المركز الثقافي العربي، الدار البيضاء.
٢٣. موسى، هناء (٢٠١٥)، داده الاتساق والانسجام ومظاهرهما في قصيدة (بطاقة هوية) لمحمود درويش، جامعة قاصدي مرباح، كلية الاداب واللغات، قسم اللغة العربية وادابها.

## ملخص البحث

**ا.م.د. محسن عارف صالح**
قسم اللغة الكوردية/ كلية اللغات / جامعة دهوك

هذه الدراسة تدور حول النص ولسانياته وتهتم أيضا بالإنسجام والأتساق الداخلي لوحدات النص، والنص الشعري كذلك لكونه النص مكتوبا ولغويا يتخذ الإجراءات ذاتها، ولأن الشاعر في خطابه الشعري يخفي جميع معلومات النص ويغطيه بشيء من الغموض، لذلك يجب على المتلقي كناقد أو قارئ أو محلل متابعة هذه الوحدات أو المعلومات جميعها، حتى يصل الى المعنى المراد أو الكلي للنص عن طريق ترابط تلك العلاقات حينها سيظهر الأنسجام والأتساق بشكل واضح وملحوظ لأي نص. في مجال هذه الدراسة هناك محاولة للتخلص من التحليل الجزئي عن طريق الإهتمام بجميع وحدات النص كوحدة كلية شاملة لتحليل وإثبات الإنسجام داخل النص عن طريق تلك الوحدة الشاملة والكلية، فهذه الدراسة أجريت تحت عنوان (الإنسجام في النص الشعري (بؤسنا) من مم و زين لخاني نموذجا)٠
كلمات المفاتيح: الانسجام، النص، السياق، خاني، بؤسنا.

# Abstract

## The coherence in the texts of the poetic (Our misery) of Mam and Zeen of the Khani as a model

**Assisstant prof. Mohsin Arif Salih**
Dept. of Kurdish, college of languages,
university of Duhok, Kurdistan region-Iraq

This study revolves around the text and its linguistics and also concern with the harmony and internal consistency of the units of the text, and the poetic text as well because it is a written and linguistic text that takes the same procedures, and because the poet in the rhetoric of the poet hides all the text information and covers it with some mystery, therefore the recipient as a critic Or a reader or analyst to follow up on all these units or all information, until it reaches the intended or total meaning of the text by interconnecting those relationships then the coherence and consistency will appear clearly and remarkable for any text. In the field of this study, there is an attempt to get rid of the partial analysis by paying attention to all the units of the text as a complete comprehensive unit for analysis and proving coherence within the text through that comprehensive and complete unit, this study was conducted under the title (The coherence in the poetic text (our calamity) of Mam and Zeen of the Khani as a model).

Keywords: coherence, Text, Context, Khani, Our misery.

# پێکەوەژیانی ئایینی
# لە رۆمانی (شیری موسا)ی سابیر رەشیدا

د. عەبدوڵلا رەحمان عەولا
بەشی زمانی کوردی ـ کۆلێژی پەروەردە/ مەخموور،
زانکۆی سەلاحەددین - هەولێر

**پێشەکی**

پێکەوەژیانی ئایینی دەلالەت لە کۆمەڵگایەکی فرە تائیفی و ئایینی دەکات کە لەگەڵ یەکدیدا گونجاون و متمانەیەکی بەتین لەنێوانیاندا هەیە، سەرەڕای ئەوەی کە ئەوان لەڕووی بیروباوەڕی ئایینییەوە لەیەکتر جیاوازن، بەڵام توانیویانە ژینگەیەك بهێننەکایەوە کە ئاشتەوایی لەنێوان چین و توێژەکانی کۆمەڵگەی لێ دروست بووەو لە شەڕو رق و کینەو توندوتیژی دوورکەوتوونەتەوە. لەم روانگەیەوە لایەنی ئایینی، لایەنێکی دیار و بەرچاوی کۆمەڵگەیە و کاریگەری و کارتێکردنێکی گەورەی لەسەر ژیانی تاکەکانی کۆمەڵگە هەیە ، بۆیە رۆمان وەکو ژانرێکی سەردەمیانە خۆی لە قەرەی ئەو بابەتە گرینگە داوە و رەهەند و لایەنەکانی دەرکردووە. بەتایبەتیش لە کۆمەڵگەی کوردیدا کە زیاتر کۆمەڵگەیەکی نەریتگەرا و قەدەری دواکەوتووانەیە کە تێیدا ئایین رۆڵی گەورە لە ژیانی تاکی کورد وازی دەکات و بەشێکی گرینگ لە بنەماکانی کۆمەڵگەی کوردی پێکدەهێنێت.

سنووری توێژینەوەکەمان لەم توێژینەوەیەدا کار لەسەر کۆمەڵگەی باشووری کوردستان کراوە و بەتایبەتیش هەر دوو شاری هەولێر و شارۆچکەی شەقڵاوە، بەو پێیەی کە ئەو دوو شوێنە پانتاییەکی فرەئایینن و پێکەوەژیانێکی ئاشتیخوازانەیان لە ژیاندا دروستکردووە، لەم رووەش رۆمانی (شیری موسا)ی (سابیر رەشید) بەنموونە هێنراوەتەوە کە ئەو پێکەوەژیانەی ئەو دوو شوێنەی کردۆتە گرێچنی رووداوەکانی.

هۆکاری توێژینەوەکە: هۆکاری سەرەکی توێژینەوەکە بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە تاکو ئێستا لەڕوانگەی ئەدەبییەوە لە بوارێکی گرینگی وەکو ئایین نەکۆڵراوەتەوە و هەروەها پەیوەندیی نێوان ئایین و ئەدەب بەشێوە گشتییەکەی کەمترین توێژینەوەی لە ئەدەبی کوردی لەسەر کراوە .

ڕێبازی توێژینەوە: میتۆدی سەرەکی توێژینەوەکەمان، میتۆدی ڕەخنەی کۆمەڵایەتییە، کە لە چوارچێوەی کۆمەڵناسیی ڕۆماندایە، هەروەها بۆ خستنەڕووی لایەنی تیۆری لێکۆڵینەوەکە سوودمان لە میتۆدی وەسفی وەرگرتووە و لەپێناو شیکردنەوەی و کارکردن لەسەر دەقی ڕۆمانەکانیشدا بۆ میتۆدی شیکاری گەڕاینەوە، بۆ ئەوەی لایەنی تیۆرییەکە لەکۆتاییدا لەناو دەقەکاندا پراکتیزە بکەین.

پێکهاتەی توێژینەوەکە: ئەم توێژینەوەیە لە دوو بەش پێکهاتووە، لە بەشی یەکەمدا چەمك و زاراوەی ئایین و پێکەوەژیانی ئایینی شیکراوەتەوە و تیشکی خراوەتە سەر. لە بەشی دووەمیشدا لەڕوانگەی لایەنی سیاسی و کۆمەڵایەتییەوە باس لە پێکەوەژیانی ئایینی لە ڕۆمانی (شیری موسا)ی (سابیر ڕەشید) کراوە .

## بەشی یەکەم
## چەمک و زاراوەی پێکەوەژیانی ئایینی

ئایین ڕۆڵێکی گرینگ لە ژیانی مرۆڤ و ژینگەکەی دەبینێت و بەهۆی ئایینەوە مرۆڤ بەشێك لە ژیانی خۆی لە سەر زەوی بەڕێوەدەبات، سەرەڕای ئەمەش ئایین کاریگەری گەورەی لەسەر لایەنی سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی و پەروەردەیی...تاد، دەگێڕێت و پەیامی ئایین ئاراستەکەری گشت ئەو لایەنانەیە، ئەمەش وا دەکات ڕۆڵی ئایین لە ژیانی مرۆڤدا کاریگەری و کارتێکردنێکی گەورەی هەبێت. لێرەدا بۆ زیاتر ڕوونکردنەوەی مەبەست و ئامانجەکان، جەخت لەسەر دوو خاڵی گرینگ دەکەینەوە، کە ئەوانیش ناسینی ئایین و پێکەوەژیانی ئایینییە.

**١ــ١: ئایین**

ئایین پێگەیەکی دیار و ڕوونی لە ژیانی مرۆڤ و کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی گێڕاوە و بەهۆیەوە رایەڵەیەکی گرینگی ژێرخانی کۆمەڵگەی بنیاتناوە. مرۆڤ هەر لە سەرەتای بوونییەوە گیرۆدەی ناسینی خۆی و دەوروبەرەکەی بووە، لەمەشدا دووچاری سەرسوڕمان و حەپەسان بۆتەوە، بەتایبەتیش ئەو ژینگە فراوانەی دەوروبەری کە هەمیشە مایەی پرسیار و گەنگەشە بووە، بۆیە پەنای بۆ هێزی ئایین بردووە تا بەهۆیەوە لێکدانەوە و شیکردنەوەکانی لەمەڕ خۆی ژینگەی دەوروبەری ئاسانتر بەدەست بگات، بەواتایەکی دیکە ئایین ئەو ئامراز و کەرەستەیە بووە کە یارمەتی مرۆڤی داوە و کارئاسانی بۆ تێگەیشتن و شرۆڤەکردنی دیاردەکانی داوە. بۆیە ئایین یەکێك لە رەگەزە پێکهێنەرە هەرە گرینگەکانی کەسایەتی مرۆڤە کە کاریگەری و کارتێکردنی لەسەر شێوازی بیرکردنەوە و هەڵسوکەوتی لەگەڵ خۆی و دەوروبەری هەیە. ((ئایینی هەر کۆمەڵگایەك بەشێکی گەورە لە شێوەی بیرکردنەوە و بۆچوونەکان لەلای خەڵکی ئەو کۆمەڵگایە دروست دەکات، کاریگەریشی لەسەر رەفتار و ئەخلاقی تاکەکانی و دیاریکردنی سنووری پەیوەندیی نێوانیان ....هەیە)) (د.عبدالله خورشید،٢٠١١ :٢٨٢)، لەبارەی پێناسەکردنی ئایینەوەش لە چەندین گۆشەنیگای جیاوازەوە بیروڕایەکانی گوزارشتیان لێوە کراوە، لەوانە لەڕووی

زمانەوانییەوە بەو واتایە دێت کـە وەرگیـراوە، مەبەسـت لێـی وەرگرتنـی بیرۆکەیـەك و کارکردن لەسەر ئەو ڕێچکەیە دێت. لەڕووی زاراوەشـەوە بـەمانای کۆمـەڵێك بیـروڕا دێت کـە نەتەوەیـەك بـاوەڕی پێهێنـاوە و لـە ژیـانی ڕۆژانەیـدا کـاری پێـدەکات. لـە روانگەی بیروڕای عەلمانییەتەوەش ئایین کۆمەڵێك بیروڕباوەڕە کە بووەتە بەشێك لە میرات و لەمێژووی نەتەوە و لە وێستگەیەك لە وێسـتگەکانی ڕۆژگاریـدا کاریگـەری لەسەر ژیانی نەتەوەکە بەجێ هێشتووە. لەم ڕووەشەوە وڵاتـانی عـەلمانی ئایینیـان لـە بوارەکانی سیاسی و کۆمەڵایەتی دابڕاندووە و لە چوارچێـوەی بیروربـاوەڕی کەسـیدا مامەڵەی لەگەڵدا دەکەن (رانیا سنجق، ٢٠١٦ :٢). لـە روانگـەی زانسـتی مرۆڤناسیشـەوە ئـایین پێگەیـەکی دیـاری هەیـە و بەشـێك لـە تایبەمەندییـە مرۆڤایەتییـەکان لـەخۆ دەگرێت، چونکە پشت بە توانای داهێنان لەلای مرۆڤ دەبەستێت کە بەهۆی زمانەوە بەرهەم دێت، لەبەر ئەوەی ئایین ڕێوشوێنی تایبەت بـەخۆی هەیـە و زاراوە و زمـانی تایبـەت بەخۆشـی لـە بوارەکـانی ژیانـدا هەیـە، لـەڕووی دەروونناسیشـەوە، ئـایین کۆمەڵێك ئەرکی دەروونی بەجێ دەگەیەنێت، بەتایبەتیش ئایین لەم ڕووەوە بایەخ بە کەسـایەتی مـرۆڤ و شرۆڤـەکردنی دیاردەکـانی دەوروبـەری دەدات، ((ڕەفتـاری تاکەکان دیاری دەکات و شێوازی ژیانیان دەکێشێت و بیروباوەڕیان دروست دەکات و دەروونیـان پـەروەردە دەکـات و کاروبـارە گشـتی و تایبەتییـەکانیان ڕێکـدەخات)) (د.ئیحسان محەمەد ئەلحەسەن، ٢٠١٢: ٢٤) هەر چەندیشە درەووونناسی باسی ئـەوەمان بـۆ ناکات کە ئایین چۆن سەری هەڵـداوە و مـرۆڤ چـۆن ئاینـدار بـووە، بـەڵام لەگـەڵ ئەوەشدا ئەوە روون دەکاتەوە کـە ئـایین چـۆن لـە بیـری مرۆڤەکانـدا کـار دەکـات و ئاراستەیان دەکات و کاریگەرییە دەروونییەکان شیدەکاتەوە (جمـیس داو، ٢٠١٦: ٤-٥). لەم ڕوانگەیەوە (بۆل تیلیش ١٨٨٦-١٩٦٥) پێیوایـە کـە ئـایین لـە ئـەنجامی دوودڵییـەکی گەورە و بنەڕەتییەوە سەر هەڵدەدات، ئەو دوودڵی و ڕاڕاییـە وەکـو وەڵامدانەوەیەکـە بۆ مەسـەلە گرینگـەکانی مانـای ژیـان. لەلایـەن خۆیـەوە (ئـەبراهام ماسلۆ ١٩٠٨-١٩٧٠) لەرێگەی ریزبەندییەکی قووچەکییەوە پێداویستییەکانی مرۆڤی دەستنیشان کرد، ئـەو پێداویستییانەی کە بنەڕەتین بۆ مانەوەی مرۆڤ لە ژیاندا، لەگەڵ ئەوەشدا لە هیچ لـەو پێداویستییانە ئاماژەی بە ئایین نەکردووە وەکو پێداویسـتییەکی بنـەڕەتی بـۆ مانـەوەی

مرۆڤ لە ژیاندا، ئەو پێیوایە کە لێبوردەیی باڵاترین ئاستە کە گرینگ بێت بۆ ئـەوەی مرۆڤ بە ئاشتەوایی بمێنێتـەوە، بۆیـە بـەلای ئـەوەوە تـەرخانکردنی بەشـێکی ژیـانی مرۆڤ بۆ ئایین، دەبێتە هۆکاری بە عەلمانیبوونی بەشەکەی دیکە. بەو واتایەی ماسلۆ باوەڕی بە دابەشکردن و پەرتبوونی ئایینەوە هەیە، کە ئەمەش بەلای کەسانی ئاییـندار رەتکراوەتەوە، چونکە ئـەوان بـە شـێوەیەکی گشـتگیر لـە ئـایین دەڕوانـن. هـەر لـەم چوارچێوەیەشدا (ملفرود أ . سبیرو) زانای هاوچەرخی ئەنترۆپۆلۆژیا پێیوایە کـە ئـەو بەها و داب و نەریتەی کە سەرجەم رۆشـنبیری و شارسـتانەتییەکان لـەبارەی ئایینـەوە هەیانە، بوونەتە هۆکاری ئەوەی ئـایین رێوشـوێنەکانی خـۆی پـەرە پێبـدات و بـەرەو پێشی ببات(روبرت میلتون اندرووت الابن، ٢٠١٦: ٣٤٧ـ ٣٤٨). لێـرەدا دەگەینـە ئـەو ئەنجامەی کە ئایین یەکێکـە لـە بنەڕەتییـە سـەرەکییەکانی ژیـانی مـرۆڤ و بەشـێکی گرینگ لە پێکهاتەی دەروونی و کۆمەڵایەتی مرۆڤ و کۆمەڵگە دروست دەکـات، بۆیە پێناسەکردن و ناسـاندنێکی دیـاریکراو لـەخۆ ناگرێـت، بـەڵکو لـە گۆشـەنیگای جیاواز و بیروبۆچوونی هەمەجۆرەوە سەیری دەکرێت .

١ــ ٢: پێکەوەژیانی ئایینی :

پێکەوەژیان بە واتای ژیان لەسەر بنەمای خۆشەویستی و ئاشـتەوایی لـەنێوان خـــەڵکان دێـــت لـــە چوارچێـــوەی شـــوێنکاتێکی دیـــاریکراودا، زاراوەی (پێکەوەژیان Coexistence) زاراوەیەکە لە زاراوەکانی فەرهەنگی سیاسی کە بەهۆیـەوە گفتوگۆی ئاشکرا و کارکردنی هاوبەش دروست دەبێت و بەهۆیەوە کۆمەڵگە دەگاتە پلەیـەکی بـاڵای گەشەسـەندنی مـەعریفی و شارسـتانی، دیـارە پێکـەوەژیانیش لەکۆمەڵگـەدا گـەلێك جـۆری هەیـە، لـەوانـە پێکـەوەژیانی ئاشـتیخوازانە واتـە رەتکردنەوەی شەڕ وماڵوێرانی و کارەسات و هەموو جۆرە توندوتیژییەك کـە مـرۆڤ و کۆمەڵگە وێران بکات، هەروەها پێکەوەژیانی سیاسی کـە سـنوورێك بـۆ ململانـێ دادەنێـت و هـەوڵی کارلێککـاری ئـەرێنی نێـوان پێکهاتـە و لایەنـەکانی کۆمەڵگـە دەدات، پێکەوەژیانی ئابووری، بە واتای کاری هاوکاری لەنێوان چین و توێژەکـانی کۆمەڵگە. پێکەوەژیانی ئایینی، واتە کارکردن لەپێناو ئاسـایش و سـەقامگیری ژیـانی

تاك و کۆمەڵگە (أ. د. نادیە هناوی، ٢٠١٩: ٩-١٠) . ئەوەی لێرەدا ڕووناکی دەخەینە سەر پێکەوەژیانی ئایینییە، کە کۆمەڵگە بەهۆیەوە دەگاتە پلەیەکی کاریگەری لە لێبوردەیی و سەقامگیربوونی ئاسایش و ڕێزگرتنی ئایینی یەکدی. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە پێکەوەژیان دەلالەت لە کۆمەڵگایەکی فرە تائیفی و ئایینی دەکات کە لەگەڵ یەکدیدا گونجاون و متمانەیەکی بەتین لەنێوانیاندا هەیە، سەرەڕای ئەوەی کە ئەوان لەڕووی بیروباوەڕی ئایینییەوە لەیەکتر جیاوازن، بەڵام توانیویانە ژینگەیەك بهێننەکایەوە کە ئاشتەوایی لەنێوان چین و توێژەکانی کۆمەڵگەی لێ دروست بووە و لە شەڕ و ڕق و کینە و توندوتیژی دوورکەوتوونەتەوە. کەواتە دەتوانین بڵێین کە پێکەوەژیان بە واتای کۆبوونەوەی کۆمەڵێك کەس دێت لە شوێنێکی دیاریکراو، کە ئامرازەکانی ژیان لە خواردن و خواردنەوە و پێداویستییە بنەڕەتییەکانی ژیان بەیەکەوەیان دەبەستێتەوە، ئەمەش بە چاوپۆشی لە ئایین و هەر ئینتیمایەکی دیکە، بەشێوەیەك هەر یەکێکیان دان بە مافی ئەوی دیکە دەنێت، بێ ئەوەی لەناو یەکتر بتوێنەوە و تێکەڵ ببن (رانیا سنجق، ٢٠١٦ :٢). لێرەشدا ئەوە ڕوون دەبێتەوە کە پێکەوەژیان ئەنجامی بوونی ئیرادەی گونجان و یەکتر قبوڵکردنە لەنێوان ئایینە ئاسمانییەکان و شارستانییەتە جیاوازەکاندا، بۆ ئەوەی بەیەکەوە کار لەسەر بەدیهێنانی ئاسایشی جیهانی و بەرقەراربوونی ئاشتەوایی سیاسی و کۆمەڵایەتی لەنێوان چین و توێژەکانی کۆمەڵگە بکەن، بۆ ئەوەی مرۆڤایەتی لە کەشوهەوایەکی ئاشتییانە درێژە بەڕەوتی خۆی بدات و کاری باش ئەنجام بدات، کە دیارە ئەمەش بەهۆی بوونی ئیرادەیەکی ئازادانەی هاوبەش و هاوگونجانێك لە نێوان ئامانج و پەیامەکان و هاریکاریکردن لەسەر کاری هاوبەش و ڕێزگرتنی دوولایەنەی نێوان پەیڕەوکارانی ئەو چین و توێژانە دێتەکایەوە. بەو واتایەی کە دەبێ ئیرادەی بەیەکەوە ژیان لەنێوان هەمووواندا هەبێ، چونکە گەر لایەك شیانی بەیەکەوە ژیانی هەبوو و لایەکەی دیکە نەیبوو، ئەوکات بەیەکەوەژیان دروست نابێت و نایەتە ئاراوە، لە جێگەیدا کاروکردەوەی دژ بەیەك لەجیاتی بەیەکەوەژیان دێتە ئاراوە ((بەو پێیەی هەر کردارێك، دژە کردارێکی هاوشێوەی خۆی هەیە، لەو کاتەشدا توندوتیژی سەرهەڵدەدات، لەگەڵیشدا ئامادەکاری هزری و ڕاگەیاندن و ڕۆشنبیری و ئایدۆلۆژی

بـۆ دەکرێـت)) (د. محمـد سـعید رمضان وآخـرون، ٢٠١٠ :٨) ئـەو توندوتیژییـە هـەموو رایەڵەکانی بەیەکەوەژیان هەڵدەوشێنێتەوە و ئاشتەوایی مەحاڵ دەکات، بۆیە ئیرادەی بەیەکەوە ژیان دەبێت هەمە لایەنانە بێت و لەلایەن هەمووان دەستپێشخەری هەبێت. ئەمەش بەکورتی ئەوە دەگەیەنێت کە پێویستە لەسەر پەیڕەوکارانی ئایینی کار لەسەر ئەو بنەڕەتە بکەن کە دەڵێت : (بژی، لێبگەڕێ ئەوی دیکەش بۆ خـۆی بژیـت). ئـەم بنەڕەتەش چەقی سەرەکی پێکەوەژیانی ئاشتییانەی نێوان ئایینەکان دروست دەکـات و ژیانێکی شایستە بە ئەندامەکانی کۆمەڵگە دەبەخشێت (الـدکتور عبـدالعزیز بـن عـثمان التویجری، ٢٠١٥: ١٣-١٥) بێگومان کۆمەڵگای مرۆیی پێویستی بە جەختکردنەوە هەیـە لەسـەر بـەها مرۆڤایەتییـەکان و بـاوەڕبوون بـە جیـاوازی شارسـتانی و رۆشـنبیری، لەوێوەشـەوە گەیشـتن بـە ژیـانێکی هاوبـەش لـەنێوان گشـت مرۆڤەکانـدا، کـە ئـەم پێکەوەژیانەش ئامانجی بنەڕەتی گشت ئایینە ئاسمانییەکانە، ئەمەش بۆ ئەوەیە تاوەکو ئـایین بـۆ بەرژەوەنـدیی سیاسـی و سـوودی ئـابووری بـەکار نـەهێنرێت و بەهۆیـەوە کوشتن و برین و کاولکاری بەناوی ئایین بێتەکایەوە (محمد مختار جمعه مبروك، ٢٠١٤: ٤). لـەم خاڵـەدا دەگەینـە ئـەو واقیعـەی کـە پێکـەوەژیانی ئـایینی ئـەنجامێکی بەدەستهاتووی فرەیی ئایینییـە، بـەو واتایـەی هـەر کۆمەڵگەیـەك جیـاوازی ئـایینی و بیروڕای جۆراوجۆری ئـایینی تێـدا نـەبێت، بیـر لـە پێکـەوەژیانی ئـایینی ناکرێتـەوە، چونکە چەمکی فرەیی ئایینی خۆی لەو ململانێیـەدا دەبینێتـەوە کـە لـەنێوان خـودی ئایینەکانەوە هاتۆتەکایەوە، کە ئەمەش وا دەکات بیرۆکەی ئایینی جۆرێك لە پیرۆزی رەها و رەتکردنەوەی تەواوی بیروبۆچوونە ئایینییەکانی دیکە لـەخۆ بگرێـت. لەگـەڵ ئەوەشدا هەمیشە بۆ بەدەستهێنانی پێکەوەژیان لە کۆمەڵگەیەکی فرە ئایینیـدا بـەدوای خاڵ و سەرەداوە هاوبەشـەکانی نێـوان ئایینـەکان دەگـەڕێـن بـۆ ئـەوەی بتـوانن هێڵـە گشـتییەکانی ئـەو پێکەوەژیانـەی ئایینییـە دروسـت بکـەن (د. الحـاج دواق، ٢٠١٥: ٦). ئەمەش بۆ ئەو سروشتەی مرۆڤ دەگەڕێتەوە کـە هـەرگیز ناتوانێـت بەتـەنیا و لەگـەڵ خۆیدا بژیت، بێ ئەوەی لەگەڵ تەواوی کۆمەڵگە و ئـەوانی دیکـەدا تێکـەڵ نـەبێت، ئەو تێکەڵبوونەی کە لە یەك کاتدا پرۆسـەیەکی تـەواوکاریی کـارلێککراوە، چونکـە مـرۆڤ ناتوانێـت لـە خـەڵکی دیکـە ئەگـەر جیـاوازیش بـن، دابڕێـت و دەرگـای

بەسەرخۆی دابخات، بەڵکو پێویستی بەوە هەیە لەگەڵ لایەنی دووەم لەسەر بەرژەوەندییەکی هاوبەش، یاخود بینین و پێداویستییەکی هاوبەش ئاڵوگۆڕی خاڵەکانی ژیان بکات و ئاشتەواییەکی کۆمەڵایەتی و سیاسی و ئابووری بهێنێتەکایەوە، کە بەهۆیەوە بتوانێت ئەو ژیانەی ڕەنگاوڕەنگ بکات و ڕێڕەوێکی ئاشتییانەی نێوان چین و توێژەکانی کۆمەڵگە بهێنێتە کایەوە. بۆیە پێکەوە ژیان گرینگترین ئەو زاراوانەیە کە لەناو بازنەی مرۆڤایەتیدا بوونی هەیە و بەهۆیەوە کۆڵەکەیەکی پڕ بایەخی کۆمەڵگە دێتە بوون. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە پێکەوەژیان لەیەك کاتدا بوونی دوو چینی دژ بەیەك لە چوارچێوەی یەك ژینگەدا دەسەلمێنێت، کە پێویست دەکات ئەو ژیانەی نێوانیان ئاشتەوایی بێت و بەیەکەوە پنتەکانی ئەو ژیانە بەڕێوە ببەن، کە دەڵێن پێویستە ژیانی نێوانیان ئاشتەوایی بێت، چونکە گەلێك جار ئەو ژیانەی نێوانیان ئاشتەوایی تێدا ون دەبێت و لەجیاتی ئەو شەڕ و پێکدادان و کاولکاری دێتە بوون. بۆیە پێویستە ئەو ژیانەی نێوانیان لەسەر بنچینەی دەستدرێژی نەکردنە سەر ئەوی دیکە بنیات بنرێت و بەیەکەوە خاڵی هاوبەشی نێوانیان پەرە پێبدەن و بەرەوپێشی ببەن، بەشێوەیەك دەبێت لەلایەن هەردوو لایەنی دژبەیەکی ئایینی، ئیرادەی ئەوە هەبێت ئەو پێکەوەژیانەی خۆیان بەرەو ئاشتی ببەن، نەوەك شەڕ و کوشتار، کە ئەمەش ئەوپەڕی دان بەخۆداگرتن و داننانە بە ئەوی دیکەدا (ا.م.د.عبیر سهام مهدی، ا.م.د.عمار حمید یاسین، ٢٠١٤: ١٠٣). پێکەوەژیانی ئایینی دەکرێت لەم چەند ڕەهەند و لایەنانەوە شیبکرێتەوە و لێی بکۆڵرێتەوە:

**١ـ لایەنی سیاسی:** پێکەوەژیان هەموو لایەك بەدەوری خۆی کۆدەکاتەوە و بازنەیەکی هاوبەش لەنێوان هەموو چین و توێژێکی کۆمەڵگە دروست دەکات، لەبەرانبەریشدا توندوتیژی شکاندنی ئەو بازنە هاوبەشەیە و هەموو لایەك پەرت و بڵاو دەکاتەوە و تۆوی رق و کینە لەنێوانیاندا دەچێنێت. بێگومان لەڕووی سیاسییەوە ڕەهەند و ئاراستەکانی پێکەوەژیان کاریگەری گەورەی لەسەر ڕەوشی کۆمەڵگە دروست دەکات. بەو واتایەی سیستەمی سیاسی وڵات یان دەبێتە هەوێنی بەدیهێنانی پێکەوەژیان، کە بەهۆیەوە کۆمەڵگەیەکی تەندروست و ئاشتیخواز بەرهەم دێت،

یانیش دەبێتە بەدیهێنەری توندوتیژی کە وەکو ئەلتەرناتیڤێك بۆ پێکەوەژیان بەرهەم دێت و بەهۆیەوە ئایینزاکان دژی یەکتر دەوەستنەوە و بەمەش دەسەڵات سوود لەو رق و کینە و رووبەڕووبوونەوانە بۆ مەرامی تایبەتی خۆی وەردەگرێت. کەواتە دەسەڵاتی سیاسی کاریگەری گەورەی لەسەر پاراستنی پێگەی ئایینەکان و دابینکردنی کەشێکی کراوە و لێبوردەیی لە ئەستۆ دەگرێت. دەبێ ئەوەش لەگەڵیدا باس بکرێت کە لەگەڵ دەسەڵاتی سیاسی، دەسەڵاتی ئایینیش کاریگەری گەورەی لەسەر لایەنی سیاسی لەناو کۆمەڵگەدا دەگێڕێت. بۆیە ئەو دوو دەسەڵاتە، دەسەڵاتی سیاسی و ئایینی یەکتری تەواو دەکەن و بەهاوسەنگی راگرتنی نێوانیان دەبنە هۆکاری ئەوەی کە گیانێکی لێبوردەیی لەڕووی سیاسی و کۆمەڵایەتییەوەش بێتەکایەوە ((لێرەوەش گرینگی پێشنیازی کۆنترۆڵی هاوسەنگ دێتە ئاراوە، جا چ لە لایەنی سیاسی یان لایەنی ئایینییەوە بێت، چونکە ئەو کارە رووبەرێك بۆ جووڵانەوەی تاك و گرووپەکان دروست دەکات، رووبەرێك بۆ ئەرکی ئازادییە مرۆڤایەتییەکان، ئەمەش لە ماوەیەکی درێژخایەندا بەبێ پاڵەپەستۆ کردەوەی کۆنترۆڵی خودی دێنێتە ئاراوە، کە تەواو تاکەکان لەسەر کۆك و رەزامەندن، ئەمەش دەبێتە بەهێزترین کار و قووڵترین ئاسەواری دەبێت لە چاو شێوازەکانی کۆنترۆڵی توندڕەوانەدا، کە لە سەرەوە لەسەر کۆمەڵگە سەپێنراوە، واتە لەلایەنی دەسەڵاتی سیاسی یان ئایینییەوە دانراوە)) (یوسف زیدان، ؟، ص٢٢٥). کەواتە هاوسەنگبوونی هەردوو دەسەڵاتی سیاسی و ئایینی دەبێتە هۆکاری بەدیهێنانی ئاشتەوایی و پێکەوەژیانی ئایینی و لێبوردەیی، بە پێچەوانەوە سەپاندنی ڕا و بۆچوونی جیاواز چ لەلایەن دەسەڵاتی سیاسی و دەسەڵاتی ئایینی دەبێتە هۆکاری ئەوەی توندوتیژی بەرهەم بێت و پێکدادانی سیاسی و کۆمەڵایەتی لێبکەوێتەوە. دیارە لەو وڵاتانەی کە دەسەڵاتی سیاسییان گشتگیر و دیکتاتۆرە و رووبەری ئازادییەکان بەرتەسکە، توندوتیژی ئایینی ئامادەیی باشتری هەیە لە پێکەوەژیانی ئایینی و لەهەمان کاتیشدا لەو وڵاتانەی کە دیموکراسین و رووبەری ئازادییەکان زیاتر کراوەیە، پێکەوەژیانی ئایینی ئەنجامێکی ئەو بارودۆخە دەبێت و توندوتیژی ئایینی جێگەی نابێتەوە. بۆیە گەلێك جاران دەسەڵاتی سیاسی بەتایبەتیش لەو وڵاتانەی کە دیکتاتۆر و تاك ڕەهەندن و هەمیشە

لەبارودۆخی شەڕن و ناسەقامگیری سیاسی بوونی هەیە، دەسەڵات بە بەرنامە هـەوڵی دروستکردنی توندوتیژی ئایینی دەدات و لـەپێناو مانـەوەی خـۆی و سـەرکردەکانی، بنەماکانی پێکەوەژیانی ئایینی هەڵدەتـەکێنن و تـۆوی دووبـەرەکی و ئـاژاوە و رق و کینە دەچێنن، بەمەش شەڕ و خوێنڕێشتن دێتەئاراوە و قوربانییەکان لـەپێناو سیاسـەت زۆرتر دەبن، گەلێك جارانیش دەسـەڵاتی ئـایینی خـۆی بەرهـەمی ئـەو توندوتیژییـە دەبێت، لەکاتێکدا لەجیاتی گفتوگۆکردن و ڕێزگرتنی یەکتر، رق و کینـە و بوغزانـدن لـە وتـارە ئایینییەکانـدا لەسـەر پـەیڕەوکارانیان بـڵاو دەکەنـەوە و بەمـەش کارەسـاتی توندوتیژی و شەڕ دروست دەبێت .

**٢ـ لایەنی کۆمەڵایەتی:** لایەنی کۆمەڵایەتی کاریگەری هەرە گـەورەی لەسـەر پێکەوەژیانی ئایینی لەناو کۆمەڵگە هەیـە، چونکـە سیسـتەمی کۆمەڵایـەتی بنچینـە و بناغـەی تێکئـاڵان و تێکـەڵاوبوونی ئەندامـەکانی گشـت ئایینـەکان دەگرێتـەوە، بـەو واتایـەی پەیوەندییـە کۆمەڵایەتییـەکان دەبنـە وابەسـتەی دروسـتبوونێکی ئاشـتەوایی پێکەوەژیانی ئایینی، چونکە تاکەکانی گشت ئایینەکان ڕۆژانە لـە شـەقام و کـۆڵان و دامودەزگاکـانی کۆمەڵگـە و بۆنـە و کۆبوونەوەکانـدا بەریەککـەوتن لەنێوانیانـدا ڕوودەدات و پەیوەندی دەبەستن، بۆیـە پـەروەردەکردنێکی گونجـاو و ڕێزگـرتن لـە بیروڕای جیاواز دەبێتە هەوێنی هێنانەکایەوەی پێکـەوەژیانی ئـایینی، بـە پێچەوانـەوە نـەبوونی پەروەردەیـەکی گونجـاو و ڕێزنـەگرتن و رق هـەڵگرتن و تـووڕەیی دەبێتـە هۆکـاری جیـاوازبوونی ژیـانی ئـایینی و بەهۆیەشـەوە تونـدوتیژی کۆمەڵایـەتی دێتەکایەوە کە ڕەنگە لە توندوتیژی سیاسی کارەساتبارتر بێت و قووڵتر لەناو کایەکانی کۆمەڵگـە بـڕین دروسـت بکـات و چارەسەرکردنیشـی زەحمـەتتر بێـت، چونکـە توندوتیژی ئـایینی ئەگـەر بـەبڕیاری سیاسـی و لەلایـەن دامودەزگاکـانی دەسـەڵاتی سیاسییەوە دروست کرابن، بەبێ ئەوەی لـەڕووی کۆمەڵایەتییـەوە پێشـینە و بنچینـەی هەبێت، کەمتر کاریگەر دەبێت و بەچارەسەری سیاسی و هۆشیاربوونەوەی خەڵك لە پیلانـەکانی دەسـەڵاتەوە دادەمرکێتـەوە، بـەڵام ئەگـەر ئـەو توندوتیژییـە لـە هـەناوی سیستەمی کۆمەڵایەتییـەوە هاتبێتـە ئـاراوە، کاریگەرییـەکان قـووڵتر و دژوارتـر لـەناو پەیوەندییە کۆمەڵایەتییـەکانی کۆمەڵگـە ڕەگ دادەکـوتێ و چارەسەریشـی گـرانتر و

پێویستی بە کاتێکی زۆریش دەبێت. ئەوەی تێبینی دەکرێت لەڕووی کۆمەڵایەتییەوە گرفتی پێکەوەژیانی ئایینی زۆر کەمتر بەرچاو دەکەوێت لەچاو ئەو گرفتانەی کە سیاسییەکان و دەسەڵاتداران بۆ پێکەوەژیانی ئایینی دروستی دەکەن (( ئەوەندەی سیاسەتی هەندێ لە فەرمانڕەواکان لە کۆنەوە تا ئێستا بەهۆی کەموکوڕی لەبەڕێوەبردنی کارەکانیان پەڵەیان خستۆتە سەر سیمای پێکەوەژیانەکە، ئەوەندە سروشتی خەڵك و دینداری و رۆشنبیرییەکەیان گرفت نەبوونە لەبەردەم پێکەوەژیانەکە)) (د. هێمن عومەر خۆشناو، ٢٠١٥ :١٨). بەو واتایەی لەڕووی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان خەڵك بەسروشتی خۆیان ئەگەرچی لەڕووی ئایینیشەوە جیاواز بن، بەڵام لە داب و نەریتە کۆمەڵایەتییەکان ئاشتیخوازن و کەمتر پەنا بۆ رێگەی توندوتیژی دەبەن، بۆیە لە سیستەمە کۆمەڵایەتییەکەدا هاوبەشی و تێکەڵاوبوونێك لە بۆنە و جەژن و داب و نەریت و بازرگانی و هەرەوەزی و کشتوکاڵ ... تاد. بەدی دەکرێت و جۆرێك لە سەقامگیرییێکی کۆمەڵایەتی لەنێوان ئایینزایە جیاوازەکانەوە بەدی دێت .

## بەشی دووەم
## ڕەهەندەکانی پێکەوەژیانی ئایینی لە ڕۆمانی (شیری موسا)دا

ڕۆمـان یەکێکـە لـەو ژانرانـەی کـە پەیوەسـتە بـە واقیعـی ژیـان و کۆمەڵگـە و مرۆڤایەتییـەوە، چونکـە پانتاییـەکی فراوانـی هەیـە و لـە توانایدایـە ئـەو کـەش و بارودۆخەی کۆمەڵگە و واقیعی ژیان ڕەنگڕێژ بکات و دووبـارە واتـا و مەبەسـتی پـێ ببەخشێتەوە بەو پێیەی کە ڕۆمان ((لە واقیعێکی کۆمەڵایەتی دەکۆڵێتەوە و ڕەخنـەی لێدەگرێ و سەردەمەکەی شیدەکاتەوە، بۆیـە دەتـوانین راسـتییەك بەدەسـتبخەین کـە دەڵێت ناکرێ کۆمەڵگە بەبێ مێژوو بێت و هەروەها ناکرێت مێژووش بەبێ کۆمەڵگە بێت، بۆیە ڕۆمان یەکەم هونەرە کە مرۆڤ بەشـێوەیەکی ئاشـکرا هـەروەکو لـە رووی مێژوویی و کۆمەڵایەتییەوە دیاریکراوە، بەرجەستە دەکات)) (شازاد کریم عثمان زیندین، ٢٠٠٦: ٤٦). بەم شێوەیە ڕۆمـان وەکـو ژانرێکـی ئـەدەبی پانتاییـەکی فراوانـی هەیـە و تەواوی لایەن و ڕەهەند و بوارەکانی کۆمەڵگە تێیـدا ڕەنـگ دەدەنـەوە، ئەمـەش وای کردووە کە ڕۆمان ئەمڕۆ ببێتە یەکێك لـە ژانـرە زینـدووەکانی سـەردەم. لێرەشـدا ئـەو پەیوەندییە توندوتۆڵەی نێوان ڕۆمان و کۆمەڵگە بەدیار دەکەوێت، کە هەمیشە ڕۆمان دەروازەیەکی کراوە بووە بۆ ڕەنگدانەوەی گشت بوارەکانی کۆمەڵگە و بەدیارخسـتنی کێشە و گرفتەکانی مرۆڤ، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە پەیوەندییـەکی پتـەو لـەنێوان ڕۆمان و کۆمەڵگە هەبووە، بەشێوەیەك کە ئەو پەیوەندییە لە چوارچێوەی کاریگەری و کارتێکردندا بـووە، لەمەشـدا ڕۆمـان وەکـو ژانرێکـی سـەردەمیانە سـەرقافڵەی ئـەو کاریگـەری و کارتێکردنـەی لەنێوانیانـدا گرتـووە و توانیویـەتی وەکـو ژانرێکـی گێڕانەوەیی ڕووماڵی گشـت بوارەکـانی کۆمەڵگـە و دەرخسـتنی کێشـە و گرفتـەکانی مرۆڤ بکات و چارەسەرییان پێشکەش بکات. ئەگـەر لـەمێژووی ڕۆمـان وردبینـەوە دەبینین ئایین و کێشەکانی بەشێکی گرینـگ لـە نـاوەڕۆکی ڕۆمانـەکان پێکـدەهێنن، هـەر بـۆ نموونـە یەکـەم ڕۆمـانی پیکارسـیك لـە ئـەدەبی ئیسـپانی بـەناوی (لازاریلـۆ تۆرمس)ە لەبەر ئـەوەی ڕەخنەیـەکی تونـد لـە سیسـتەمی ئـایینی دەگرێـت، لەلایـەن پاشای ئیسپانیاوە قەدەغە دەکرێت (عەلی عوسمان، ٢٠١٩: ٦٣) لەم ڕوانگەیـەوە لایـەنی

ئـاییني، لایـەنێکی دیـار و بـەرچاوی کۆمەڵگەیـە و کاریگـەری و کـارتێکردنێکی گەورەی لەسەر ژیانی تاکەکانی کۆمەڵگـە هەیـە و ئاراسـتەکەری بەشـێکی گرینگـی پەیام و مەبەستەکانی ژیاری و شارستانی لە ئەستۆ گرتووە، بۆیە ڕۆمان وەکو ژانرێکـی سەردەمیانە خۆی لە قەرەی ئەو بابەتە گرینگە داوەو ڕەهەند و لایەنەکانی دەرکردووە. بەتایبەتیش لە کۆمەڵگەی کوردیدا کـە زیـاتر کۆمەڵگەیـەکی نەریتگـەرا و قـەدەری دواکەوتووانەیە کە تێیدا ئایین ڕۆڵـی گـەورە لـە ژیـانی تـاکی کـورد وازی دەکـات و بەشێکی گرینگ لە بنەماکانی کۆمەڵگەی کوردی پێکدەهێنێت. لەم ڕووەوە ڕۆمانی (شیری موسا)ی سابیر ڕەشید بەیەکێك لەو ڕۆمانانـە دادەنرێـت کـە مەسـەلەی ئـایین بووەتە بنچینە و بنەمای پێکهێنانی ڕووداوەکانی، بەتایبەتیش کـە ئـاییني جولەکـە و پێگە و بەهای ئەو ئایینە لـە کۆمەڵگـەی کوردیـدا بـەرچاو دەخـات و پـەردە لەسـەر ژیـانی جووەکـانی نـاو کۆمەڵگـەی کـوردی لادەدات، لـەو ڕۆمانـەدا نموونـەی کۆمەڵگەیی لە شارۆچکەی شەقڵاوە و سەنتەری شاری هەولێر وەرگیراوە، بەو پێیەی زۆرترین ژمارەی جولەکـە لـەو شـارە و لـە قـەزا و ناحیەکانیـدا ژیـاون، لەوێوەشـەوە ڕۆماننووس هەوڵی داوە وردەکارییەکانی ئەو پێکەوەژیانە ئایینییەی کە لە شـەقڵاوە و سەنتەری شاری هەولێر هەبووە شـەنوکەو بکـات و ڕادەی سـەرکەوتوویی و کێشـە و گرفتەکانی بخاتەڕوو. ناونیشانی ڕۆمانەکە گرینگییەکی زۆری هەیـە، چونکـە خـودی ناونیشانەکە ئاماژەیە بۆ ئایین و نـاوی (موسـا)ی پێغەمبـەر دەبێتـە کلیلـی تێگەیشتنی دەقەکە، چونکە ئاماژەیە بۆ ئاییني جولەکە، کەواتە ناونیشـان جگـە لـەوەی ئایینییـە، ئاماژەشە بۆ پەیڕەوکارانی توێژێکی دیاریکراو لـەناو کۆمەڵگـە، بەمـەش ڕۆمـاننووس هەر لە ناونیشانەوە مەبەست و کرۆکی کارەکەی خـۆی ئاشـکرا کـردووە و سـەرنجی خوێنەری بۆ ڕاکێشاوە. بۆ لێکۆڵینەوە لەم ڕۆمانە بە پێویستی دەزانـین لـەم لایەنانـەی خوارەوەدا ئاماژە بە پێکەوەژیانی ئاییني لە ڕۆمانەکەدا بکەین:

**٢ـ ١: لایەنی سیاسی:**

دەسەڵات کاریگەری گەورەی لەسـەر مەسـەلەی پێکـەوەژیانی ئـاییني هەیـە، چونکە دەسەڵات دەتوانێت سنوورەکانی ئـەو پێکـەوە ژیانـە بپارێزێـت و لەڕێگـەی

هێنانەدی ئاشتەوایی کۆمەڵایەتییەوە ڕێز و ستایشی نێوان تاکەکانی کۆمەڵگە بەبێ لەبەرچاوگرتنی جیاوازی ئایینی و نەتەوەیی و ڕەگەزی، پێکەوەژیان فەراهەم بکات، بۆیە دەسەڵات کاتێك یاسا بەرقەرار دەکات و شکۆی دەوڵەت بەسەر تەواوی کۆمەڵگە دەسەپێنێت، ئەوا لەم ڕێگایەوە پێکەوەژیانی ئایینیش دێنێتەکایەوە. بۆیە دەسەڵات ئەگەر دیموکراسی بێت، باشتر و گونجاوتر دەتوانێت پایەکانی ئاشتەوایی کۆمەڵایەتی و سیاسی و ئایینی....تاد، لەوڵاتدا بچەسپێنێت، بەمەش پێکەوەژیانی ئایینی بەتایبەتیش لەو کۆمەڵگەیانەی کە فرە ئایینن، دەبێتە ئەمری واقیع و خەڵکی لە بەرهەمەکەی دەخۆن. بە پێچەوانەوەشەوە دەسەڵاتێکی دیکتاتۆر و ستەمکار بۆ مانەوەی خۆی و درێژەدان بە حوکمڕانییەکەی هەمیشە هەوڵی نانەوەی جیاوازی و جیاکاری لەنێوان چینەکانی کۆمەڵگەکەی دەدات و بەیەکترەوە سەرقاڵیان دەکات و شەڕیان پێدەکات، بێگومان بۆ گەیشتن بەو مەبەست و ئامانجەش گشت ئامرازەکان بەکاردەهێنێت، یەکێك لەوانەش بەکارهێنانی هەستی ئایینی و جیاوازی ئایینییە کە دەبێتە هۆکاری ئەوەی شەڕی مەزهەبی و توندوتیژی ئایینی لێ بکەوێتەوە، ئەمەش بنچینەی تێکدان و نەهێشتنی ڕێزو بەهایە لەنێوان ئایینزایە جیاوازەکانی کۆمەڵگە، کە بەرۆڵی خۆی پێکەوەژیانی ئایینی دووچاری شکست و لەناوچوون دەکاتەوە. لەم ڕوانگەیەوە لە ڕۆمانی (**شیری موسا**)ی (**سابیر ڕەشید**) ڕووبەڕووی دەسەڵاتێکی ستەمکار دەبینەوە کە خۆی لە دەسەڵاتی پاشایەتی لە عیراق دەبینێتەوە، ئەو دەسەڵاتەی بۆ مانەوەی خۆی پەنای بۆ هەموو جۆرە کاروکردەوەیەك بردووە، لەوانەش پشتگیریکردن لە چینی ئاغا و دەرەبەگەکان و چاوپۆشیکردن لە تەواوی ئەو کاروکردەوانەی ئەو چینە دژ بە خەڵکی ڕەش و ڕووت و هەژار، بەتایبەتیش دژ بە ئایینزایە کەمینەکانی وڵات. لەم ڕووەوە ڕۆماننووس لەدووتوێی ڕووداوەکانیدا ئاماژە بە بارودۆخی جولەکەکان کە وەکو کەمینەیەك بوونە لە شارۆچکەی شەقڵاوە دەکات کە بەهۆی ئاغاکانەوە سەرانەیان لێ وەرگیراوە و لەبەرانبەریشدا نەك هەر ژیانیان نەپارێزراوە، بەڵکو دووچاری کوشتن و بڕین و گرتن و زیندانیش بوونەتەوە. ڕۆماننووس ڕاستەوخۆ باسی لە تاوانی کوشتنی (زوهرە)ی کچە جوو دەکات بە دەستی ئاغاکانەوە (( **ڕۆستەم ئاغا لەم قسانەدا خراتر بوو و قینی خۆی بە**

**هەردووکیاندا هەڵڕشت . چاوەکانی سوورهەڵگەڕان و هەستی شەڕانگێزی بەسەریدا زاڵ بوو، دەمانچەکەی لەبەر پشتی خۆی دەردێنێ، سنگی زوهرە دەکاتە ئامانجی گوللەیەک))** (شیری موسا ل ٢٠)، ئەمەش لەبەر ئەوەی کە (رۆستەم ئاغا) چاوی بڕیوەتە (زوهرە) و بە زۆر دەیەوێت بیهێنێت و بیکات بە موسڵمان، دیارە ئەم کارانەشی لەپێناو ئایین نەبووە، بەڵکو لە پێناو بەرژەوەندیی تایبەتی خۆی بووە و ئایینی کردۆتە ئامراز، لەمەشدا دەسەڵات پشتگیری کردووە، بێگومان ئاغا و دەرەبەگەکان هەر بەوەش نەوەستان بەڵکو (مامۆستا یونان)یشیان کوشت، کە یەکێك بوو لە جوولەکە رۆشنبیرەکانی شەقڵاوە، سەرەڕای ئەمانەش ئاماژە بە کەمینەی مەسیحی کراوە لە شارۆچکەی شەقڵاوە کە ئەوانیش لەژێر زوڵم و ستەمی دەسەڵات و دەست و پێوەندەکانی بوونە، لە دیمەنێکی دیکەی رۆمانەکەدا تاوانێکی (کەمال ئاغا) دژی مەسیحییەك باس دەکرێت کە بەشێوەیەکی دڕندانە دەکوژرێت، ئەویش بەهۆی ئەوەی کە داوای لە (گۆرگیس) کردبوو، کە وەستایەکی دەستڕەنگینی خانوو بوو، کاری بۆ بکات، بەڵام ئەو لەبەر ئەوەی کاری فەرمانگەی هەبووە لە هەولێر رەتی کردۆتەوە هەمان رۆژ بچیت، لەبەرانبەردا بەم شێوەیە سزای دەدرێت **(( ئاغاش لە جێی خانووە نوێیەکەی دەبێت بە خزمەتکارەکانی قەبرێك هەڵدەکەنێ و بەزیندوویی دیانی بێ چارە دەخاتە ناو گۆڕەوە ، هەر چەندە قوڕبەسەرەی هاوار دەکات و دەڵێ: ئاغا من کردم تۆ نەیکەی پەشیمان بوومەوە، بەڵام ئاغا دەڵێ: نەخێر تۆ ئەو پیاوەی قسەی من بشکێنی، بڕیاریدا بە زیندوویی خۆڵی بەسەردا بکەن، دیانی فەقیریش هەر هاوار دەکات تا نەفەسی تێدایە بەرگری لە ژیان دەکات تا بێدەنگ دەبێت))** (شیری موسا، ل ٢٢-٢٣)، ئەم تاوانانە هەر تەنیا لەدژی ئایینی جوولەکە و مەسیحی لەلایەن ئاغا و دەست و پێوەندەکانیانەوە ئەنجام نەدراوە، بەڵکو لەدژی موسوڵمانانیش بووە، ئەوەتا کاتێك ( حاجی عەلی ) دەمرێت، ئاغا داوای پارەیەکی زۆر دەکات تا مۆڵەتی ناشتنی بدات **((پیاوانی ئاغا ناهێڵن بەخاکی بسپێرن ، پێیاندەڵێن ( تا دووسەد لیرە نەدەن ناهێڵین بینێژن) ئەوانیش هەر چەندی دەکەن و دەچنە لای پۆلیس و شکایەت دەکەن کەس لێیان نایەتە دەنگ، چونکە بەڕێوەبەری پۆلیس و بەڕێوەبەری ناحیەش هەموو ئاڵقەی دەستی ئاغا و بەگزادەکان بوون))**

(شیری موسا، ل ٢٢) ئەوەی روونە کە ئەم تاوانانە لەبەردەم چاوی دەسەڵاتەوە ئەنجام دران، کە دیارە دەسەڵات بەشێوەیەکی ناراستەوخۆ پشتگیری لەو جۆرە کارانەی دەکرد و لەهەمان کاتیشدا تەواوی دامودەزگای حکومەتیش لە شارەکە هەر لە ژێر دەسەڵاتی ئاغا و دەرەبەگەکان دابوو. ئەمەش ئەوە روون دەکاتەوە کە خەڵك و هاوڵاتیان هەستیاری ئایینی و ململانێی ئایینییان بەوشێوەیە نەبووە و کێشەو گرفتی ئایینی بوونی نەبووە، بەڵکو بە پێچەوانەوە دەسەڵات و دەست و پێوەندەکانی توندوتیژییان لەبەرانبەر هەموو ئایینزاکان بێ جیاوازی ئەنجام داوە. ئەوەتا لەدیمەنێکدا کە باس لە ڕێورەسمی ناشتنی (مامۆستا یونان) دەکات، ئەو راستییە خراوەتەڕوو کاتێك کە خەڵك و چین و توێژەکان پێشبڕکێیان دەکرد لەسەر ئامادەبوون لە مەراسیمی ناشتنەکە، ئەوا ئاغاکانیش بیریان لەوە کردەوە ((**کە لەسەرەوە و بە رواڵەت پیاوانی خۆیان ناردە ناو خەڵکەکە و لەژێرەوەش پۆلیسیان بەگژ خەڵکەکەوە هاندا، چونکە دەسەڵاتی شار ئەگەرچی بە ڕواڵەت لەدەست میری و پۆلیس بوو بەڕێوەبەری ناحیە و پۆلیس هەبوو وەك شاریش حاکم و ئیدارەی هەبوو، بەڵام هەموو ئەم دارودەستانەی ئیدارەی میری لە ژێرەوە ئەڵقە لە گوێی ئاغا و بەگزادەکان بوون**)) (شیری موسا، ل ٥٩-٦٠)، ئەمەشیان بۆ ئەوە بوو کە ئەو یەك دەنگی و یەکڕیزییە ئایینییەی نێوان خەڵك تێکبدەن و بیشێوێنن. ئەم کردەوانەی دەسەڵات ئەگەرچی بە ناراستەوخۆش بوو، بەڵام لەراستیدا بۆ ئەوە بوو کە متمانەی نێوان پێکهاتە ئایینییەکانی تێکبدەن، هەر چەندە لە ئاستی هاوڵاتیبوونەوە خەڵکێکی زۆر دژی ئەو کارەی دەسەڵات و ئەڵقە لە گوێیەکانی بوون و تەنانەت پیاوانی ئایینی ئیسلام و مەسیحیش، ئەوانەی کە خاوەن عەقڵییەتێکی کراوە بوون دژی ئەو کارە بوون و لە ریورەسمی ناشتنەکەش بەشدار بوون، بەڵام ئەو کاروکردەوەیە کاریگەری گەورەی لە سەر دەروونی جوولەکەکان دانا و بەهۆیەوە بنەماڵەی (ئیسحاق) شارۆچکەکەیان بەجێهێشت و هاتنە هەولێر. ئەو کاروکردەیەی دەسەڵات ئامانجی بە پێکدادانی ئایینزاکان بوو بۆ ئەوەی لەڕووی سیاسییەوە بەردەوامی بە حوکمڕانی خۆی بدات و لەهەمان کاتیشدا بەشێك بوو لە بیری عەرەبی نەتەوەپەرستی کە دژی جوولەکەکان بوون، هەر ئەم بیرەش وای لەدەسەڵات کرد بە یەکجاری کۆتایی بە

بوونی جوولەکە لە عیراق بهێنێت و شاربەدەریان بکات (( **کاتێ کە دەوڵەتی ئیسرائیل دامەزرا ئەمە بۆ جوولەکەی عێراق کاردانەوەیەکی لای خەڵکەکە دروستکرد کە رقیان لە جوولەکە ببێتەوە و چەندان سەرکردە و کەسایەتی دیاریان گیران، زۆربەی خەڵکەکە دەستیان بە تالآن و لێسەندنی پارە و کەلوپەلەکانیان کرد، قوتابخانەکان جوولەکەیان تێدا نەما، زۆریشیان کۆچیان کرد، تا حکومەتی عێراقی هەر لە ساڵی ١٩٥٠ کە یاسای دەستبەسەرداگرتنی موڵك و ماڵی یەهوودییەکانی دەرکرد وایکرد یاسایەکی تریش دەربکەن کە هاوشێوەی ئەم یاسایە بێت ئەویش یاسای لێسەندنەوەی رەگەزنامەی عێراق ساڵی ١٩٥٠ و وای لێکردن بە زۆر کۆچیان پێبکات**)) (شیری موسا، ل ١١٢). ئەم کاروکردەوانەی دەسەڵات لە بنەڕەتەوە پێکەوەژیانی ئایینی لە عێراق دووچاری مەترسییەکی گەورە کردەوە، بەتایبەتیش لە کوردستان کە هیچ جوولەکەیەك بوونی نەما، هەر چەندە خەڵکی کوردستان لەگەڵ جوولەکەکان هیچ کێشەیەکیان نەبوو، کەچی بەهۆی بڕیاری سیاسییەوە ئەو پێکەوە ژیانە لەگەڵ جوولەکە کۆتایی پێهات. ئەمەش رۆڵی خراپی دەسەڵات لە چارەنووسی پێکەوەژیانی ئایینی لە ناو کۆمەڵگە پیشان دەدات و هەروەها ئەوپەڕی توندوتیژی جەستەیی و دەروونی رێکخراو کە لەلایەن دەوڵەتەوە پیادە کرابێت، پیشان دەدات و بەمەش ژیانی ئایینی کۆمەڵگەی عیراق و کوردستانیان شێواند و خەڵکیان لە یەکدی دابڕاند. دیارە کە توندڕەوی ئایینیش یەکێکە لەو بەربەستە هەرە سەختانەی کە رووبەڕووی پێکەوەژیانی ئایینی دەبێتەوە، چونکە توندڕەوی ئایینی بنەماکانی پێکەوەژیان هەڵدەتەکێنێ و لەجێگەی ئەوەدا توندوتیژی و رق و کینە تا رادەی کوشتن و بڕین دادەمەزرێنێت. سەرەڕای هەموو ئەو شێوە جیاوازییانەی توندڕەوی ئایینی کە رۆماننووس لە رۆمانەکەیدا ئاماژەی بۆ کردووە، وەکو کوشتنی (زوهرە) و(مامۆستا یونان) و بە کەم سەیرکردنی ئایینزاکانی دیکە، بەڵام دەبێ ئەو خاڵە گرینگە روون بکەینەوە کە ئەو توندڕەوییە ئایینییە خۆرسکانە لەناو کۆمەڵگەی کوردی نەبووە، بەڵکو دروستکراوە، ئەوەتا رۆماننووس لەزاری (ئیسحاق)ی جوولەکەوە ئاماژە بەو راستییە دەدات (( **ئێمە وەکو موسڵمان و دیان و جوو رەفتارمان لەگەڵ یەکتر نەدەکرد، بەڵکو وەکو دراوسێی یەك نەتەوە رەفتارمان دەکرد،**

**ئەگەر چی لە ئاینیشدا لێکتر جیاوازبووین، هەرگیز هیچ لایەکیان بە ئێمەیان نەدەگوت: دینی ئێمە لەسەر هەقە و هی ئێوە ناتەواوە و هەو نییە و وەرنە سەر دینی ئێمە))** (شیری موسا ل١٥). کەواتە ئەو هەستە توندڕەوییە لەناو کۆمەڵگەی کوردی دروستکراو بووە، کە لەو ڕۆمانەدا بە ئاشکرا ئەو لایەنانەی کە ئەو هەستی توندڕەوییە ئایینەیان دروستکردووە، دیاریکراون، لەوانەش چینی ئاغا و دەرەبەگەکان کە بۆ بەرژەوەندیی خۆیان پەنایان بۆ ئەو جۆرە کارە بردووە، لەوانە ماڵی ئاغا و دەرەبەگەکانی شەقڵاوە لە کوشتنی (مامۆستا یونان)دا ئەنجامیان دا، هەروەها بارودۆخی نێودەوڵەتیش ڕۆڵی هەبووە لە بڵاوبوونەوەی ئەو توندڕەویی ئایینییە، بەتایبەتیش لەو سەردەمانەدا بیروڕای نازی کاریگەری هەبووە کە دژی جوولەکەکان بووە، سەرەڕای ئەمەش بیروڕای ئیسلامی سیاسیش ڕۆڵی خۆی گێڕاوە، بۆ نموونە لە هەولێر حزبی ئیسلامی کاریگەری هەبووە لەسەر کردنەوەی ئاگری نەورۆز (( **دەڵێن هەندێك لە خەڵکی هەولێر بەقسەی حیزبێکی دینی بەناوی حەرامەوە چەندان خێزانی لە ئاگرکردنەوە و بەدیار ئاگرەوە دوور دەخستەوە))** ( شیری موسا ل٦٥).

سەرەڕای ئەمانەش دەسەڵاتی سیاسی کاریگەری یەکجار زۆری هەبووە لە بڵاوبوونەوەی توندڕەوی ئایینی و چەوساندنەوەی ئایینزاکان، ئەمەش بۆ درێژەدان بە حوکمگێڕانی خۆی لەڕێگای دروستکردنی جیاوازی و توندڕەوی ئایینی و نەتەوەیی بۆ ئەوەی خەڵك بیر لە گۆڕینی و لادانی دەسەڵاتدارەکان نەکەنەوە، بەڵکو هەمیشە لەناو خۆیاندا خەریکی شەڕ و ئاژاوە بن، بەمەش دەسەڵات هەم لە لایەکەوە پارێزگاری لە حوکمی خۆی دەکرد و هەمیش خۆی بە پشتگیریکردن لەلایەك دژی لایەکی دیکە درێژەی بەو حوکمڕانییە دەدا .

**٢ـ ٢: لایەنی کۆمەڵایەتی:**

کۆمەڵگەی کوردی کۆمەڵگەیەکی فرە ئایینییە، ئەمەش وای کردووە هەر لە زووەوە جۆرێك لە پێکەوەژیان و یەکتر قبوڵکردنی بەرامبەر بێتەکایەوە، بەتایبەتیش کە بوارەکانی ژیان و کارکردن ئەو جۆرە پێکەوەژیانەی نێوان ئایینەکانی پێویست بووە و خۆی فەرز کردووە، بۆیە لە کۆمەڵگەی کوردیدا زۆر بەدەگمەن توندوتیژی

ئایینی و شەڕ و ئاژاوەی ئایینی و مەزهەبی دەبینرێت و زیاتر کۆمەڵگەیەکە لەڕووی ئایینییەوە کراوەیە، ئەمەش بە ئاشکرا لەم رۆمانەدا بەدی دەکرێت، کاتێك رووداوی سەرەکی باس لە بنەماڵەی (ئیسحاق)ی جوولەکە دەکات لە شارۆچکەی شەقڵاوە، هەر لە سەرەتاوەش دیمەنی رووداوەکە بەوە دەستپێدەکات کە (ئیسحاق) لە یەکێك لە گازینۆیەکانی شاری عەممانی پایتەختەی ئەردەن خۆی بە چەند کوردێکی خەڵکی هەولێر دەناسێنێت (( **ناوم (ئیسحاق موشێ)یە و لە ئیسرائیلەوە هاتووم، بازرگانم، بەڵام بۆ گەشت هاتوومەتە عەممان، بە ئەسڵ هەولێریم و تەعجیلیم** )) (شیری موسا ل ٦)، ئەم سەرەتایە بەم شێوەیە کە شانازی بە ڕەچەڵەك و زێدی خۆی بکات و حەز بکات کە لەگەڵ خەڵکی وڵاتە کۆنەکەی خۆی ئاشنایەتی پەیدا بکات، بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە ئەو کارەکتەرە و کەمینەکەی هیچ رق و کینەیەکیان لەبەرانبەر خەڵکی وڵاتە کۆنەکە لەدڵدا نییە و بە پێچەوانەوە ئەوان لەوە گەیشتوون کە بڕیاری دەرکردنیان، بڕیارێکی تەواو سیاسی بووە و هیچ پەیوەندی بە لایەنی ئایینی و کۆمەڵایەتی و ئابوورییی...تاد نەبووە. هەروەها گوزارشت لەوەش دەکات کە پێکەوەژیانێکی بەهێز لەنێوان ئەو پێکهاتە ئایینییانە هەبووە، بەشێوەیەك لەدوای دوورکەوتنەوەش لەیەکدی هەمیشە حەزیان بە یەکدی کردووە و شانازییان بە پێکەوەبوون کردووە، ئیدی لەو خاڵەوە رۆماننووس باسی ئەو جۆرە پێکەوە ژیانە دەکات کە لە هەولێر و شەقڵاوە لەگەڵ موسوڵمانەکان و مەسیحییەکان هەیانبووە، ئەوەتا پەیوەندییەکی هاوڕێیەتی و دروازسێیەتی زۆر بەتین لەنێوان ئەو بنەماڵە جوولەکەیە لەگەڵ هەر یەك لە بنەماڵەی موسوڵمانی ساڵح ملخوار و بنەماڵەی مەسیحی مەنسووری دیان هەبووە، ئەو پەیوەندییە کۆمەڵایەتییە لەکاتی کوشتنی (مامۆستا یونان)دا دەگاتە ئەوپەڕی بەهێزی و ئەو دوو بنەماڵەیە ژیانی خۆیان لەپێناو پاراستنی مامۆستا یونان دەخەنە مەترسی و خۆیان دەکەنە بەربەستێك بۆ ئەوەی ئاژاوەگێڕەکان و پیاوانی ئاغا نەگەنە گیانی مامۆستا و ئازاری بدەن. لەدوای کوشتنی مامۆستا یونانیش بەتایبەتیش لە کاتی ناشتنی تەرمەکەیدا رۆماننووس تابلۆیەکی جوان و سەرنجڕاکێشی ئەو پێکەوەژیانە ئایینەی لە کۆمەڵگەی کوردیدا کێشاوە، کاتێك مەراسیمی ناشتنەکە بە ئامادەبووانی پیاوانی ئایینی ( قەشە جبرائیل و مەلا تەها

مامەجەلکەیی و مەلا تەقییەدین) و جەماوەری شارەکە لە هەموو ئایینەکانەوە بەشدارییان تێیدا کرد ((**ڕێوڕەسمەکە وا دانرا کە چەند ئوتۆمبێلێك دوای پەستەکەی تۆماس کە هەڵگری تەرمەکە بوو بە پەڕۆی ڕەش داپۆشرێن، دوای پەستەکەی تۆماس کە هێمای کریستیانەکانی شەقڵاوە بوو و هەموو پێکهاتە ئایینییەکانیش سواری پەستەکەی ببوون بۆهەمووان وەك یەك بوو، دوای پەستەکەی تۆماسیش ئوتۆمبێلی میری هەژاران بوو کە هەردوو مامۆستای هەڵگرتبوو، مەلا تەقییەدین و مەلا تەهای مامەجەلکەیی، دوای ئەویش ئوتۆمبێلی قەشە جوبرائیل شێر بوو کە ئەویش هێمای ئایینی کریستیانەکانی شەقڵاوە و لێبوردەیی ئایینی مەسیحی بوو لەو شارە، دوای ئەویش ئوتۆمبێلی سیمۆن و کریکۆر و ئاگۆب و مستەقوت بوو**)) (شیری موسا ل ٦). ئەمەش سەلمێنەری ئەوەیە کە کۆمەڵگەی کوردی لەڕووی کلتووری و داب و نەریتەوە، کۆمەڵگەیەکە دوور لە توندوتیژی ئایینییە و هەر لە دێر زەمانەوە مەڵبەندی ئاینزایەکان بووە و جۆرێك لە پێکەوەژیانی ئایینی لەنێوان تاکەکانیدا هەبووە، ئەوەی کە دەمێنێتەوە لەلایەکەوە ئەگەر تاوان و خراپکارییەك کرابێت، ئەوا بە فیتی دەسەڵات و داروەدستەکەی بووە، کە ئەمەش سنووردار بووە و کاریگەری لەسەر تێکدانی ئەو جۆرە پێکەوەژیانەی لەڕووی کۆمەڵایەتی و ئابوورییەوە بەسەر کۆمەڵگە و تاکەکانی نەبووە، لەلایەکی دیکەشەوە لەڕووی ئایینییەوە بەهۆی پەیڕەو و بۆچوونەکانی هەر ئایینێك ئەو جۆرە توندوتیژی و لێکدابڕانە هەستی پێدەکرێت، کە ڕۆمانووس لە دوو نموونەی زەقدا بەرچاوی خستووە، کاتێك کارەکتەری سەرەکی (ئیسحاق) کە جووە پەیوەندی خۆشەویستی لەگەڵ (نەخشین)ی دراوسێیان کە موسوڵمانە دەبێت، لێرەدا ئایین و سنوورەکانی بیر و بۆچوونەکەی دەبێتە بەربەستێکی گەورە و تەنانەت جۆرێك لە توندوتیژیشی لێدەکەوێتەوە، ئەو سنوورە ئایینییە لە زاری باوکییەوە دەخرێتە ڕوو ((**کوڕم خۆت دەزانی ئەوان موسوڵمان و ئێمەش جوولەکە، تخوویێکی زۆر گەورە ، بەڵکو زەندۆڵێکی گەورەشمان لەنێواندایە، وەڵا نەك زەندۆڵ بگرە خەرەندێکی گەورەشمان لە نێواندایە وەك خەرەندی ڕەواندزێ گەورە و فراوانە**)) (شیری موسا ل٩٧) . لەنموونەیەکی دیکەشدا ڕۆمانووس بە پێچەوانەوە پەیوەندییەکی خۆشەویستی لەنێوان کوڕە

موسوڵمانێك و فەرحە کچی بنەماڵەی جوولەکان بوو، کە هەر چەندە ئەو پەیوەندییە خۆشەویستییە دەبێتە پەیوەندییەکی خێزانداری، بەڵام بـەزۆرەملێ و هـەڵگرتن بـووە، بـەو واتایـەی بنەماڵـەی (فەرحـە) بـەو خێزانداریيـە رازی نەبوونـە، چونکـە لـەڕووی ئاینییەوە جیاواز بووە و ئەمەش بووەتـە هـۆی ئـەوەی لێکترازانـی خێزانـی لـە نێـوان فەرحە و بنەماڵەی لێبکەوێتەوە (( **دایکی فەرحە چەندی تکا لە ئیسحاق دەکـات بـا رازی بێت هاتوچۆی یەکتر بکەن، بەڵام ئەو روو لە دایك و باوکی سیامەند دەکات و دەڵێ: نەخێر تازە ئەو لە خێزانی ئێمە چووە دەرەوە، تازە ئەو خێزانی ئێوەی هەڵبژارد و کوڕەکەی ئێوەی هەڵبژارد، ئێمەش هیچمان پێناکرێ و دەسەڵاتمان نییە و کەسیش ناکوژین، بەڵام بڕۆن لە یاخەمان بینەوە و حەواڵەی خواتان دەکـەم** )) (شیری موسا ل ١٠٤). لەم دوو نموونەیەی پەیوەندی کۆمەڵایەتیدا پێکەوەژیانی ئایینی بەهۆی بیـرو بۆچوونە توندە ئاینییەکانـەوە دووچـاری مەترسـی بۆتـەوە و هێڵێکـی جیاکـەرەوەی لەنێوان بنەماڵەکاندا کێشاوە. دیارە ئەو جۆرە بیروبۆچوونە ئاینییانە لـە تێکەڵنـەبوونی بنەماڵەکان سەرکەوتوو بوونە، بەڵام بەشێوەیەکی گشتی لە کاروباری رۆژانـە و ژیـانی گشـتی کۆمەڵایەتیـدا ئـەو کاریگەرییـەی نـەبووە و پێکـەوەژیانی ئـایینی نـە بـە بیروبۆچوونی تەسکی ئایینی و نە بەهەوڵ و تەقـەلای دەسـەڵات و دارو دەسـتەکەی تێکنەچووە، بە پێچەوانەوە جۆرێك لە گونجان و رێزگرتنی بەرانبەر و پەیوەندییـەکی دروسـتی هاوڕێیـەتی و دراوسـێیەتی لـەنێوان ئاینزایـە جیاوازەکـان لـە کۆمەڵگـەی کوردی دەبینرێـت. لەگـەڵ ئەوەشـدا ئەگـەر سـەیری رووداوەکـانی رۆمـانی (شـیری موسا) بکەین لە بوارێکی زۆر تەسکدا توندڕەوی ئـایینی دەبینـین، ئـەو توندڕەوی ئاینییـە لەگـەلێك دیمـەن و بەسـەرهاتی نـاو دەقەکـەدا رەنگڕێـژ بـووە، کـە زیـاتر دەسـەڵاتی سیاسـی دەسـتی لـە دروسـتکردنی هـەبووە، بـێ ئـەوەی کاریگەرییـەکی ئەوتۆی لەسەر پێکهاتەی کۆمەڵایەتی هەبێت و بە پێچەوانەوە هەموو ئاینەکان دژی بوونە، لەوانەش بەشێك لەو توندڕەوییە جەستەیی و بە خوێنڕشتن و کوشـتن کۆتـایی دێت، وەکو کوشتنی (زوهرە)ی جوو کـە بەدەسـتی (رۆسـتەم ئاغـا)وە دەبێـت، هـەر چەندە ئەو کوشتنە بەهۆی رەتکردنەوەی ئەو هەستە خۆشەویستییە بووە کـە رۆسـتەم ئاغا بۆی هەبووە، بەڵام لەهەمان کاتیشدا جووبوونی زوهرە کاریگەری هەیە، چونکـە

هیچ پشت و پەنایەکی نییە، چونکە کەمینەن و بۆ مانەوەی خۆیان پەرچەکرداریان نییە. بەڵام لەڕووی کۆمەڵایەتییەوە هەندێك جار توندوتیژی ئایینی لە زارەکی تێپەڕی نەکردووە، هەر چەندە ئەو توندوتیژییەش باش نەبووە، بەڵام کاریگەری لەسەر سیستەمی پێکەوەژیان و ڕێزگرتنی کۆمەڵایەتی بەو شێوەیە نەبووە، بۆ نموونە موسڵمانەکان وەکو ترسنۆك سەیری جوولەکەکانیان دەکرد(( **ئەمەش لەنێو موسڵماناندا ببوو بە ئیدیۆمێك کە ناوی ئێمەیان وەك ترسنۆك لە قەڵەم دەدا خۆ لە نێو موسوڵماناندا لەنێوان خۆشیاندا یەکێك ترسنۆك بووایە پێیان دەگوت: (دەڵێی جووی)**)) (شیری موسا ، ل ٢٥)، ئەم جۆرە تێڕوانینە، سەرەڕای ئەوەی کە توندڕەوی زارەکییە، دیارە ئەو جۆرە تێڕوانینە لە بیروبۆچوونێکی توندڕەوی ئایینییەوە هەڵقوڵاوە کە لەناو کۆمەڵگەی کوردیدا لایەنگرانی سنووردارە، بەڵام دەسەڵات بە فراوانی کاری لەسەر ئەو توندوتیژییە زارەکییە و جەستەییە لە دژی ئایینەکانی دیکە و بەتایبەتیش لە دژی ئایینی جوولەکەدا کردووە، ئەمەش زیاتر لەژێر ڕۆشنایی هزری ناسیۆنالیستی عەرەبی و ئایینی توندڕەوی کە لەو سەردەمانەدا بەهۆی ململانێی عەرەب و جوو کاریگەری هەبووە، بۆیە لای بەشێك لە لایەنگرانی ئەو هزرانە، توندڕەوی ئایینی کاریگەری لەسەر پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانیش دانابوو، بەتایبەتیش کە (( **ئێمەش هەمیشە بۆ مانەوەی خۆمان نەماندەتوانی بەرەنگاری ئەو خەڵکە ببینەوە، چونکە ئێمە کەمتر بووین، ئەگەر قسەمان بکردایە لای موسڵمانان ئێمە غەیرە دین بووین و بگرە لای هەندێك کەسیش گاور بووین و لای ئەو کەسانە هاموشۆی ئێمە پەسەند نەبووە و بۆ دینەکەیان کەموکوڕی بووە و پەسەند نەبووە** )) (شیری موسا ل ٢٦). لە شاری هەولێریش ئەو جۆرە تێڕوانینە لە توندوتیژی ئایینی لە سنوورێکی تەسکدا دژی جوولەکە بوونی هەبووە، ئەگەرچی بەشێوەیەکی گشتی پێکەوەژیانی ئایینی زۆر زاڵتر بووە لەسەر هەستی دەروونی تەواوی پەیڕەوکارانی ئایینزاکان، بەڵام ڕۆماننووس کاروکردەوەی ئەو خەڵکەی کە توندوتیژییان کردووە فەرامۆش نەکردووە و تۆماری کردوون و ئاماژە بەو توندڕەوی ئایینییە دەدات کە لە شاری هەولێر دژی جوولەکەکانی ئەو شارە ئەنجام دراوە (( **دەهاتن لە گەڕەکی جووەکان و لە ناو بازاڕدا بەتایبەتیش لە گەڕەکی تەعجیلی جوولەکان و ماڵە**

**جووەکانی قەلاَتدا گێچەڵیان پێدەکردن و ئازاریان دەدان))** (شیری موسا ل ٨٨). هەر بۆیە ئەو جۆرە خەڵکە کە بەو شێوەیە پەروەردە کرابوون، زۆر بە ئاسانی تەیار دەکران و بەشێوەیەکی وا توندڕەوی ئایینییان لێ بەدی دەکرا کە دەگەیشتە رادەی ئەنجامدانی تاوان، ئەوەتا لە رێگەی ختووکەدانی ئەو جۆرە هەستە توندڕەوییە ئایینییە، دەتوانرێت خەڵك کۆبکرێتەوە و (مامۆستا یونان) کە کەسایەتییەکی جوولەکەی دیاری شەقلاوە بووە بکوژرێت، لێرە خەڵکانێك لەدژی ئەو توندڕەوە ئایینییانە هەر بە ئایین دەیانەوێت پێشگیری لە ئەنجامدانی ئەو تاوانە بکەن ((**ئەوانە بوونە پەرژینێك لەدەوری مامم، ئینجا بابم چووە ژوورەوە تەوراتەکەی هێنا و شان بەشانی حاجی ساڵح ملخوار و مام مەنسوور و ئیلیا گۆگە وەستا، هەر چواریان سێ کتابی خوایان بەرزکردەوە))** (شیری موسا ل٤٧). لێرەشدا ئەوانەی کە بەهزری توندڕەوی گۆش کرابوون، لە دواجار سەردەکەون و تاوانی کوشتنەکە ئەنجام دەدەن. لەبەرانبەریشدا چ لەلایەن خەڵکە ئاسایی و رۆشنبیرەکە و چ لەلایەن پیاوانی ئایینی بێت ئەو کاروکردەوانە رەت کراوەتەوە، بۆ نموونە لە زاری ( قەشە جوبرائیل )ەوە پەیام دەدرێت (( **هەموو دینەکان لە یەك سەرچاوەوە هاتوون، بۆ ئەوەش هاتوون تا مرۆڤ لە نا دادپەروەری و خراپە دوور بخاتەوە و رێی راست و دروست نیشانی مرۆڤ بدات و بۆ بەختەوەری و خۆشگوزەرانی و لێکتر جیاکردنەوەی کارە باشەکان و خراپەکانی دنیا هاتووە ، هیچ دینێك بۆ توندوتیژی نەهاتووە))** (شیری موسا ل ٥٢). ئەم پەیامە روون و ئاشتیخوازییەی پیاوانی ئایینزاکان هەمیشە زاڵتر و پڕ لایەنگرتر بووە لەو لایەنگرانەی کە رەوتی توندڕەوی ئایینی و پیاوانی دەسەڵاتی سیاسی، کە هەمیشە کاریان لەسەر توندوتیژی ئایینی کردووە، بۆیە ئەو پەیامەی پیاوە ئایینییەکان زامنی ئەو پێکەوە ژیانە ئایینییە بووە کە لە دێر زەمانەوە لە کوردستان بنکەکانی چەسپاوە و رەگی داکوتاوە.

**ئەنجام**

لە کۆتایی ئەم توێژینەوەیەدا گەیشتینە ئەم ئەنجامانەی خوارەوە:

١- ئـایین و پێکـەوەژیانی ئـایینی و رەهەنـد و لێکەوتـەکانی بووەتـە بنچینـە و بناغەی دەقی رۆمانی (شیری موسا) و بەهۆیـەوە رۆمـاننووس بەشـێکی گرینگـی لـە ژیاری شاری هەولێر و شارۆچکەی شەقڵاوەی گێڕاوەتەوە و لایـەن و رەهەنـدەکانی شیکردۆتەوە.

٢- هەر چەندە لایـەنی گرینگـی رۆمـانی ( شـیری موسـا ) زۆرتـرین روونـاکی لەسەر جوولەکەکان و ئەوان بوونەتە کارەکتەری سەرەکی ناو رووداوەکـان، بـەڵام لـە گەلێك دیمەندا رۆماننووس مەسیحییەکانیشی فەرامۆش نەکردووە و باسی کردوون .

٣- شوێن لەم رۆمانەدا کاریگەری خۆی هەیە، چونکە ئەو شوێنانە وەرگیـراون کە پێکهاتەی دانیشتوانی لە موسڵمان و جوو و مەسیحی پێکهاتوون ئەوانیش هەولێر و شەقڵاوەن.

٤- تونـدوتیژی ئـایینی بەشـێوەیەکی فـەرمی لەلایـەن دەسـەڵاتی سیاسـییەوە پیـادەکراوە و لەلایـەن خەڵکـەوە گونجـان و تـەبایی بـەدی دەکرێـت، هـەر چەنـدە بەڕێژەیەکی کەم توندوتیژیی جەستەیی و زارەکی وەکو دەرهاویشتەی سیاسی بـەدی دەکرێت .

٥- لەلایـەنی کۆمەڵایەتییـەوە بەشـێوەیەکی گشـتی پێکـەوەژیان و گونجـان و تەباییەکی زۆر لەنێوان ئەو پێکهاتە ئایینییانە لـەناو کۆمەڵگـەی کـوردی هـەبووە کـە هەمیشـە کەوتۆتـە ژێـر فشـاری دەسـەڵاتی سیاسـییەوە بەمەبەسـتی سـوودی سیاسـی حوکمڕانی بەشەڕیان بهێنێت .

**سەرچاوەکان**

**یەکەم: بەزمانی کوردی:**

**أ : کتێب:**

١ د. ئیحسان محەمەد ئەلحەسەن، ئینسایکلۆپیدیای کۆمەڵناسی، و: دانا مەلا حەسەن، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی ٢٠١٢ .

٢ سابیر ڕەشید، شیری موسا، چاپی یەکەم ، چاپخانەی ڕۆشنبیری، هەولێر ٢٠١٧.

٣ عەلی عوسمان یاقوب، ڕۆمان ژانری تەکنیکە جوانەکان و ڕەگەزە فرەڕەهەندەکان، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی ٢٠١٩.

**ب: ڕۆژنامە و گۆڤار**

٤ د. عبداللە خورشید عبداللە، ئەسرین زرار، کێشە کۆمەڵایەتییەکانی ئافرەتی کورد و هۆکارەکانی، گۆڤاری (ئەکادیمی)، ژمارە (١٨)یساڵی ٢٠١١.

٥ د. هێمن عومەر خۆشناو، پێکەوەژیانی ئایینی لە کوردستان، گۆڤاری (خاڵ) ، ژمارە (٢) کانونی یەکەمی ٢٠١٥.

**دووەم: بەزمانی عەرەبی:**

**أ : کتێب :**

٦ الدكتور عبدالعزيز بن عثمان التويجری، الاسلام و التعايش بين الأديان في افق القرن ٢١، الطبعة الثانية، مطبعة الايسيسكو، المغرب، ٢٠١٥ .

٧ محمد مختار جمعة مبروك، التعايش السلمي للاديان وفقه العيش المشترك، مركز الامارات للدراسات و البحوث الاستراتيجيه، الگبعه الاولى، ٢٠١٤ .

٨ د.محمد سعيد رمضان البوطی، د. هانز كينغ، دور الاديان في السلام العالمي، دار الفكر، دمشق، ٢٠١٠ .

**ب: ڕۆژنامە و گۆڤار :**

٩ ا. م. د. عبير سهام مهدي، ا. م. د. عمار حميد ياسين، التعايش السلمي بين الأديان و دوره في تعزيز الوحدة الوطنية، مجلة الباحث الاعلامي، عدد (٥٤)، ٢٠١٤.

١٠ روبرت ميلتون اندرووت الابن، تعريف الدين، ت: منار درويش، مجلة (الاستغراب) ، العدد(٤٤) ، ربيع ٢٠١٦.

١١ ا. د. نادية هناوي، التعايش الثقافي: استراتيجياته و ممكناته، مجلة (ديوان الآن)، عدد (٥) ، اب ٢٠١٩ .

١٢ يوسف زيدان ، اللاهوت العربي و اصول العنف الديني، دار الشروق، الطبعة الثانية،؟.

**ج: نامەی ئەکادیمی :**

١٣ شازاد كريم عثمان زيندين، الرؤية السياسية و الأجتماعية في روايات (غائب طعمة فرمان) و(ابراهيم احمد)، رسالة ماجستير، جامعة بغداد، ٢٠٠٦.

**سێیەم: ئینتەرنێت:**

١٤ جيمس داو، تعريف علمي للدين، ت: هاجر كنبع، (المؤمنون بلا حدود). ٦/ ديسمبر/٢٠١٦ـ www.mominoun.com

١٥ د. الحاج دواق، التعددية الدينية ومنطق التعايش، (المؤمنون بلا حدود)، ٢٣/ ٢٠١٥/٦ www.mominoun.com.

١٦ رانيا سنجق، تعريف الدين لغة و اصطلاحا، ٨/ ديسمبر/٢٠١٦ـ http://mawdoo.com.

## ملخص البحث

# التعايش الديني في رواية (شيرى موسا) لصابر رشيد

د. عبدالله رحمان عولا
قسم اللغة الكوردية/ كلية التربية- مخمور
جامعة صلاح الدين - اربيل

شكل الدين مقاما ومحلا واضحا ومبينا في حياة الانسان والمجتمع الأنساني، و بسببه بنيت ترابطا مهما في البنى التحتية للمجتمع. وبسبب وجود أديان متنوعة ومختلفة في مجتمع واحد، نما التعايش الديني كطريق للعيش الدائم والتوحد بين أفراد المجتمع الواحد، وجعل ذلك ومن دون شك. أن المجتمع الأنسانى يحتاج الى التأكيد على القيم الأنسانية والأيمان بوجود الخلافات الحضارية والثقافية. ومن هناك الوصول الى حياة مشترك بين جميع الأشخاص وهذا التعايش هدف اساسي لكل الأديان السماوية وحيث ان الرواية واحدة من الأنواع الأدبية التي لها صلة بواقع الحياة والمجتمع والأنسانية. لذا ومن هذا الأطار نحلل المسألة المهمة للدين والذي هو التعايش في أطار الأدب ومن منظارها العصري هي الرواية. واخذنا في سبيل النموذج رواية (شيرى موسا) ل (صابر رشيد) النص الذي يؤكد على دور التعايش الديني في المجتمع الكوردي.

# Abstract

## Religious coexistence in the novel (sherry moussa) by saber rasheed

Religion played a clear and constructed place and place in the life of man and human society, and because of him I built an important link in the infrastructure of society. And because of the existence of different and different religions in one society, religious coexistence has grown as a way of decent living and unification between members of one community, and made that without a doubt. The inhuman society needs to emphasize human values and the belief in the existence of civilizational and cultural differences. From there, reaching a life common to all people, and this coexistence is a basic goal for all divine religions, as the novel is one of the literary types that are related to the realities of life, society and humanity. So from this framework we analyze the important issue of religion, which is coexistence in the framework of literature and from its modern perspective it is the novel. We took for the sake of the model the novel (Sherry Moussa) by (Saber Rasheed) the text that emphasizes the role of religious coexistence in Kurdish society.

# ڕەهەندەکانی ڕەخنەی ڕۆمانسیزم
# لە ڕەخنەی ئەدەبی کوردیدا
# لەنێوان ساڵانی ١٩٢٠ - ١٩٧٥

**د. ڕێبوار محەمەد ئیسماعیل**
بەشی زمانی کوردی/ کۆلێژی پەروەردە/
زانکۆی سەلاحەددین- هەولێر

**پێشەکی**

سەرهەڵدانی ڕێبازی ڕۆمانسیزم، هەر تەنیا لە پێشکەشکردنی بەرهەمی داهێنراوی ئەدەبی و هونەری خۆی نەدیتەوە، بەڵکو هەرزوو لە چوارچێوەی ڕێبازەکەدا بنەمای تیۆری و بیرکردنەوەی ڕەخنەییشی بەرهەم هێنا، ڕۆمانسیزم وەك یەکێك لە ڕێبازە ئەدەبییەکان، دوا بەدوای ڕێبازی کلاسیکی و بیرکردنەوەی کلاسیکیانە بوونی خۆی وەك ڕێبازێکی ئەدەبی دەسەلمێنێت، کە لە بەرهەمی داهێنراو و بیر و بۆچوونی فەلسەفی و تیۆری و ڕەخنەیی خۆی دەبینێتەوە.

بەشێوەیەکی گشتی سەرهەڵدان و هاتنە پێشەوەی بیرکردنەوەی ڕۆمانسییانە لە لایەك پەیوەستە بە دۆخی قەتیسبوونی بیرکردنەوەی فەلسەفی لە چوارچێوەی بنەماکانی کلاسیزم و بە کۆنکرێتکردنی ئەدەب و هونەر لە چوارچێوەی چەند یاسا و دەستوورێکی کلاسیکی، لە لایەکی تریشەوە پەیوەستە بە کرانەوەی بیری تاك و زۆربوونی پێویستییە فکری و زانستییەکان و فراوانبوونی حەز و چێژی ئەدەبی و هونەری نووسەر و شاعیرەوە، بەم شێوەیە ئەم دۆخە بووە هەوێنی دروستکردنی خواستێك بۆ دەرچوون لە بیری کلاسیکییانە، لە ژێر فشاری خواستی ئەو ژینگە نوێیە یاسا و دەستووره جێگیرەکانی ڕێبازی کلاسیزم و ڕەخنەی بیری کلاسیکی لە ئەکتیڤبوون کەوتوون، ئیتر ئەو بنەمایانە ئەوەیان لەباردا نەما، کە بتوانن ببنە هەڵگری گۆڕانکارییەکان، نەیانتوانی لەگەڵ چێژی کەسی و پێویستی فکری و کۆمەڵایەتی و سیاسی و ئایینی بگونجێن، بۆیە لێکدانەوە و قسەی نوێ هاتە پێشەوە بۆ وەڵامی پرسیارە نوێیەکان لەسەر فکر و فەلسەفە و ئەدەب و هونەر. بەم جۆرە ژینگەیەکی ڕەخنەیی و پڕ لە

گفتوگۆ و دیبەیت سەری هەڵدا، لەسەر چەمكی مرۆڤ و خودییەت و پێكهاتە عەقڵی و دەروونییەكانی ئەم خودە و كاریگەری لەسەر سەرهەڵدانی بەرهەمی ئەدەبی و هونەریدا.

بەم شێوەیە كۆمەڵێك نووسەر و شاعیر سەریان هەڵدا، كە جەختیان لەو تەوەرە و بابەتانە دەكردەوە، كە لە ڕەخنەی كلاسیكیدا ئاوڕیان لێ نەدەدرایەوە یان بێ بایەخانە سەیریان دەكردن، هەندێك بابەت و مەسەلەی نوێ بوون بە چەقی گرنگی پێدانی ڕەخنەی ڕۆمانسیزم، كە پێشتر بە هەموو شێوەیەك پەراوێز خرابوون، شاعیر و ڕەخنەگری نوێ گەڕانەوە سەر خود و ڕەهەندەكانی پەیوەست بە خودەوە و بە باڵاترین و گرنگترین جەوهەری سروشتیان لە قەڵەمدا، لێرە بەدوا ڕەخنەی ڕۆمانسیزم دێتە پێشەوە، كە خودییەت و پێكهێنەرەكانی تاكیان كرد بە سەنتەری ڕەخنەی ڕۆمانسیزم. ئەو تاكەی كە خودێك لەخۆی دەگرێت پڕیەتی لە "بیركردنەوە، هەڵچوون و پاڵنەرەكان، هەست و سۆزەكان، حەز و ئارەزووەكان، خەیاڵ، ڕەشبینی و ئازار و غەم،....تاد". بەرهەمی ئەدەبی و هونەریش دەبێت گوزارشت بێت لەم خودە، كە ئەو ڕەهەندانەی لە خۆ گرتووە. ئەم بیركردنەوەیە بوو بە بنەما و كاری ڕەخنەیی ڕۆمانسییەكان و لەو ڕوانگەیەوە كێشان و پێوانەیان بۆ دەق و بەرهەمی ئەدەبی و هونەری دەكرد، ئەمەش بووە هۆی ئەوەی نووسەر و شاعیری نوێ لە كۆت و بەندی كلاسیكی و بیركردنەوەی دەستووربەندی كلاسیكییەت ڕزگار بكات، گوزارشتكردن لەو خودە و سروشت و سروشتی تاك دەبێتە چەقی ناوەڕۆك و ئامانجی دەقی ئەدەبی، هەر ئەم ڕەهەندانەش لە لێكۆڵینەوە ڕەخنەییەكان جەختی لەسەر كرایەوە و وەك پێوەر و مەرج خرانە بەردەستی نووسەر و شاعیرەكانەوە، لە هەموو ڕوویەكەوە بەرهەمی ئەدەبی و دەقی شیعری لەسەر بیناكرایەوە، بەمەش لە ڕووی ناواخنەوە گۆشەنیگای نوێ گوزارشتی لێ كرا گۆڕانكاریی گەورە هاتە كایەوە، كە بۆ ڕوخساری دەقیش شۆڕبوویەوە، بەمەش گوزارشتكردن لەو خودە بوو بە مەسەلەیەكی باو و بڵاو لە ئەورووپادا، لەدوای سەدەی هەژدەهەمەوە، بڵاوبوونەوەیەكی بەرچاوی بەخۆیەوە بینی، تا لە ژێر چەتری بیرۆكەی گوزارشتكردن لەو مەبەستانە، ڕەخنەی ڕۆمانسیزم" لە وڵاتە جیاجیاكانی ڕۆژئاوادا و لە ماوەی زەمەنی جیاواز لە یەكتر سەریان هەڵدا.

لە فەلسەفەی ڕۆمانسییەتدا، هێز و توانا بۆ خودییەتی مرۆڤ گەڕایەوە، خود بوو بە سەرچاوەی بەڕێوەبردنی هەست و سۆز و خەیاڵ و بیركردنەوەكانی مرۆڤ و هەر ئەو

خودەش بوو بەسەرچاوەی داهێنانی ئەدەبی و هونەری، لەو بیرکردنەوەیەدا مرۆڤ وەك تاکێکی فرە ڕەهەند و ئەکتیڤ لە ژیاندا لە بەرگێکی ڕۆمانسیانەدا فۆڕمەلەکراوە، بەها ئینسانییەکان و پێکهێنەرەکانی ژیانی تایبەتی مرۆڤ و کۆمەڵگا بوون بە چەقی بابەتە وروژێنەرەکانی ئەم بیرکردنەوەیە، واتە هەست و سۆز و خەیاڵ و خودییەتی تاك و بەهاکانی ژیان و غەمی چەوساوەکان و جوانی سروشت و جوانی ڕەوشت و قووڵی ئێش و ئازاری تاك و گشتی و دەردەکانی کۆمەڵگا لەگەڵ دیوە مەعنەوییەکانی سروشت و مادە و هەست و خەیاڵ و خودییەتە نەبینراوەکانی تاك لە بیرکردنەوەی ڕەخنە و فەلسەفەی ڕۆمانسییەتدا بەرجەستە کران.

بێگومان هەروەکو لە دوای جەنگی یەکەمی جیهانی و دوای نوێبوونەوەی شیعری کوردییەوە بەرهەمی داهێنراوی کوردی بە هەردوو ژانری شیعر و چیرۆکەوە، کەوتوونەتە ژێر کاریگەری ڕێبازی ڕۆمانسییەت، ئەگەر ئەم ڕێبازە لەسەر بنەمای بوونی بزووتنەوە و مەنەفێست و مەنهەجیشەوە ئەدەبێکی ڕۆمانسی لە ئەدەبیاتی کوردی بەرهەم نەهێنابێت، ئەو هەست و بیرکردنەوەی ڕۆمانسییانە و بنەما و خاسییەتەکانی ئەم ڕێبازە لە بەرهەمی نوێی کوردی بەدی دەکرێت، بەهەمان شێوە لێکۆڵینەوە و تارە ڕەخنەییەکانیش لەژێر ئەم کاریگەرییە دەرنەچوون، بەشێك لە نووسەرەکان لە سەر بنەمای خاسییەتەکانی ڕۆمانسییەت و پشت بەستن بەو ڕێبازە خوێندنەوەیان بۆ بەرهەمی ئەدەبی و هونەری کوردی کردووە و دەقی شاعیرانی کوردیان پێ هەڵسەنگاندووە.

بێگومان دەقی شیعری کوردیش بەر لە هەموو شتێك بەسروشتە تایبەتی و نەتەوەییەکەی خۆی گوزارشت لە خودییەتی شاعیر و هەست و سۆز و بیرکردنەوەکانی دەکات و سروشتی ژیانی تاك و ژیانی کۆمەڵگاکەی دەخاتەڕوو، لەسەر ئەو بنەمایە دەبێتە هەڵگری کۆمەڵێك لەو خاسییەت و بنەمایانەی لەبیری ڕۆمانسییەتدا جەختی لێدەکرێتەوە، لەو ڕوانگەیەوە ئەم لێکۆڵینەوەیە بە شێوە گشتییەکەی جەخت لە ڕەهەندەکانی ڕەخنەی ڕۆمانسیزم دەکاتەوە، لە فۆڕمی تایبەتیشدا ئاماژە بە تارە ڕەخنەیی و لێکۆڵینەوە کوردییەکان دەکات لە ماوەیەکی زەمەنی دیاریکراودا، کە لەژێر کاریگەری بیرکردنەوە و خاسییەتەکانی ڕۆمانسیزمدا نووسراون، کە لەم ڕوانگەیەوە خوێندنەوەیان بۆ بەرهەمی ئەدەبی و دەقی شیعریی کۆن و نوێ کردووە و بەرهەمەکانیان هەڵسەنگاندووە.

لەم لێکــۆڵینەوەیەدا، پشــت بە ڕێبــازی (وەســفی ـشــیکاری) بەســتراوە، لەگەڵ خستنەڕووی لایەنی مێژوویی پەیوەست بە ڕێبازی ڕۆمانسـیزم، کـاریگەری ڕۆمانسـیەت و خاسییەتەکانی ئەم ڕێبازە بەسەر بیرکردنەوەی ڕەخنەگر و لێکۆڵەرەکان خراوەتەڕوو.

ئەم لێکۆڵینەوەیە لە پێشەکی و دوو تەوەرەی سەرەکی پێکدێت: تەوەرەی یەکەم بـاس لە ڕێبازی ڕۆمانسیزم و دنیـابینی ئەو ڕێبـازە دەکـات، دواتـر کـاریگەری ڕێبـازی ڕۆمانسـیزم و ڕەخـنەی ڕۆمانسـیزم بەسـەر یەکتریـیەوە خـراوەتەڕوو، ئینجـا ئامـاژە بە سـیماکانی ڕەخـنەی ڕۆمانسیزم کراوە. لە تەوەرەی دووەمدا ڕۆمانسیزم لە ئەدەبیاتی کوردیدا خـراوەتەڕوو سـەرەتا لە بەرهەمی داهێنراوی کـوردی و دەقـی شـیعریدا پاشـان لە وتـار و لێکۆڵینەوەکانـدا سـیماکانی ڕەخــنەی ڕۆمانســیزم لە ڕەخــنەی کوردیــدا خــراوەتەڕوو. لە کۆتاییــدا ئەنجامەکــانی ئەم لێکـۆڵینەوەیەش لە چەنـد خاڵێکـدا خـراونەتەڕوو، لەگەڵ لیسـتی سـەرچاوەکان پـوختەی توێژینەوە بە هەردوو زمانی عەرەبی و ئینگلیزی.

**ڕێبازی ڕۆمانسیزم و دیدی تایبەتی ڕۆمانسیزم:**

ڕێبـازی ڕۆمانسـیزم لە ڕووی تایبەتمەنـدی و مێـژووی سـەرهەڵدانییەوە پەیوەسـتە بەو بارودۆخ و هەلومەرجە سیاسی و ئابووری و کـۆمەڵایەتی و ئـایینییەی، کە لە دوای سـەردەمی کلاسیك ناوچەکـانی ڕۆژئـاوای گـرتەوە. هەر لە سـەردەمی ڕێبـازی کلاسـیزمدا ژینگەیەکـی فەلسەفی و فکری و ئەدەبی بە شێوەیەکی تەدریجی دێتە پێشـەوە، ئەم ژیـنگەیە نـوێیە دەبێـتە هەوێنــی لەدایکبــوونی ڕێبــازی ڕۆمانســییەت. بـۆیە هەر لە ســەردەمی ڕێبــازی کلاســیزمدا، کۆمەڵێك نووسەر و شاعیر سەریان هەڵـدا، کە لە ڕێبـازی کلاسـیزم لایانـدا و بە ئاراسـتەی تـر بیریـان دەکـردەوە، بەمەش چەنـدین بنەمـا و خاسـییەت هـاتنە پێشـەوە کە لەگەڵ سروشـت و بیرکــردنەوەی ڕێبــازی کلاســیکییەت نەدەگونجــا، نەك هەر ئەوەنــدە بەڵکــو ئەو نووســەر و شاعیرانە لە ڕێگەی تێبینی و بیرکردنەوەکانیان نەیاری و دژایەتیی خۆشـیان بەرامـبەر بە فکـری کلاسیزم دەربڕی، ئەم خاسییەت و بنەما نوێیانە لە ناو ڕێبازی ڕۆمانسیزمدا خۆیان فـۆڕمەلەکرد، بەمەش ڕێبازی ڕۆمانسیزم و فەلسەفەکەی لەگەڵ فکـر و بنەماکـانی کلاسـیزم کەوتـنە دۆخـی بەگژیەکداچوون و کێشمەکێشی فکـری و فەلسـەفی. (ڕۆمانسـیزم ئەو بـزووتنەوە فەلسـەفی و ئەدەبـی و سیاسـی و هـونەری و کـۆمەڵایەتییە بـوو، کە لە کۆتـایی سـەدەی هەژدەهەمـدا، لە

ئەدەب و مێژووی ڕۆژئاوادا سەری هەڵدا، بە چەند بنەما و پێوەرێکی تایبەت بە بیرکردنەوەی خۆیان دژایەتی بنەما و پێوەرەکانی ڕێبازی کلاسیزمیان کرد)(تیغم، ١٩٧٥،ل٢٠٢). ڕێبازی کلاسیزم پەیوەستبوو بە خزمەتکردنی ڕژێمی دەرەبەگایەتی و چینی ئەرستۆکراتی لەسەر بنەمای عەقڵانییەت، پەراوێزخستنی چینەکانی تر، ئەمەش بووە هۆی کاردانەوە و چینی بۆرجوازی دێتە پێشەوە، کە لەسەر بنەمای تر بوونی خۆی دەسەلمێنێت. ڕۆمانسییەت لەو بانگەشە عەقڵانییە دوورکەوتەوە، کە کلاسیزم ئەدەب و هونەری پێ کۆت و بەند کردبوو، لەسەر بنەمای بەهای تاك و پێکهێنەرەکانی خودی ئەو تاکە، بۆیە دەبینین، کە ((پەرچەکرداری ڕۆمانسییەت لە بەرامبەر بە گەورە زانینی عەقڵ لە کلاسیکییەتدا، زیاتر بەرز کردنەوەی بەهای سۆز و سەربەستی گوزارشتکردن بوو لە خود))(قطوس، ٢٠١١،ل٤٢). ڕێبازی ڕۆمانسیزم بە پێچەوانەی کلاسیزم جەختی لە چەند بنەمایەك کردەوە، بۆ هەر بابەت و بیرکردنەوەیەك جەمسەرە دژەکانی ئەو ڕێبازەی گرت، (ڕۆمانتیکی ئەو بزووتنەوەیەیە، کە هەر شتێك کلاسیکییەت ڕەتی کردبێتەوە ئەو بە بەرز و شکۆداری دەزانێت))(حوسێن، ٢٠١٠، ل٤٤). ئەمەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە، کە سەرچاوە فکری و فەلسەفیی ئەم دوو ڕێبازە لێك جیاوازن سەرەڕای گۆڕانی قۆناغەکە بوونی کۆمەڵێك هۆکاری تایبەت بەخۆیان، دەرکەوتنی چینی نوێ لە مەیدانی خەباتی سیاسی و فەلسەفی و ئەدەبی و هونەریدا، نەگونجانیان لەگەڵ فکر و فەلسەفەی کلاسیزم زیاتر پەرەی بە توخمەکانی ڕۆمانسییەتدا، بۆیە ئەو ژینگە سیاسی و فکرییە لە ماوەکانی بەر لە ڕۆمانسییەت و سەرەتای ئەم ڕێبازە ناوچەکەی گرتەوە، بەشێوەیەك لە شێوەکان لەبەرامبەر ڕێبازی کلاسیکی و ڕەخنەی کلاسیکی وەستان، بۆ نموونە دەرکەوتنی بزووتنەوەی ڕۆشنگەری لە سەدەی هەژدەمدا، کە وەك ڕێگا خۆشکەرێك بوو بۆ ڕێبازی ڕۆمانسیزم، کاریگەرییەکی زۆری لەسەر ژیانی کۆمەڵایەتی و پێشکەوتنی بواری فکری و ڕۆشنبیری هەبوو لە زۆربەی وڵاتانی ئەورووپا دژی ڕژێمی دەرەبەگایەتی توانی ڕۆڵێکی کارا بگێڕێت. لایەنگرانی ئەم بزووتنەوەیە لە ڕێگەی جیاوازەوە دەیانویست بۆچوونەکانی خۆیان بڵاوبکەنەوە و هەوڵیان دەدا، کە هەموو لقەکانی زانست و فەلسەفە لە خزمەتی مرۆڤایەتی بەکاربهێنن، هەروەها چەند نووسەر و فەیلەسوفێکی وەك (سویفت و جۆن لۆك) لەو نێوەندەدا دەرکەوتن لە سنووری نەتەوەیی دەرچوون و خۆیان بە هاوڵاتییەکی جیهانی لە قەڵەم دەدا، جگە لەوە سەرهەڵدانی تەوژمێك کە دۆخێکی گونجاوی ڕەخساند بۆ ئەوەی

سەردەمی دەربڕینی هەست و سۆز بێتەکایەوە، ئەو تەوژمەش "سانتماتالییەکان" بوون، کە عەقڵیان خستە پەراوێزی هەست و سۆزەکانەوە و کە لە هیوم یان شاعیرانی گۆڕستان و شەو سەرچاوەیان گرتبوو، کە ناوەرۆکی غەمۆکی و ڕەشبینی و کارەساتی دڵتەزین و تاریکی و تەنیایی باڵی بەسەر بەرهەمەکاندا کێشابوون.(حوسێن، ٢٠٠٧، ل٦٩). سەرەڕای ئەو گۆڕانکارییە سیاسی و پیشەسازی و ڕۆشنبیرییەی، کە لە ناوچە جیاجیاکانی ڕۆژئاوا ڕوویدا و دەستکەوتی گەورەی هەبوو، دۆخی ژیانی تاك و کۆمەڵگای گۆڕی لە هەموو ڕوویەکەوە، لەوانەش ژانر و بەرهەمی نوێی ئەدەبی و بیرکردنەوەی تازەشی لێکەوتەوە. شۆڕشی فەڕەنسا بووە هۆی دامەزراندنی سیستەمی پەرلەمانی و دوابەدوای ئەوەش جاڕنامەی مافی مرۆڤ هاتە ئاراوە، ئەمەش ڕێگەی بۆ ئازادی و بیرکردنەوەی تاك خۆشکرد و بەها مرۆڤایەتییەکان بوون بە چەقی گرنگی پێدان، هاوشانی شۆڕشی فەڕەنسا شۆڕشی پیشەسازی ئینگلستان و شۆڕشی ڕۆشنبیری ئەڵمانیا کاریگەری زۆریان هەبوو بەسەر چەسپاندنی بیری ڕۆمانسیزم و زاڵبوونی ئەم ڕێبازە. (غفور، ٢٠٠٥، ل٨). هەروەها گرنگیدان بە خود و گێڕانەوەی دەستەڵات بۆ تاك لە بیرکردنەوە و داهێنان و گوزارشتکردندا، لە نووسینی ڕەخنەیی و بۆچوونی فەلسەفی و بەرهەمی ئەدەبی چەندین نووسەر و ڕەخنەگر و فەیلەسوفدا دەرکەوتن، بۆ نموونە (لە ئەڵمانیا لە فەلسەفەی "کانت و هیگڵ"، لە فەرەنساش لە بەرهەمەکانی "ژانژاك ڕۆسۆ، ڤۆڵتێر، دیدرۆ، مۆنتیسکۆ"، لە ئینگلستانیش بە فەلسەفەی "جۆن لۆك"، دەرکەوتن، کە کاریگەریی زۆریان هەبوو بەسەر گۆڕانی ئەورووپا و سەرهەڵدانی بیرکردنەوەی ڕۆمانسیانە)(پیربال، ٢٠٠٤، ل٥٣). هەموو ئەو بەرهەمە فکری و فەلسەفی و ڕەخنەیی و ئەدەبییانەی، کە لە لایەن ئەوانە و نووسەر و ڕەخنەگرو فەیلەسوفانی ترەوە پێشکەش کران، کاریگەرییان لەسەر لاوازکردنی بیرکردنەوەی کلاسیزم هەبوو، لەبەرامبەریشدا ڕێبازی ڕۆمانسیزمی چەسپاند بۆ لێکدانەوەی سروشتی ئەدەب و وەڵامە تیۆرییەکانی پەیوەست بەو مەسەلەیەوە. ئیتر ئەم هەلومەرج و گۆڕانکارییانە بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ وەك هاودژێك بەرامبەر بە ڕێبازی کلاسیکی و ڕەخنە و بیری کلاسیکییانە وەستایەوە، بووە هۆی ئەوەی خاسییەت و بنەما و یاسا و دەستوورەکانی کلاسیزم لە بواری فکری و ئەدەبی و هونەری چیتر وەك پێوەر و پێوانەی ڕەخنەیی بەکارنەهێنرێن، بەڵکو ژینگەیەکی نوێ بۆ سەرهەڵدانی بەرهەمی ئەدەبی و هونەری هاتە

کایەوە و فەلسەفە و بیری ڕەخنەیی نویٚ هاتە پێشەوە، کە لە چوارچێوەی ڕێبازی ڕۆمانسیزمدا خۆی بەرجەستەکرد.

ڕێبازی رۆمانسیزم خاسییەت و بنەماکانی خۆی لەو ژینگە فکری و فەلسەفییە نوێیە وەرگرت، کە وەك شۆڕشێك بەسەر کلاسیزمدا هات بە پشت بەستن بەو خاسییەت و بنەمایانەی خۆی ستراتیژییەکی نوێی بۆ بەرهەمی ئەدەب و هونەری پێشکەش کرد ئەم ستراتیژ و چوارچێوەیەش بووە بە پاڵپشتی فکری و تیۆری بۆ بیرکردنەوەی ڕەخنەیی، ئیتر لەم قۆناغەدا ڕەخنەی ئەدەبی لە چوارچێوەی ڕێبازی ڕۆمانسیزم خۆی فۆرمەلە کرد. بۆیە بە شێوەیەکی گشتی پێوانەکردن و هەڵسەنگاندنی بەرهەمی ئەدەبی و دەقی شیعری کەوتە ژێر فەوکسی توخم و خاسییەتەکانی ڕێبازی ڕۆمانسیزم، ئیتر کلاسیزم و خاسییەتەکانی نەیانتوانی هەزمی گۆڕانکارییەکان بکەن، دەقی ئەدەبی ئەو یاسا کۆنکریتی و خاسییەتانەی کلاسیکی بەجێهێشت و بەهاکانی تاك و ڕەهەندەکانی خودییەت ، گوزارشتکردنی ئازادانە لە خود، بوون بە ناوەندی گرنگی پێدان، چونکە بەلای ئەم ڕێبازە خود بەهای مەعنەوی خۆی هەیە و خاوەنی سروشتێکی دەروونی فراوانە و لە پێکهێنەرە دەروونی و توانا سەرەکییەکانی مرۆڤ، کە بریتین لە "هەست و سۆزەکان و هێزی خەیاڵ و عەقڵ و حەدەس و ئیدراك، گریان، و غەم، تەنیایی،...تاد"، ئەم تەوەرانەی کە پەیوەستن بە سروشتی هەر تاکێکەوە، لە ڕێبازی ڕۆمانسیزم و ڕەخنەی ڕۆمانسیزمدا دەبن بە خاسییەت و یاسای ئەو ڕێبازە و بنەمای پێوەر و هەڵسەنگاندنی ڕەخنەیی.

**کاریگەریی ڕێبازی ڕۆمانسیزم و ڕەخنەی ڕۆمانسیزم بەسەر یەکەوە:**

ڕەخنەی ڕۆمانسیزم پەیوەستە بە ڕێبازی ڕۆمانسیزمەوە، بۆیە ناکرێت لە دەرەوەی ئەم ڕێبازە لە سەرهەڵدان و بنەما تێبینییە ڕەخنەییەکانی ڕۆمانسیزم بدوێین، چونکە ڕێبازی ڕۆمانسیزم بەرهەمی کۆی ئەو ڕەخنە و بۆچوونانەیە، کە دژ بە بیری کلاسیکییەت لەو قۆناغەدا خرانەڕوو، ئیتر بەرهەمی داهێنراو پشتی بەو فەلسەفە و تێبینی و بانگەشە ڕۆمانسییانە بەست، کە پێشتر لە بیری ڕەخنەی کلاسیکی پەراوێزخرابوو، بۆیە ڕێبازی ڕۆمانسیزم و ڕەخنەی ڕۆمانسیزم دووانەیەکی لێك دانەبڕاون و ئاوێتەی یەکترین، باس لە هەر یەکێکیان بکەین ئەوا بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ باسکردنە لەوەی تریان. ئەوەی، کە پشتیوانی فکری و فەلسەفی

ڕەخنەی ڕۆمانسیزم دەکات، خاسییەت و بنەما و خاسییەتەکانی ڕێبازی ڕۆمانسیزمە، بێگومان ئەم ڕێبازەش سەرچاوەی ڕەخنەیی و فەلسەفی خۆی هەیە، کە لە بۆچوونی نووسەر و شاعیرانی ڕۆمانسییەوە پێکدێت. ڕەخنەش هەر تەنیا لەسەر بۆچوونی دوو کەس یان زیاتر بینا نەکراوە، بەڵکو هەموو ئەو ڕەخنەگر و لێکۆڵەر و شاعیر و نووسەرانەی، کە لەو قۆناغەدا دەرکەوتن و بەرهەمی داهێنراو لێکۆڵینەوەیان پێشکەش کردووە، بۆچوونەکانیان بایەخی تیۆری و ڕەخنەیی خۆی هەبوو، هەریەکەیان جەختیان لە خاسییەت و بنەمایەکی دیاریکراو کردووەتەوە لە چوارچێوەی بیری تاکەخوازی و خودییەتی مرۆڤدا. کە لە ماوەکانی بەر لە ڕەخنەی ڕۆمانسیزم نووسەر و لێکۆڵەرەکان هەرگیز گرنگییان بە خودییەتی مرۆڤ نەدەدا و ڕەهەندەکانی پەیوەست بەم خودەشیان وەك هەست و سۆز و خەیاڵ و بەها مەعنەوییەکانی تریان لە ناوەرۆکی بەرهەمی ئەدەبی و هونەری دوور دەخستەوە، بەڵام لەو قۆناغەدا و بە پشت بەستن بۆچوونی فەلسەفی هەر یەکە لە "کانت" و "هیگڵ"، کە خاوەنی فەلسەفەی گرنگیدانن بە خود، لە چوارچێوەی بیری بورژووازییەت و نموونەیی بوونی تاك هاوکێشەکە گۆڕانێکی تا ڕادەی ڕیشەیی بەسەر داهات. لە ژێر ڕۆشنایی ئەم بیرکردنەوە نوێیە بەرهەمی ئەدەبی و دەقی شیعری بە خودییەتی تاك پەیوەستکراو بیرۆکەی دەستەڵاتی تاك و ڕەهەندەکانی بەسەر دەقی ئەدەبی و هونەری جەختی لەسەر کرایەوە، بەمەش ناوەرۆکی لیریکی و جۆری شیعری خودی و کەسی سەری هەڵدا، کە (بەر لە ماوەی ڕۆمانسیزم، شیعری خودی، وەك شیعری لیریکی و شیعری خەیاڵی لە ناو بازنەی ئەدەبدا بەهایەکی ئەوتۆی نەبوو، بەڵام دواتر "سیر ولیەم جۆنز"، هاتە پێشەوە و ستایشی شیعری لیریکی و شیعری خەیاڵی کرد و ڕەخنەی لە ئەرستۆ گرت، ئەو بۆچوونەی ڕەتکردەوە، کە شیعر بریتی بێت لە لاساییکردنەوە)(عباس، ١٩٨٧، ل٢٦). ئەو دەرکەوتە ڕەخنەیی و ئەو ئاماژە خودییانە بە وڵاتانی ڕۆژئاوا بڵاوبوویەوە، ئەمەش هەموو لەسەر حیسابی لاوازکردنی ڕێبازی کلاسیزم بوو، دواتر ئەمە بوو بە هەوێنی شۆڕشێکی گەورە لە بواری فکری و بەرهەمی ئەدەبی و ڕەخنەی ئەدەبییەوە، (لە ئەڵمانیا شۆڕشێکی فکری و ئەدەبی لەسەر کلاسیزم و بیرکردنەوەی کلاسیکییانە کرا، کە ڕەخنەگری بە توانا "لینسج" ڕۆڵێکی کاریگەری هەبوو لەم ڕووەوە هەرچەندە خۆی ڕۆمانتیکی نەبوو بەڵام ڕەخنە و بۆچوونەکانی بوونە ڕێگەیەك لەبەردەم ڕۆمانسییەکاندا، دواتر "هردر"یش جەختی لەسەر جۆری شیعری لیریکی کردەوە و ئەو جۆرە

شیعرەی، کە لەگەڵ سروشتی مرۆڤەکان دێتەوە و لەو سروشتەشەوە گەشەی کردووە، هەروەها بانگەشەی بۆ ئەوە دەکرد، کە ئەسڵی شیعر خۆی بریتییە لە دەربڕینی لە هەستەکانی مرۆڤ)(عباس، ١٩٨٧، ل٢٦).

بیری ڕۆمانسیزم لە ڕۆژئاوا بۆ ئەو تەوژمە ڕۆشنبیرییە دەگەڕێتەوە، کە دژی لاساییکردنەوەی نموونەکانی فەرەنسی و ئیتاڵییە کۆنەکان دەوەستان، "کانت" لە ڕێگەی بەپێوەرکردنی تاك و پەیوەستکردنی بابەتەکانی جوانناسی بەخودەوە دەورێکی سەرەکی هەبوو لە بڵاوکردنەوەی هزری ڕۆمانسییانە لە ئەڵمانیادا، دواتر "هیگڵ" لەسەر هەمان بیرکردنەوە بەهێزی تاك و خود بەسەرچاوەدانان گەشەی بەم بیرکردنەوەیەدا، دواتر ئەوانە بوون بە سەرچاوەیەکی فەلسەفی بۆ ڕەخنەی ڕۆمانسیزم، چەند فەیلەسوف و ڕەخنەگر و نووسەری تری زیاتر گەشەیان بەو بیرکردنەوە خودییانەدا، دواتر بیری ڕۆمانسیەت لە ئەڵمانیادا لە دوو نەوەدا خۆی بەرجەستە کرد، یەکەم برایانی شلێگڵ بوو، کە لە "فردریك شلێگڵ و ویلیام شلێگڵ" پێکهاتبوون و لە ساڵی ١٧٩٧ز لە بەرلین سەریان هەڵدا تا سەرەتای سەدەی نۆزدەم، نەوەی دووەم بە گرووپی هایدلبیرگ ناسرابوون، لە ڕێگەی ئەم دوو گرووپەوە زۆر بەرهەمی خودی و ڕۆمانسی هاتنەکایەوە و بەرهەمە ئەدەبییەکانیش گوزارشتیان لە تاکایەتی نووسەر و شاعیرەکان دەکرد.

ئەم فەیلەسوف و ڕەخنەگر و شاعیرانە کاریگەرییان بەسەر وڵاتانی تری ڕۆژئاوا هەبوو بۆ نموونە "کۆلێریج و شیللی و بایرۆن" لە ئینگلتەرا، کەوتنە ژێر کاریگەریی بۆچوونەکانی شلێگڵی ئەڵمانی، هەرچەندە لەسەرەتادا ڕۆمانسیزم لە ئینگلتەرا هاوکاتی ئەڵمانیا سەری هەڵدا، کە شاعیرانی "دەریاچەخواز" لە نێوان ساڵانی (١٧٩٨-١٨١٥)، یەکەمین کۆمەڵە شیعری ڕۆمانتیکیانەی خۆیان بڵاوکردنەوە، بەڵام بەشێوەیەکی گشتی ڕەخنەگران لەسەر ئەو باوەڕەن، کە سەرهەڵدان و چەسپاندنی ڕێبازی ڕۆمانسیزم بۆشیعرەکانی "ولیام وردزووۆرس" و "کۆلێریج" دەگەڕێتەوە، لە بەرهەمەکانی ئەواندا خاسییەت و بنەماکانی ڕۆمانسیزم بەجوانی چەسپا، کە دواتر هەر ئەم دوو شاعیر و ڕەخنەگرە بوون بە ڕابەرانی ڕەخنەی ڕۆمانسیزم ، لە ڕێگەی بۆچوونە ڕەخنەیی و تیۆرییەکانی خۆیان کە لە سەر سروشتی شیعری و دەقی شیعری خستیانەڕوو.

بۆچـوون و بیركـردنەوە خودییەكـانی، هەر یەكە لە(وردزوۆرس، كـۆلێریج، شـیللی، ئارنۆلد،...تاد)، كە جەختیان لە خەیاڵ و هەست و سۆزی شـاعیر و هونەرمەنـدان دەكـردەوە و "شیعر"یان وەك دەربڕینێكی پڕ لە هەست و نەستی شـاعیرەكان وەسـف دەكـرد، بووبـوون بە هۆكـاری سـەرهەڵدانی ڕەخنەیەكـی مەنهەجـی لە چوارچێـوەی بیـری ڕۆمانسـییانەدا، بەمە ڕەخـنەی ڕۆمانسـیزم كـاری مەیـدانی ڕەخنەگـرانەی خـۆی دیـاری كـرد. بـۆ نمـوونە ویلیـام وردزوۆرس (١٧٧٠-١٨٥) لە ڕێگەی بڵاوكردنەوەی دیوانێكی شـیعری لەگەڵ "كـولیردج"دا، بە نـاوی(Lyrical Ballads) لە سـاڵی ١٧٩٨دا، بە دوو ئاراسـتەی جیـاواز كـاریگەری هەبـوو، لەسـەر بیركـردنەوەی ڕۆمانسـییانە، هەم لە ڕێـگەی داهێنـانی ئەدەبییـەوە، كە وەك شـاعیرێك خـاوەنی كۆمەڵێـك دەقـی شـیعری ڕۆمانسـی بـوو، هەروەهـا وەك لێكـۆڵەر و ڕەخنەگرێكـی ڕۆمانسیش ڕۆڵی خۆی هەبوو، وردزوۆرس بە پشت بەستن بە تواناكـانی خـود، كە لە هەسـت و سـۆزە كۆكراوەكـانی شـاعیرەوە سـەرچاوە دەگرێـت، بەرهەمـی ئەدەبـی و دەقـی شـیعری هەڵدەسەنگاند. بەلای ساموێل تایلر كولیردج (١٧٧٢ ـ١٨٣) داهێنـانی ئەدەبـی یـاخود دەقـی شیعری لێكەوتەی كۆمەڵێك ڕەهەندی تـری نـافیزیكییە لە مرۆڤـدا، كە بەپێـی بـوونی خۆیـان ڕۆڵی سەرەكی و لاوەكی و كارا و كارای یاریدەدەر دەبینن، بۆیە كولیردج ڕەهەنـدەكانی وەك "هەسـت و سـۆزەكان، عەقـڵ، ئیـدراك، ئیـرادە، ...تـاد" ناخـاتە دەرەوەی پرۆسـەی داهێنـانی ئەدەبی و هونەرییەوە، بەڵام لای كولیردج هەموو ئەم ڕەهەنـدانە بەهـۆی هێـزی خەیـاڵەوە بـۆ بەرهەمهێنـانی دەقـی شـیعری دەكەونە جـووڵەوە، خەیـاڵ ئەو پێكهـاتە سـەرەكییەیە، كە وزە و هێزی داهێنانی ئەدەبی و هونەری بەرهەم دێنێـت، هەروەهـا شـیللی (Shelley ١٧٩٢ــ١٨٢٢)، كە شاعیرێكی ئینگلیزییە، لە ڕێـگەی كتێبێكـی ڕەخنەیـی بەنـاوی "بەرگریكـردن لەشیعر"دا، ڕۆڵی لە برەودان بە بیری ڕەخنەی ڕۆمانسیزم هەبوو، بەلای شیللی خـاوەنی خـود و كەسـایەتی بەهێز و نموونەیین و توانایەكی بـێ سـنووریان بـۆ داهێنـان هەیە. زۆر ڕەخنەگـر و لێكـۆڵەری تـریش لەو نێوەنـدەدا دەركەوتـن و لە چوارچێـوەی خـودی مـرۆڤ و پێكهـاتە عەقڵـی و دەروونییەكـانی وەك هەسـت و سـۆزەكان و پـاڵنەر و هەڵچوونەكـان و عەقـڵ و خەیـاڵ و ڕەهەنـدەكانی تـری مـرۆڤەوە، لێكـدانەوە ڕەخنەیـی و تیۆرییەكـانی خۆیـان دەخسـتەڕوو، بـۆ نمـوونە هەریەكە لە"ولـیم بلیـك" "شـلینگ"یش، ئاماژەیـان بە سـەرچاوە بـوونی خـودی

تـاکەکەس کـردەوە بـۆ پرۆسـە جیاجیاکـان، وەك کـۆلیردج جەختیـان لە هێـزی خـولقێنەری خەیاڵی شاعیر کردەوە. (اسماعیل، ٢٠١٩، ل ١٨٠).

ئیتر بنەما و فکری ڕەخنەی ڕۆمانسیزم لە هەموو ئەو بیر و بۆچوونە تیۆری و ڕەخنەییـانە پێکهات، کە لە سەدەی هەژدەهەم و نۆزدەهەمەوە، لە دژی بیرکردنەوەی کلاسـیکیانە لەلایەن ڕەخنەگر و نووسەر و شاعیرەکانەوە خراونەتەڕوو، لەسەر بنەمای گەڕانەوە بۆ خودی مـرۆڤ و پێکهێنەرە نافیزیکییەکـانی، بەچەقـدانانی نـاوەوەی خـودی تـاك لە بەڕێـوەبردنی پرۆسـەکان و ڕۆڵگێڕانی لە داهێنان و بەرهەمهێناندا، دەقیش لە ژێر ئەم توانا ناوەکییەی تاکـدایە، بـۆیە دەقـی شیعری پرۆسەیەکە بۆ گوزارشتکردن لەو خودە دەکەوێتە کار.

**سیماکانی ڕەخنەی ڕۆمانسیزم:**

خاسییەتەکانی ڕێبازی ڕۆمانسیزم بوون بە بنەمـای ڕەخنەیـی لە ڕەخـنەی ڕۆمانسـیزمدا، دید و بۆچوون و میتۆد و ڕەخنەی ڕۆمانسییەتی لەسەر بینا کـرا، نووسـەر و ڕەخنەگرەکـان هەر لە ژێـر ڕۆشـنایی ئەو خاسـییەت و بنەمایـانەوە دەقـی شـیعری یـان بەرهەمـی ئەدەبییـان هەڵدەسەنگاند، کە بەشێك لەو خاسییەت و بنەمایانە بریتین لەمانەی خوارەوە:.

خـودییەتی و بە چەقـدانانی تـاکەکەس: ڕۆمانسـییەکان لەسـەر بنەمـای تـاك و تەفزیـل کردنی ڕەهەندە خودییەکانی ئەو تاکە، مامەڵەی فکـری و فەلسـەفییان لەگەڵ ئەدەب و هـونەر و بوارەکـانی تـر دەکـرد، (بـاوەڕبوون بە تـاك و ئارەزووەکـانی، بە تـایبەتی پشـت بەسـتن بەو ئـارەزووەی، کە پێویسـتە مـرۆڤ توانـای خسـتنەڕووی سـەربەخۆیی و ویسـت و مەبەسـتە تاکەکەسییەکانی خۆی هەبێت، لەسەر بنەمای ئەو باوەڕە دەبینین، کە ڕۆمانتیکەکـان چەمکـی (منـی تـاکەکەس) یـان داهێنـا)(شەمیسـا، ٢٠١٨، ل١٠٣). گوزارشـتکردن لە خـود و ئامـانج و مەبەستەکانی ژیانی، بوونە تەوەرەی باس و ناوەرۆکی دەقـی شـیعری ڕۆمانسـیزم، لەبەر ئەوەی تاکەکەس لای ئەوان خاوەنی پێکهاتەیەکی عەقڵی و دەروونی وەهایە ، کە دەتوانێت زاڵبێـت بەسـەر دۆخە جیاجیاکـان و توانـا خودییەکـانی تـاك دەتـوانن کـۆنترۆڵی دەرەوە بـکەن، بـۆیە (گوزارشـتکردن لە تـاك بەو مانـایەی کە خـاوەنی توانـایەکی لەبـن نەهـاتووە، بـووە بە چەقـی بیرکردنەوەی رۆمانسییانە، بیری تاکگەرایی بە جۆرێك ڕۆمانسییەکانی تەوق کـرد، بە تەواوی لە بەرژەوەندیی کۆمەڵ و سوڵتە و دەستەڵات دوورکەوتنەوە)(هـیلال، ٢٠٠٥، ل١٠٨ــ١٠٩). ئەو بیـرە

هەر لە چوارچێوەی تاك بە واتا ئەبستراکتەکە نەماوەتەوە، بەڵکو بانگەشەی ئەوەی دەکرد، کە هەموو باس بکرێ بەڵام لە دید و تێڕوانینی خودی شاعیرەوە گوزارشت لە شتە ناوەکی و دەرەکییەکانی دەرەوەی شاعیر بکرێ، واتە بە هۆی تێگەیشتن و دنیابین و هەست و سۆز و خەیاڵی شاعیرەوە شتە دەرەکییەکان پێوانە بکرێن و جارێکی تر وێنا بکرێنەوە و بە هۆی ئەو ڕەهەندە ناوەکییانە گوزارشت لە بارودۆخ و ورووژێنەر و دیاردە دەرەکییەکان بکرێت.

سۆز و هەڵچوون: هەست و سۆز و هەڵچوون و حاڵەت و بارودۆخە دەروونییەکانی تر، تەوەرێکی بایەخداری بیری ڕەخنەی ڕۆمانسیزمە و پانتاییەکی زۆری لە ناوەرۆکی بەرهەمە ئەدەبییەکانی ڕۆمانسیزم داگیرکردووە، دڵ وەکو وێستگەی سۆز و هەڵچوونەکانی خود، بەهایەکی بەرزی لە لای ڕۆمانسییەکان هەیە، پێویستە شاعیر بە ڕاشکاوی گوزارشت لە هەموو جۆرە هەست و سۆزێکی خۆی بکات، چونکە حاڵەتە دەروونییەکان هەرچییەك بن و هەر جۆرێك بن، ئەوا بەشێکن لە پێکهاتەی ناوەوەی خود. ئەو خودەی، کە چەقی فکری ڕۆمانسییەکانی داگیر کردووە، هەر تەنیا عەقڵ پێکهێنەری نییە، بەڵکو ویژدان و نەست و هەست و سۆزەکانیش بەشێکی سەرەکی ئەو زاتەن، لەبەرئەوە ڕۆڵیان لە ئاراستەکردنی تاك و جۆری مامەڵەکردنیانەوە هەیە، بۆیە گوزارشتکردنیش لێیان و وێناکردنی ئەو ڕەهەندانە لە بەرهەمی ئەدەبی و دەقی شیعریدا، لایەنێکی بەهای تاك و کەسایەتی شاعیر دەردەخات.

خەیاڵ: ڕۆمانسییەکان بایەخێکی زۆریان بەمەسەلەی خەیاڵ دەدا، هەم ڕەخنەگرەکانیان لەڕووی ڕەخنەییەوە، باوەڕیان بەسەرچاوەبوون و هێز و توانای خەیاڵ هەبوو، لە پرۆسەی بەرهەمهێنانی دەقی ئەدەبی و هونەریدا، هەم شاعیر و نووسەرەکانیان خەیاڵیان بەو جیهانەیە دادەنا، کە مرۆڤ دەتوانێ تێیدا هەست بە ئارامی بکات و لەو جیهانە بە خەون و هیوا و ئاواتەکانی خۆی بگات، خەیاڵ شوێنگرەوەی دنیای واقیع، ئەو دنیایەی بەهۆی دوورکەوتنەوەی لە سروشت و سادەییەوە پیس و ئاڵۆز بووە، پێویستە شاعیریش لێی دوورکەوێتەوە، ڕوو لەخەیاڵ بکات، لەو جیهانە بەدوای پێویستییە ڕووحییەکانی خۆیدا بگەڕێ، شیعرەکانیشی بریتی بێت لە گوزارشتکردن لەو جیهانە خەیاڵییە.

بایەخدان بە سروشت و گەڕانەوە بۆی: ڕۆمانسییەکان سروشتیان بەسەرچاوەیەك دەزانی بۆ پاکی و بێ گەردی. مەبەست لە سروشت، سروشتی هەر شتێکە، کە عەقڵ و شارستانییەت هێشتا نەیشێواندووە، بۆیە جەختیان لەسەر سروشتی مرۆڤ دەکردەوە، ئەو

مـرۆڤە سـادە و سـاکارەی، کە لادێـیـە و دوورە لە جەنجـاڵیی شـار و شارسـتانییەت، هەروەهـا سروشتی ژیان و بوونەکانی گەردوون، کە وەك دایکێکی پەروەردەکەریـان دادەنـا بـۆ خـودی مـرۆڤ، هەروەکـو وردزوۆرس دەڵێـت: (مـرڤ پەروەردەی دەسـتی سروشـتە و هەر ئەو سروشتەشە، کە دەیگۆڕێت بۆ مرۆڤێکی خاوەن کەسایەتی و هێز و توانـای پـێ دەبەخشـێت، بۆیە دەیەوێت خودی ئەو کەسە بایەخ بە سروشت و بوون و دروستکراوە سروشـتییەکانی نـاو سروشت بدات)( جابر، ١٩٩٧، ل٢٥٦). هەر بۆیە گوزارشـتکردن لە سروشـت و سروشـتی خـود وەك خاسیەتێك خۆی چەسپاند، لەبەر ئەوە دەبینین، کە (ڕۆمانسییەکان بە شێوەیەکی فـراوان ڕوویان کـردە سروشـت و ستایشـی ژیـانێکی سـادە و سروشـتییان دەکـرد، ڕێـزی زۆریـان لە خودی سروشـتیش دەگـرت، تەنـانەت جـان جـاك ڕۆسـۆ بەوە دەنـاسرێتەوە، کە بانگەشـەی گەڕانەوە بۆ "سروشت"ی دەکرد، هەر بۆیە ڕووکردنە سروشت بووە تەکنیکێـك، لە تەکنیکـی بەکەسکردندا خـۆی نوانـد لە شـیعری ڕۆمانتیکەکانـدا)(شەمیسـا، ٢٠١٨، ل١٠١). ئیـتر سروشـتی دەرەکی لەگەڵ سروشـتی خـود ئـاوێتە دەبێـت و خـودی شـاعیریش بە هـۆی سروشـتەکەی خۆیەوە گوزارشت لەو سروشتە دەکات و وێنەیەکی نوێمان بۆ دەکێشێت.

ژیان دۆستی و مرۆڤ خوازی: ڕێزگرتن لە مـرۆڤ وەك بـوونەوەرێکی خـاوەن خـود بیرکردنەوەیەکی ڕۆمانسییانەیە، ئینجا ئەو مرۆڤە لە هەر تەمەن و چین و توێژێکی کۆمەڵ بێـت، ڕەگەزی پیاو بێـت یـان ژن ئەوا جیـاوازی نییە، بەڵکـو ڕێزگـرتن لە ئـافرەت جەختـی لەسـەر دەکرایەوە، لای هەندێك شاعیر تا ئاستی فریشـتە بـوون ڕۆیشـت، هەروەهـا زۆرجـار منـداڵ بوونێکی گەورەی پێ بەخشراوە لای ڕۆمانسییەکان، دەبێتە ڕەمـزی بەرائەت و سروشـتی پـاك، کە شاعیر بۆ ڕاکردن لە تەنگ و چەڵەمە و کێشەی ژیان و جەنجاڵیی شارستانیەت بـۆ قۆنـاغی منـاڵی دەگەڕایەوە، گوزارشـتی لە ژیـانی ئەو قۆنـاغە دەکـرد، بەمەبەسـتی بەرجەسـتەکردنی سروشتێکی پاك لە گوزارشتەکەی، ئیتر مرۆڤ بوونەوەرێکی بەهـادارە لە هەر فۆڕمێکـدابێت، ئەگەر لە سروشتی خۆی نەترازابێت.

خۆشەویستی و خەم و پەژارە: هەموو ئەو ڕەهەندانەی، کە بە ژیانی مرۆڤەوە پەیوەسـتن وەك "خۆشەویستی، پەرێشانی، ئـازار، ڕەشـبینی، غەمخـواردن، دابـڕان، هێمنـی، خەون، ڕۆح، مردن...تـا"، لە بیـری ڕۆمانسـیزمدا بوونیـان هەیە و لە بەرهەمەکانیانـدا، ڕەنگیـان داوەتەوە. ڕۆمانسییەکان خۆشەویستی دەکەن بە بنەمـا بـۆ تێگەیشـتن لە ژیـان و چـۆنییەتی مـامەڵەکردن

لەگەڵ دەوروبەردا، بۆیە ئافرەت پیرۆزییەکی زۆری هەیە لایان، لەبەر ئەوەی بکەر و سەرچاوەی خولقێنەری هەستی خۆشەویستییە. ڕۆمانسییەکان واقیع بە کانگەی بەڵا و خەفەت دەزانن بۆیە دەیانەوێت پەنا بۆ خەون و خەیاڵ ببەن و تەنانەت مردن وەك خەونێکی ئەدەبی بە حەسانەوەی هەمیشەی مرۆڤ دەزانن (لای ڕۆمانسییەکان مردن جیهانێکی نموونەییە، چونکە مرۆڤ لە ئێش و ئازار و خەم و پەژارە ڕزگار دەکات و بۆ هەمیشەیی مرۆڤ دەحەسێنێتەوە)(ابو العزم، ١٩٨١، ل٨٥). بۆیە ڕۆمانسییەت زیاتر گوزارشتە لە ڕەشبینی و خەمناکی خودی شاعیر، کە ئەم شاعیرە گوزارشتە لە مرۆڤەکان.

جگە لەو تەوەرانەی سەرەوە زۆر خاڵ و تەوەرەی تریش لە ناو خاسییەت و پرەنسیپەکانی ڕێبازی ڕۆمانسیزمدا، تێبینی دەکرێن، بەتایبەتی مەسەلە ڕووحییەکان و ئەو ڕەهەندە نافیزیکییانەی مرۆڤ، کە جەخت لە بەها و جۆراوجۆری تواناکاری مرۆڤ دەکەنەوە. هەروەها باس و خواسی ئەو ڕێبازە ئەدەبییە تەنیا بریتی نییە لەو ڕەهەند و تەوەرانەی، بەناوەوەی تاکەوە، پەیوەستن، بەڵکو زۆر مەبەست و ناوەرۆکی مرۆڤایەتی و ئایینی و کۆمەڵایەتی و ڕەخنەیی لەو ڕێبازەدا بەرجەستەیە یاخود زۆر بابەت و دیاردە و وروژێنەری دەرەکی لە پرەنسیپەکانی ئەو ڕێبازە جەختی لەسەر کراوەتەوە و لە بەرهەمە ئەدەبی و دەقە شیعرییەکانیشیاندا دەبینرێن، چونکە ڕۆمانسییەکان خۆیان یەکێك لە پرەنسیپەکانیان ئازادی بوو، بانگەشەی ئازادییان دەکرد لە پرۆسەی بەرهەمهێنانی دەقی ئەدەبیدا، بەڵام ئەوەندە هەیە، کە پێویستە هەموو باسکردنێك لە ناخی شاعیرەوە هەڵقوڵێت، بابەتە ناوەکی و دەرەکییەکانیش لە دید و تێڕوانینی شاعیرەوە بخرێنەوە ڕوو، لەگەڵ ناوەوەی شاعیر ئاوێتە بکرێن و دواتر شاعیر بەپێی خەسڵەتی خودییەتی خۆیەوە گوزارشت لە بابەتەکان بکات. واتە دەربڕینەکان بە فلتەری خودییەتی شاعیردا بڕۆن، بەمەش ئەو دەقە دەبێتە بەشێك لەو خودە و گوزارشتێکە لە ڕووحییەتی ئەو شاعیرە، بەمەش ڕۆمانسیزم لەسەر بنەمای ئەم خود و گوزارشتکردنە لەگەڵ تیۆری گوزارشتکردن یەك دەگرنەوە و یەك ئامانج دەیانجووڵێنێت.

**ڕۆمانسیزم لە ئەدەبی کوردیدا (لە بەرهەمی داهێنان)دا:**

ڕۆمانسیزم دوور لەو بارودۆخە مێژووییەی، کە لە ڕۆژئاوادا بۆ سەرهەڵدانی ڕێبازی ڕۆمانسیزم هاتە پێشێ و لە دەرەوەی ئەم مەنهەجیەت و بانگەشە فکری و ڕەخنە ئامێزەی

نووسەر و لێکۆڵەرانی ڕۆژئاوا دژی کلاسیزم پێشکەشیان کرد، کە دواجار ڕۆمانسیزمی وەك ڕێبازێکی سەربەخۆ لەسەر دامەزرا، سەبارەت بە ڕۆمانسیەت لە ئەدەبی کوردی و بەرهەمی داهێنراوی کوردی بە شیعر و پەخشانەوە بوونی هەیە، بوونی ئەو ڕۆمانسیەتەش بۆ ئەو ڕەهەند و خاسییەتانە دەگەڕێتەوە، کە ڕێبازی ڕۆمانسیەت جەختی لەسەر دەکاتەوە، بە شێوەیەکی گشتی ئەو خاسییەتانە لە دەقی شیعری کوردیدا بوونێکی فراوانی هەیە، بۆیە بەرهەمی شیعری کوردی لەگەڵ ڕێبازی ڕۆمانسیزمدا یەکانگیرە لەسەر بنەمای بوونی خاسییەتەکانی ڕۆمانسیزم تێیدا.

ئەگەر لەو ژینگە تایبەتی و هەلومەرجە مێژوویی و مەنهەجییەی ڕەخنە و ڕێبازی ڕۆمانسیزم دووربکەوینەوە و تەنیا لە ڕوانگەی خاسیەت و فکری ڕۆمانسی بوون و بنەمای خودییەت لە بەرهەمی شیعری کوردی بڕوانین، ئەوا دەبینین، تاکایەتی و خودی بوون و گوزارشتکردن لە پێکهێنەرە خودییەکان، بەشێکی سەرەکین لە پێکهاتەی شیعری کوردی، بەهۆی بوونی خاسیەت و توخمەکانی ڕۆمانسیزم لە بەرهەمی شیعری شاعیرەکان، دەقی شیعری کوردی سروشتێکی خودی و لیریکیانەی لەخۆگرتووە، ئەم سروشتە خودییەش لە شیعری کلاسیکی کوردی و شیعری نوێی کوردیدا دەبینرێت، بەڵام هەر قۆناغێك شێوازی تایبەت بەو خودییەتەی خۆی هەیە، کە پەیوەستە بە سروشتی سەردەم و ژینگەی کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری و ئایینی و هۆکارە سایکۆلۆژییەکانی کەسایەتی شاعیر و کۆمەڵگاوە.

لە شیعری کلاسیکی کوردیدا، دەقی شیعر بەشێوەیەکی گشتی خۆی لە گوزارشتکردنی شاعیر لە خودی خۆی دەبینێتەوە، شیعری کوردی لە هەر بارودۆخێکدا بێت، خۆی لە بەرهەمێکی کەسی دەبینێتەوە، بەو واتەیە شاعیر ویستوویەتی وێنەی خودییەتی خۆی پێ بکێشێت و هەست و سۆز و دنیابین و خەیاڵی خۆی پێ بەیان بکات، بۆیە شاعیر دەقی شیعری وەك هۆکارێك بەکار دێنێ بۆ گوزارشتکردن لە ڕەهەندە خودییەکانی وەك (هەست و سۆز و هەڵچوونەکان و غەم و خۆشی و شادییەکان و بیرکردنەوە و دنیابینی و حاڵەتە دەروونییەکانی تری خۆی)، باڵا دەستی بنەمای خودییەت و گوزارشتکردن لە خود وەك کلتوورێکی شیعر نووسین و سروشتێکی ئەدەبی و هونەری بڵاوبوویەوە، لە ئەدەبیاتی کوردیدا هەر لەسەرەتاوە ڕەگی داکوتاوە، شاعیرەکان بەپێی بارودۆخی سەردەم و ژینگەی

کۆمەڵایەتی و دەروونیی خۆی دەقی شیعری دەکاتە وێنەیەکی هونەری، کە گوزارشتە لە کەسایەتیی شاعیر و ڕووداو و گۆڕانکارییە خودییەکانی شاعیر، بۆیە دەبینین، کە تەنانەت بەشێکی ((شیعری کلاسیزمی کوردی بە شێوەیەکی گشتی خودییە و دەربڕی ناخی تایبەتی شاعیرە و بۆ ئەم مەبەستەش هەموو ئەو مەبەستە شیعرییانەی بەکاریان هێناوە دەچنەوە خانەی شیعری لیریك))(حوسێن، ٢٠٠٧ ل٦٠). شاعیری کورد لە بەرهەمە شیعرەکانی خۆیاندا وەك تاکێکی کارتێکراو بە دیاردەکانی سروشت و کۆمەڵگا لە ڕوانگەی ئەم پەروەردەی دەروونییەیەوە گوزارشت لە بوونی خودییەتی خۆی دەکات، ئەو خودەش پەیوەستە بە سەردەم و ژینگەی ژیانی شاعیر، چونکە حاڵەت و دۆخی دەروونی و هەست و سۆز و پێکهێنەکانی تری دەروونی شاعیر، کە شاعیر ئاراستە دەکەن و شێواز و چەندییەتی و جۆرییەتی گوزارشتکردنەکە دیاری دەکەن، بەرکاری ئەو سەردەم و ژینگەیەن، بۆیە گوزارشتکردن لە خود، لە شاعیرێك بۆ شاعیرێکی تر و لە سەردەمێك بۆ سەردەمێکی تر جیاکاری تایبەت بەخۆی وەردەگرێت، ئەم جیاکارییانەش لادان نییە لە بنەماکانی خودییەتی، بەڵکو هەموویان سروشتی خودییەتی دەقی شیعری دەسەلمێنن بە شێوەی جیاجیا.

بوونی خاسییەت و ڕەهەندە بنەماکانی ڕۆمانسیزم لە شیعری کلاسیکی کوردی و شیعری نوێی کوردیدا، جیاوازی هەیە. لە شیعری کلاسیکی کوردیدا، بەشێوازی تایبەت بەخۆی ڕۆمانسییەتێکی تەواوە لە دەقی شیعریدا بوونی هەیە، بەشێوەیەکی گشتی گوزارشتکردن لە (خۆشی و ناخۆشی و هەست و سۆز و خەیاڵ و بیرو بۆچوونی" شاعیر لە ناو مەبەستە شیعرییەکانی وەك "ستایش، شانازی، داشۆرین، لاواندنەوە، خۆشەویستی،....تاد"، ئامادەبییەکی تواوەی هەیە، سروشتێکی خودی و لیریکی بەسەر کۆی مەبەستە شیعرییەکانی شاعیرانی کلاسیکدا زاڵە و بە جۆرێکی سروشتی شیعری کلاسیکی ئەم قوتابخانەیە لە زۆر لایەنەوە، بەتایبەتی ناوەرۆك ڕۆمانسییەتێکی تەواوی لە هەناوی خۆیدا هەڵگرتووە، بۆیە ناتوانین لە دەرەوەی خودییەت و بنەمای ڕۆمانسییەت لە شیعری کلاسیکی کوردی بڕوانین و هەست و سۆز و بنەماکانی تری خودی بوون لەو قۆناغە دابڕین، چونکە (کلاسیزمی کوردی پڕە لە سۆز و دیدی ڕۆمانسییانە و توخمی ڕۆمانسیزم، واتە کلاسیزمی کوردی زۆر زوو چەند توخم و کەرەستە و بینینێکی ڕۆمانسییانەی تێ دەڕژێ)(پیربال، ٢٠٠٤، ل٤٦-٤٧). دەقی شیعری کلاسیکی چەندین خاسییەت و ڕەگەزی ڕۆمانسی لە خۆ گرتووە.

لە شیعری نوێی کوردیدا، بیری ڕۆمانسیانە زیاتر قووڵ دەبێتەوە گوزارشتکردن لە خود و هەست و سۆزەکان گۆڕانی بەسەر دادێت، خود بە شێوازێکی تر و لە ناو فۆڕمێکی هونەری تازەدا خۆی دەنوێنێت، کە لە ڕووی ناوەرۆکەوە ئەم هەستە خودییە پەیوەستە بەو بارودۆخە سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتییە لە دوای جەنگی یەکەمی جیهانییەوە دێتە پێشەوە، خاسییەتەکانی ڕۆمانسیزم لە شیعری ئەم قۆناغەدا زیاتر دەرکەوتەی هەیە، لەسەر بنەمای زانیاری و وشیاری شاعیر وەستاوە لە ڕێبازی ڕۆمانسیزم، بۆیە ڕۆمانسییەت لە شیعری نوێدا هەر تەنیا بریتی نییە لە بوونی هەندێك خاسییەتی گشتی ڕۆمانسیزم، بەڵکو هەوڵێکی مەنهەجی و بەرنامەدار بووە لەلایەن هەندێك شاعیری وەك (پیرەمێرد، گۆران، شێخ نووری شێخ سالح،...تاد) لەسەر بنەمای ئاگادارییان لە ڕێبازی ڕۆمانسیزمدا بووە. بۆیە دەبینین، کە ڕۆمانسییەت لە شیعری نوێی کوردی هەر لە ناوەرۆکی دەقی شیعریدا قەتیس نەبووە، بەڵکو ڕوخساری دەق و ڕەهەندەکانی تریشی گرتووەتەوە، شیعری کوردی، لەم قۆناغەدا گوزراشتە لەو خودەی ڕۆمانسییەکان بانگەشەیان بۆ دەکرد، کە خودێکی خاوەن بڕیار و ئاوێتە و تێکەڵە بە جوانی و بەرژەوەندیی گشتی مرۆڤ و بەها مرۆییەکان، هەروەك گۆران دەڵێت: (ئێستا ئارەزووی ئاواتەکانی گەل، داخوازی و پێویستییەکانی کۆمەڵ لە پاڵەوانی هەڵبەست داوا ئەکرێ، پاڵەوانی هەڵبەستی تازە تێکۆشەرە، هاوبەشی خەباتە)(گۆران، ١٩٦١،ل١٣٨). ئەو هەست و سۆزەی لە کلاسیکییەتدا گوزارشتی لێ دەکرا، لە شیعری نوێدا دەلالەتی تری وەرگرت، لە پێناو بەرژەوەندیی گشتی گەل و کۆمەڵگا دەردەبڕا، بۆیە خودییەت لە شیعری نوێدا بوو بەو خودییەتەی ڕۆمانسییەکان، کە خودێکی پەیامدارە و پەیوەستە بە ڕووداو و بارودۆخە کۆمەڵایەتی و کێشە جۆراوجۆرەکانی چین و توێژەکانی کۆمەڵەوە. واتە بەشێوەیەکی گشتی شیعری کوردی بەسروشتی نەتەوەیی و ناوچەیی و بەپێی قۆناغە شیعرییەکانی خۆیەوە ڕۆمانسییەتی لە خۆگرتووە، شیعری نوێی کوردی بە ڕێژەیەکی زۆرتر خاسییەتی ڕۆمانسیانەی لەخۆ گرتووە بە بەراورد بە شیعری کۆنی کوردی لەبەر ئەوەیە، کە شیعری نوێ لە خانەی ڕێبازی ڕۆمانسیزم دادەنرێت، بەڵام ئەوە مانای ئەوە نییە، کە شیعری کلاسیکی کوردی لە خاسییەت و ڕەگەزەکانی ڕۆمانسیزم خاڵییە، چونکە هەندێك لە شاعیرەکان هەر چەندە لە ڕووی مێژووییەوە لە قۆناغی کلاسیکدا بوونە وەك (مەولەوی، بێسارانی، وەفایی و وەلی دێوانە، بەنەوەی یەکەمی ڕۆمانسیزم دەژمێردرێن، کە لە تەکنیکدا

کلاسیك و لە ناوەرۆکدا ڕۆمانسی بوونە)(پیرباڵ، ٢٠٠٤،ل٨١). بەڵام بەشێوەیەکی گشتی شیعری کلاسیزمی کوردی بەو ڕێژە و شێوازەی شیعری نوێ خودییەتی و فکری ڕۆمانسیزمی لە خۆ نەگرتووە، هەتا هەست و سۆز و مەبەستە خودییەکانیش لە ڕووی جۆرییەتی گوزارشتکردنەوە تەواو بە ئاراستەی فکری ڕۆمانسیزم نەڕۆیشتووە.

بەشێوەیەکی گشتی شیعری کوردی، خاوەنی سروشتێکی خودی و لیریکییە بە هەر دوو جۆری شیعری کلاسیکی و شیعری نوێ، بەڵام هەریەکەیان بە فۆرم و شێواز و تایبەتمەندیی ژینگە و پێویستی دەروونی شاعیر و کۆمەڵگاکەی خۆی ئەم خودییەتەیان تێدا بەرجەستە کراوە. بۆ نموونە ئەگەر لە بنەمای هەست و سۆز وردبینەوە لە شیعری کلاسیکی کوردیدا، ئەوا بەشێوەیەکی گشتی دەبینین هەست و سۆز و خودییەت، بەپێی تایبەتمەندیی شیعری ئەوکات و لە چوارچێوەی ئەو بابەتانەوە دەربڕاوە، شاعیری کلاسیکی هەست و سۆزی خۆی لە ناو ڕوخسار و فۆڕمێکی هونەری زۆر بەرز دەئاخنی، بە جۆرێك ڕازاندنەوە و وشەکاری و هونەرەکانی ڕەوانبێژی و هونەرەکانی تری شیعری هێزی زاڵبوونی هەبوو بەسەر ئەو هەست و سۆزەدا، دەربڕینی هەست و سۆز بۆ یار یان گوزارشتکردن لەو هەڵچوونە دەروونییانەی بەهۆی یارەوە تووشی دەروونی شاعیر دەبێت، لە شیعری کلاسیکیدا پانتاییەکی زۆری هەیە، لە لێکۆڵینەوە ئەدەبییەکاندا لە ژێر ناوی شیعری "خۆشەویستی و دڵداری و وەسفکردنی یار و غەم و پەرێشانی،....تاد" ئاماژەی پێکراوە، شێوازی دەربڕینی هەست و سۆز بۆ ئەو مەبەستە خۆی لە ستایشکردن و وەسفکردنی جوانیی یار و پێداهەڵدانی ناز و عیشوەی یار دەبینێتەوە، واتە بەشێوەیەکی گشتی شیعری دڵداری گوزارشتە لە جوانی و بێباکیی یار و لاوازیی شاعیر، بەجۆرێك شاعیر هەست و سۆزی خۆی لە بەرگی سەرسوڕمان و موعجیب بوونی بە فیزیکییەتی یار دەردەبڕێت، وێنەیەکی نموونەیی بۆ ناز و جوانی و باڵادەستی یار دروست دەکات، خۆشی بە عاشقێکی زەلیل و گوناه بە مرۆڤێکی بریندار و سووتاو لەبەرامبەر جوانیی یاردا وەسف دەکات، واتە هەست و سۆزی شاعیر لە خۆشەویستیی یاردا لە دوو وێنەدا تەواوەتەوە وەسفکردنێکی بێباك و ئیرۆتیکیانەی یار و لاوازی و خۆ بێ دەستەڵاتکردن. کۆبوونەوەی هەڵچوونە دەروونییەکان و هەست و سۆزی یار لە دڵی شاعیرەکان کەسایەتییەکی ماشۆسیزمی بۆ شاعیر دروستکردووە، بۆیە دەبینین هەمیشە یار لە پلەی جوانیی موتڵەقدایە و شاعیریش لە سەرەمەرگی عەشق و نزمترین پلەی

لاوازیدایە. ئەم وێنە شیعرییانە گوزارشتکردنن لە سۆز و هەڵچوونە دەروونییەکانی شاعیر بەڵام سروشتی گوزارشتکردن لە خۆشەویستیی یار یاخود خاسییەتی شیعری دڵداری لەم قۆناغەدا بەم شێواز و وێنە شیعرییانە خۆی نواندووە، ئەگەر لەو جۆرە گوزارشتکردنە و ئەو شێوازە و وێنە شیعرییانەش بڕوانین، دەتوانین بە ئاسانی هەست بە سۆزی شاعیر و پاڵنەرە چەپێنراوەکان و هەڵچوونە هەستی و نەستییەکانی دەروونی بکەین.

لە شیعری نوێی کوردیدا، بنەمای هەست و سۆز و توخمە دەروونییەکانی تر لە فۆڕمێکی هونەریی نوێ، لە شێوازێکی شیعری گۆڕاودا، گوزارشتیان لێ دەکرێت، بابەت و شێوازی گوزارشتکردنی هەست و سۆزەکان ئاراستەی تر وەردەگرێ، چونکە سەردەم و ژینگەی کۆمەڵایەتی و سیاسی و ئاینی و ڕۆشنبیری گۆڕانی گەورەی بەسەر داهات، دوای جەنگی یەکەمی جیهانی مافی مرۆڤ و مافی ئافرەت و مافی گەلان و خەبات و تێکۆشان بوون بە باسوخواسی سەردەم و هاوسۆزی بۆ گەلان و هاوهەستی بۆ چین و توێژە جیاجیاکان لە لای خەڵك سەری هەڵدا و بیرکردنەوە و هەست و سۆزی خەڵك بەو ئاراستەیە پەروەردە بوون، ئەم پەروەردەیە شاعیرانیشی گرتەوە، هەست و سۆزی شاعیر لەژێر کاریگەریی ئەم بنەمایانە گەشەی سەند، ئەم بارودۆخ و هاوهەستی و هاوسۆزییەش لە شیعری نوێی کوردیدا ڕەنگدانەوەی خۆی هەبوو، بۆیە دەبینین هەست و سۆزی شاعیرانی نوێی کورد بۆ زۆر مەبەست و بابەتی تر ئاراستە کراوە، جگە لە سێکوچکەی "یار، پیر، میر"، کە "گۆران" باسی دەکات، تەنانەت شێوازی گوزارشتکردن و باسکردن لە یار و میر و پیر گۆڕانی بەسەرداهات، ((شیعری نوێی کوردی گۆڕانکاری زۆری لە ڕەگەزەکانی شیعر بەسەرهات، بە وێنە هەندێك ڕەگەزی وەکو "ستایش و داشۆرین نەما و داشۆرینی ڕامیاری و ناوەرۆکی نەتەوەیی جێگای گرتەوە، بەجۆرێك کە لەگەڵ گیانی سەردەمدا بگونجێت، هەروەها دڵداری لە باسوخواسی وەسفی دڵدارەوە گۆڕا بۆ وێنەیەکی جوان لە ویژدانی شاعیر و زیاتر پشت بە وەسفی زیندوو دەبەستێت و مانای مرۆڤایەتی و بیری وشیارانە تێکەڵ بە شیعری نوێ بووە، هەروا شێوازی شیعری نوێی کوردی لیریکە و ناو بەناو دیالۆگی تێکەڵ دەبێت(کەریم، ٢٠٠٥،ل٩٥). ئەوەی ئێمە لێرەدا مەبەستمانە بوونی جۆری هەست و سۆز و هەڵچوونە دەروونییەکانی شاعیرە لەگەڵ شێواز و چۆنییەتی گوزارشتکردن لێی، بۆ نموونە شیعری دڵداری دیسان لە شیعری نوێشدا ڕێژەیەکی بەرچاو دەگرێتە خۆی، بەڵام هەست و سۆزی خۆی ئاراستەی فیزیکییەتی یار نەکردووە بۆیە شیعرەکان وەك شیعری کلاسیکی ئەو وەسفە ئیرۆتیکییە ئەبستراکتە

ناگرنەوە، بەڵکو ئیرادە و ویست و حەز و ئارەزوو ئینسانییەتی ئافرەتیش دێتە پێشەوە، ڕەهەنـدە نافیزیکییەکانی ژن وەك ڕەوشت بەرزی و خەمخۆری و هەستی دایکایەتیش دەبێتە چەقێـك و هەست و سۆزی شـاعیر بـۆ خـۆی ڕادەکێشـێت، هەروەك گـۆران دەڵێـت: (هەسـتکردن بە جوانی ئەبێ لە سنووری تەسکی جوانییەکانی ئافرەت و سروشتدا ڕانەگیرێت، بەڵکـو دەبێـت ڕادەی هەستکردن بەجوانی بۆ بەرهەمی هونەری و ڕەوشت و بیرکردنەوە و هاوهەسـتی کـردن لەگەڵ ژیان بەجۆرێك هەست لەگەڵ ئەو شتانە نەبێـت، کە ژیـان لەبەر چـاو دەخەن)(گـۆران، ١٩٦١، ل ١٣٩ــ ١٤٠). لەم قۆنـاغەدا لایەنەکـانی جەسـتەی یـار بەتەنیـا نـاتوانن سـۆزی شـاعیر بجووڵێنن، بەڵکو ئەو سیفەت و ڕەوشت و پێکهێنە نامەعنەوییەکـانی تـری یـار کاریگەرییـان بەسـەر هەسـتی شـاعیرەوە هەیە و هەسـت و سـۆزی شـاعیر دەجـووڵێنن و جـوانی و چێـژی پێدەبەخشن.

بەشێوەیەکی گشتی شـاعیری کـورد، زیـاتر لە ژێـر کـاریگەریی هەڵچـوون و هۆکـارە دەروونییەکاندایە و لە ژێر بنەمای هەست و سۆزدا گوزارشتی لە پەیام و مەبەسـتە شـیعرییەکانی خۆی کردووە، ئەم هەست و سۆزەش دەرکەوتەی جۆراوجـۆری هەیە و شـێواز و چـۆنییەتی ئەو دەرکەوتەیەش بە دوو قۆنـاغی شـیعرییەوە پەیوەسـتە، لە شـیعری کلاسـیکیدا، زەڕفێکـی دیاریکراوەی هەیە و لە دەوری چەند کەس و بابەتێك دەسووڕێتەوە، کەوتووەتە ژێر دەسـتی ڕوخسار و لە ناو خاسییەتە هونەرییەکانی تری ڕێبازی کلاسیکیدا تـواوەتەوە، بەڵام لە شـیعری نوێدا شێوازی گوزارشتکردن لەو هەڵچـوون و هەسـت و سـۆزە، بەلای ڕێبـازی ڕۆمانسـیزم و خاسـییەتە هونەرییەکـانی ئەم ڕێبـازە شـکاوەتەوە، بـۆیە فـرە ڕەهەنـدتر و ئاراسـتەی زیـاتر و جۆراوی جۆری وەرگرتووە.

**سیماکانی ڕەخنەی ڕۆمانسیزم لە ڕەخنەی کوردیدا:**

فکری ڕۆمانسیزم لە شوێنێکی دیاریکراو نەوەستا و، هەر تەنیا لە نـاو شـیعر و بـابەتێکی دیاریکراویشدا جێگیر نەبوو، بەڵکو پەلی بۆ جوگرافیای تر هاویشت و ژانری تـری ئەدەبـی و بابەتی فکری و ئەدەبیاتناسیشی گرتەوە، لە ناویشیاندا ڕەخنەی ئەدەبیشی لـێ مـوتربە کـرا، واتە هەر تەنیـا لە سـنووری داهێنـانی ئەدەبـی نەوەسـتا بەڵکـو زانسـتی ئەدەبیشــی گــرتەوە، لەو ڕووەوەش زۆر وتار و لێکۆڵینەوەی فکری و ڕەخنەیی بڵاوبوویەوە، ((ڕێبازی ڕۆمانسیزم تەنیـا لە بواری شـیعر و چیـرۆك و ڕۆمـان و هـونەری شـێوەکاریدا، دەرنەکەوت بەڵکـو لە ڕەخـنەی

ئەدەبـی و هونەریشـدا تایبەتمەنـدی خـۆی هەبـوو،))(حوسـێن،٢٠٠٧،ل٩٣). کۆمەڵێـك ڕەخنەگـری ڕۆمانسـی وەکـو "وردز وۆرس، کـۆلیردج، شـیللی، گـۆتە، سـانت بیڤ..تـاد"، سەرەڕای بەرهەمی ئەدەبی لە بواری تیۆری ئەدەبی و ڕەخنەی ڕۆمانسیشدا دەستێکی باڵایـان هەبـووە و لە نووسـینی وتـار و لێکـۆڵینەوە لە بـواری ئەدەبیاتناسـیدا، کە لەسـەر بنەمـای دژایەتیکردنـی کلاسـیزم و بـاوەڕبوون بە فکـر و فەلسـەفەی ڕۆمانسـیزم، چەنـدین مەرج و خاسییەت و بۆچوونی ڕۆمانسییان بۆ ژانرەکـانی دەقـی ئەدەبـی پێشـکەش کـردووە، لە ڕووی "زمان، بابەت، هەست و سۆز، خەیاڵ، وێنەی شیعری، شێواز و ڕوخساری دەق...تـاد"، کە ئەو لێکۆڵینەوانە وەك بنەمایەك ڕەخنەیی ڕۆمانسیزمی لەسـەر دامەزرا، هەروەهـا وەك مەنەفێسـت و بەیاننـامەی ڕەخنەیـی و شۆڕشـی ئەدەبـی کـاریگەری مەزنیـان لەسـەر سـەرهەڵدانی دەقـی ڕۆمانسـی هەبـووە، ڕۆڵیـان هەبـوو لە ئاراسـتەکردنی شـاعیر و نووسـەرانی ئەو سـەردەمە و دواتـریش بـۆ فکـر و بیرکـردنەوەی ڕۆمانسـیانە، واتە ئەو لێکـۆڵینەوە ڕەخنەییـیە ڕۆمانسـییانە بەرهەم و لێکەوتەی ئەدەبی و هـونەری هەبـوو، کە بـریتییە لە شـیعر و ژانـری تـری ئەدەبـی بە تایبەتمەندی ڕۆمانسییانە.

سەبارەت بە بوونی ڕەخنەیەکی ڕۆمانسییانەی لەم شێوەیە لە ئەدەبی کوردیـدا، ڕاسـتە لە دوای چـارەکی یەکەمـی سـەدەی بیسـتەمەوە، بەهـۆی پەیـدابوونی چـاپ و چـاپەمەنی و ڕۆژنـامەوانییەوە، کۆمەڵێـك لێکـۆڵینەوە و وتـاری ڕەخنەیـی دێـنە پێشـەوە، کە بەشـێکیان لە ڕووپەڕی ڕۆژنامەکـان بڵاودەکـرانەوە، بەڵام ڕەخـنەی کـوردی هێـزی ئەو ئاراسـتەکردنەی نەبـووە، بەشـێوەیەکی گشـتی لە ئەدەبـی کوردیـدا، بە تـایبەتی لە ئەدەبیاتناسـی کرمـانجی خوارووDا، کە لە هەموو قوتابخانەکانی ئەدەبیاتی کوردی زیاتر وتار و لێکـۆڵینەوەی تیـۆری و ڕەخنەیی و مێژووییشی بەخۆیەوە بینیوە، تەوژمێکی فکری و فەلسـەفی سـەری هەڵـنەداوە کە هەڵگـری گوتـارێکی ڕەخنەیـی ئەدەبـی بێـت لەسـەر ئەو نەهـجە فکـری و فەلسـەفییە، واتـا ڕەخـنەی کـوردی نەیتوانیـوە ببێـت بە مەنەفێسـت و گوتـارێکی ئاراسـتەکەر، بە جۆرێـك نەخشەیەکی تیۆری و ڕەخنەیی پێشکەش بکـات، بـۆ بینـاکردنی دەقـی شـیعری و ژانرەکـانی تری ئەدەبی لەسەر ئەم نەخشە ڕێگەیە، دەقی ئەدەبی لەسەر گوتـاری ڕەخنەیـی و نەخشـەیی تیۆری خۆی فۆڕمەلە نەکردووەتەوە، بۆیە ڕەخنەگری کورد لە ڕێـگەی گوتـاری ڕەخنەییـیەوە نەیتوانیوە گۆڕانکاری لە ڕیشەی دەقی ئەدەبیدا بکات، یان ئەدەبێکی نوێ بهێنێتەکایەوە، بـۆیە

ڕەخنەگری کورد لە ڕێگەی ڕەخنەوە هەرگیز نەیتوانیوە ببێت بە شۆڕشگێڕی ئەدەبی و ئینقیلاب بەسەر ئەدەبدا بکات، بەڵکو لە ڕێگەی دووەم ئەم کارەی ئەنجامداوە، شاعیر لە ڕێگەی بەرهەم و داهێنانی شیعری ئەو ڕۆڵەی بینیوە، بۆنموونە لە سەرەتای قوتابخانەی کرمانجی خواروو، نالی لە ڕێگەی شیعر نووسینی بە زمانی کوردی توانیویەتی ئینقیلابێکی ئەدەبی بەسەر ئەدەبی باوی ئەو سەردەمەدا بکات، هەروەها لە دوای جەنگی یەکەمی جیهانییەوە، گۆڕانکاری و نوێبوونەوەی شیعری کوردیش لەم قوتابخانەیەدا دیسانەوە لە ڕێگەی بەرهەمی داهێنراو واتە دەقی شیعری بووە نەك نەخشە ڕێگای ڕەخنەیی، هەروەکو ڕەفیق حیلمی دەڵێ: (شێخ نووری شێخ ساڵح زەعیمی ئینقیلابی شیعری کوردییە لە ناوچەی سلێمانی، ئەوانەی کە ئەمڕۆ خۆیان بە دامەزرێنەری شیعری تازە دەژمێرن ئەبێ بزانن، کە یەکەم بەردی بناغەی قوتابخانەکەیان لەلایەن شێخ نووری شێخ ساڵحەوە دانراوە)(حیلمی، ٢٠١٠،ل ٢٣٠-٢٣١). "شێخ نووری شێخ ساڵح و گۆران" لە ڕێگەی ئەو شیعرە نوێیانەی، بە کاریگەری دەرەکی دەنووسران، توانییان کاریگەری لەسەر گۆڕانی شیعری کوردی ئەم قوتابخانەیە دروست بکەن، لە کاتێکدا هەر یەکە لە "شێخ نووری شێخ ساڵح و گۆرانی شاعیر" لە بواری ڕەخنەشدا، وتاریان پێشکەش کردووە. شێخ نووری شێخ ساڵح لە ساڵی (١٩٢٦ــ١٩٢٧) بیست و پێنج وتاری ڕەخنەیی و تیۆری لە ڕۆژنامەی "ژیان" بە ناوی "ئەدەبیاتی کوردی" بڵاوکردەوە، هەروەها گۆرانیش نووسین و وتاری ڕەخنەیی پێشکەش کرووە بۆ نموونە لە ساڵی (١٩٦١) لە گۆڤاری "هیوا"دا، وتاری (کۆن و تازەیی لە هەڵبەستا) دەبینرێت. بەڵام ئەوەی تێبینی دەکرێت، ئەوانە لە ڕێگەی دەقی شیعرییەوە کاریگەرییان هەبووە و بەرچاوڕوونییان داوە بۆ نوێکردنەوەی شیعری کوردی، وتار و لێکۆڵینەوە ڕەخنەییەکانیان، خۆی لە هەڵسەنگاندنی ئەدەبی داهێنراوی نووسراو دەبینێتەوە بە هۆی بوونی زانیاری و مەعلوماتەوە نەك بە هۆی باوەڕ و بۆچوونی فکری و فەلسەفی، بۆیە ڕەخنەکانیان یەك نەهجی فکری و فەلسەفی لە خۆ نەگرتووە، بە یەك ئاراستەی بیرکردنەوە لە پرۆسەکە ناڕوانن، ڕەخنەی هەر یەکێکیان زانیاریی تێکەڵاوی لە خۆ گرتووە، هەڵسەنگاندنێکی خودییە و سەر بە هیچ میتۆدێکی ڕەخنەیی وەك "دەروونی، کۆمەڵایەتی، مێژوویی، بنیادگەری،....تاد" نین، هەروەها سەر بە ڕەخنەی ڕێبازە ئەدەبییەکانی وەك کلاسیزم و ڕۆمانسیزمیش نین.

وتارە ڕەخنەییەکانی شێخ نووری شێخ سالْح کۆمەلێك بنەما و ئاماژەی تێدایە، لە کلاسیزمدا ئاوڕی لێدراوەتەوە هەندێکیشیان لە ڕەخنەی ڕۆمانسیزمدا جەختی لەسەر دەکرێتەوە، وەك دەبینین لە لایەك جەخت لە مەسەلەی (عەقڵ، مەهارەت، سنعەت و سەنعەتبوونی ئەدەبیات)، دەکاتەوە، کە بەلای کلاسیزمەکانەوە وەك بنەمایەك بایەخی پێدراوە، لەلایەکی تریش باس لە "حیسی لەتیف و خەیاڵی بەدیع و چێژی ڕوحی" دەکاتەوە، کە ڕەخنەی ڕۆمانسیزم لەسەری دەوەستێت، بە هەمان شێوە (گۆران)ی شاعیریش، تەنیا ئاماژە بەو خاسییەت و بنەما ڕەخنەییانە ناکات، کە تەنیا پەیوەستن بە ڕەخنەی کلاسیکی یان ڕەخنەی ڕۆمانسی. بۆیە دەتوانین بڵێین لە ئەدەبیاتناسی کوردیدا، ڕەخنەیەکی کلاسیکی تەواو یاخود ڕەخنەی ڕۆمانسی تەواومان نییە، بەڵکو بەشێکی ڕەخنەی ڕۆمانسی لەو لێکۆڵینەوە و وتارە ڕەخنەییانە دەبینرێن، بەڵکو بەشێوەیەکی لابەلا لە ئەنجامی شیکردنەوە و لێکدانەوەی شیعرەکانی هەندێك لە شاعیرەکان و لە پاڵ قسەکردن لە سەر ژیان و شاعیرییەتی شاعیرێك ئەو ڕەخنەگرانە ئاماژەیان بە بنەما و چەند خاسییەتێکی ڕێبازی ڕۆمانسیزم کردووە، کە لە شیعری ئەو شاعیرە تێبینی کراوە. بۆ نموونە شێخ نووری شێخ سالْح لەو زنجیرە وتارانەی، کە لە ڕۆژنامەی ژیان بڵاوی کردنەوە، باس لە هەندێك بابەتی تیۆری ئەدەبی و بنەمای ڕەخنەیی دەکات، وەك "سروشتی ئەدەب، چییەتی شیعر، جوانناسی، کاریگەری دەروونیی ئەدەب لەسەر خوێنەر، سوود و چێژی ئەدەبی ...تاد"، هەروەکو دەڵێت: ((مادام ئەدەبیات سنعەتە و سنعەتیش بە وەسائیتەی موختەلیفە لە ڕۆحدا، تەحسیل حەز "حض" و هەیەجانی بەدیعیە، ئەدەبیاتیش "سنعەتی کەلام" بە واسیتەی قسە و تەرزی ئیفادەوە لە ڕۆحدا تەوەلودی هەیەجانی بەدیعییە))(نووری، ژ/ ٢٢، ل١). شێخ نووری لەم وتارانەدا، بە باگراوەندێکی مەعریفی و لە ژێر کاریگەریی بۆچوون و ڕەخنەی عەرەبیدا، بابەتە تیۆرییەکانی لە ڕووپەڕی ڕۆژنامەیەکدا خستووەتەڕوو، (شێخ نووری بە حوکمی ئەوەی سەرنووسەری ڕۆژنامەی ژیان بوو، توانی ٢٥ ئەڵقە لە نووسینە ڕەخنەییەکەی بەناونیشانی "ئەدەبیاتی کوردی" لە ڕۆژنامەکەیدا بەناوی (م نووری) بڵاوبکاتەوە... خوێنەرانی ئەو ٢٥ ئەڵقەیەی وتارەکانی شێخ نووری بۆیان دەردەکەوێ، کەوا شێخ نووری لەژێر کاریگەریی هەندێ لە ڕەخنەگرانی کۆنی عەرەبدا بۆچوونەکانی خۆی خستۆتەڕوو، هەرچەندە لە ڕووی ئەمانەتی زانستییەوە دەبوایە ئاماژەی بەو سەرچاوانە بکردایە، کەوا سوودی لێ بینیون،... ئەم نووسینە ڕەخنەییەی زیاتر

تیۆرییە و تاڕادەیەك لە بازنەی تیۆری ئەدەبیدایە) (جاف، گەرمیانی، ٢٠١٤، ل:٧٤٦). شێخ نووری شێخ ساڵح لەم بۆچوونانەیدا، سەرەڕای بۆچوونی جۆراوجۆر لەسەر ئەدەب، کە زیاتر بەلای ڕوخساری ئەدەب و دەقی شیعریدا دەشکێتەوە، ئەوا بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ لە دەرەوەی میتۆدییەتەوە ئاماژەی بەچەند بنەمایەکی ڕەخنەیی کردووە، کە دەکەونە ناو بازنەی ڕەخنەی ڕۆمانسیزمەوە، بەتایبەتی کاتێك دەبینین جەخت لەوە دەکاتەوە، کە شیعر کاریگەریی ڕووحی بەسەر هەستی خوێنەرەوە هەیە و هەست و گیانی دەوروژێنێت، بۆ ئەم مەبەستەش شیعر سوود لە خەیاڵ و جوانکاری وەردەگرێت.

گۆرانی شاعیریش لە وتارەکەی خۆیدا لە میانەی خستنەڕووی جیاوازی شیعری کۆن و نوێی کوردی، ئاماژەی بە چەندین خاڵ و تەوەرە کردووە، کە ڕاستەوخۆ بە بنەما و فکری ڕۆمانسیزمەوە پەیوەستن، بۆ نموونە ((هەڵبەستی کۆن شەقڵی دەرەبەگییەتی پێوەیە و لە لایەکی تریشەوە هەڵبەستی کۆن زۆربەی زاتییە،... بەهەا هونەرییەکانی سەردەمی دەرەبەگییەتی سەردەفتەریان پاڵەوان پەرستی بوو، پاڵەوانی بابەتی هەڵبەست سێکوچکەی "یار ، میر و پیر"بوو))(گۆران، ١٩٦١، ل١٣٨). لێرەدا گۆران باس لە هەست و سۆزی شیعری کۆنی کوردی دەکات، کە لە ڕێگەی خودی لە پێناو بەرژەوەندی و حەزی خودی گوزارشتی لێ کراوە.

بەهەمان شێوە لە شیعری نوێی کوردیدا، ئاماژە بە بنەمای هەست و سۆز دەکات، کە گوزارشتکردن لە خود و پێکهێنە خودییەکان گۆڕانی بەسەر دادێت، خود بە شێوازێکی تر و لە ناو فۆڕمێکی هونەری تازەدا خۆی دەنوێنێت، کە لە ڕووی ناوەڕۆکەوە ئەم هەستە خودییە و گوزارشتکردن لێی گرێدراوە بە بارودۆخە سیاسی و کۆمەڵایەتی و سروشت و کێشە تایبەتی و گشتییەکانی مرۆڤ. لێرەدا خودێکی خاوەن بڕیار خودێکی جووڵاو خودێکی ئاوێتە و تێکەڵ بە جوانی و بەرژەوەندیی گشتی مرۆڤ و بەها مرۆییەکانە، هەروەك گۆران دەڵێت: (ئێستا ئارەزووی ئاواتەکانی گەل، داخوازی و پێویستییەکانی کۆمەڵ لە پاڵەوانی هەڵبەست داوا ئەکرێ، پاڵەوانی هەڵبەستی تازە تێکۆشەرە، هاوبەشی خەباتە)(گۆران، ١٩٥١، ل١٣٨). ئەم هەست و سۆزەی، کە گۆران لە شیعری نوێی کوردی ئاماژەی پێکردووە، ئەو جۆرە هەست و سۆزەیە، کە لە ڕەخنەی ڕۆمانسیزمدا جەختی لەسەر دەکرێتەوە، هەروەکو "گۆران"ی شاعیر دەڵێت: (هەست کردن بە جوانی ئەبێ لە سنووری تەسکی جوانییەکانی

ئافرەت و سروشت ڕانەگیرێ و پەرەی پێ بدرێ، تا ئەوپەڕی ڕادەی هەستکردن بە جوانی بەرهەمێکی هونەری یان ڕەوشتێکی جوان، یان بیرێکی بەرز، یان خوویەکی شیرین، یان فرمانێکی بەکەڵك، یان کردەوەیەکی شۆڕشی خۆ بەختکەرانەی تێکۆشەر)(گۆران، ١٩٦١، ل١٤٠). هەروەها گۆران جەخت لە بنەمای خەیاڵ دەکات، کە لەشیعری نوێدا بوونی هەیە، بەجۆرێك، کە لەگەڵ فکری ڕۆمانسیزمدا دێتەوە، هەروەکو دەڵێت: (ئەندێشە کاتێك نرخی دەبێت، کە وێنەی هەستە پەسەندەکان بکێشێت وەك هاوهەستی لەگەڵ ژیان و ڕەوشتی جوان و بیرێکی بەرز و خوویەکی شیرین و کارێکی سوودبەخش و کاری خۆبەختکردن و تێکۆشان و هاوهەستی لەگەڵ ژیان، نەك وێنەی دێوەکانی ئەسکەندەر نامە و دێوەکانی مازیندەران، کە هەرگیز ناتوانێ تێنوویتی خاوەن چێژێکی ئەدەبی بشکێنێت، ئەو جۆرە خەیاڵانە لە ڕیزی کەڵکەڵە و ئەوهام ئەژمێردرێن، شیعری کۆن لە خەیاڵی لێکدانەوە دەوڵەمەندە وەك چوانـدنی چاو بە نێرگس، بەژن بەسەروی ڕەوان، ڕوومەت بە پەڕەی گوڵ)(گۆران، ١٩٦١،ل١٤٠). گۆران لەم وتارەیدا، لە ڕووی ڕوخسار و ناوەرۆکەوە ئاماژە بە چەندین بنەما و خاسیەت دەکات، کە ڕاستەوخۆ بە ڕەخنەی ڕۆمانسیزمەوە پەیوەستن، بەڵام هەریەکە لە وتارە ڕەخنەییەکانی گۆران و شێخ نووری شێخ سالح، لەبەر ئەوەی گشتین و پشتیان بە زانیاری و خوێندنەوەی ڕۆشنبیریانەی کەسی بەستووە و دوور لە ڕێبازێکی دیاریکراوی ئەدەبی و میتۆدێکی ڕەخنەیی خۆی دەبینێتەوە و نەبووە بە بەیاننامە و مەنەفێستی ڕەخنەی ڕۆمانسیزم. بەڵکو لەپاڵ زۆر بۆچوونی تر بۆچوون و بنەمای ڕۆمانسیانەشی لە خۆی گرتووە.

بە شێوەیەکی گشتی ئەم شێوازە نامیتۆدییە لە لێکۆڵینەوە و گوتاری ڕەخنەیی لە لای نووسەر و ڕەخنەگرانی کورد تێبینی دەکرێت، لە بەرهەمە ڕەخنەییەکانی هەر یەکە لە (ڕەشید نەجیب، شێخ نووری شێخ سالح، ڕەفیق حیلمی، سیاپۆش، پیرەمێرد، گۆران، شێخ محەمەدی خاڵ، عەلائەدین سەجادی، کاکەی فەلاح،.....تاد"بڕوانین، ئەو شێوازە ڕەخنەگرتنەمان بۆ دەردەکەوێت، کە ڕەخنەیەکی گشتی و تێکەڵە و لەسەر بنەمای زانیاریی کەسی بەڕێوە چووە، بۆیە ڕەخنەیەکی تەواو کلاسیکی یان ڕەخنەیەکی تەواو ڕۆمانسی، لە ڕەخنەی کوردیدا بەو وێنەی لە ڕەخنەی ڕۆژئاوادا هەیە تێبینی ناکرێت، ڕەخنەگرەکانمان لە پاڵ قسەکردن لە خاسیەتە کەسییەکانی شاعیرێکی دیاریکراو و لە چوارچێوەی تایبەتمەندیی شیعری ئەو

شاعیره ئاماژەیان بە هەندێ بنەمای تیۆری و ڕەخنەیی کردووە، ئینجا دەشێت ئەو بنەمایە خاسیەتێك بێت لە ڕێبازی کلاسیزم یان ڕۆمانسیزم، یاخود دوو تایبەتمەندی لە شاعیرێك دەستنیشان دەکات کە یەکێکیان کلاسیکیە و ئەوەی تریان ڕۆمانسیە، هەروەك دەبینین کە (ئەمین فەیزی بەگ و پیرەمێرد) لە باسی (نالی)دا ئاماژەیان بە بنەمای سنعەتکاری سەنعەتی شیعری کردووە، بەڵام بۆ شاعیرانی تر هەمان بۆچوونیان نییە و ئاماژە بە هەمان بنەما ناکەن، هەروەها (ڕەفیق حیلمی) لە پاڵ قووڵبوونەوە لە شیعری هەندێك شاعیر و باسکردنی ژیانی ئەو شاعیرانە، جەختی لەسەر هەندێ خاسیەت کردووەتەوە لە سنووری تایبەتمەندیی ئەو شاعیرانە، بۆ نموونە لە سەر تایبەتمەندیی شیعری گۆرانی شاعیردا پێی وایە، کە گۆران ئیلهامی شیعری لە جوانی سروشت وەرگرتووە، شاعیرێکی واقیعیە، سوودی لە ڕوودۆخی ژیان و ژیانی کۆمەڵایەتی وەرگرتووە، ئەم تایبەتمەندییانەی، کە ڕەفیق حیلمی لە پاڵ گۆران باسیان لێوە دەکات، وەك خاسیەتی ناو ڕێبازی ڕۆمانسیزم جەختی لەسەر دەکرێتەوە، هەروەها لە پاڵ باسکردنی شاعیرەکانی تردا، دیسان باس لە چەندین خاسیەت و بنەمای تری کلاسیکی و ڕۆمانسی دەکات، لە چوارچێوەی تایبەتمەندیی خودی شاعیرییەتی شاعیرەکە، بۆ نموونە لە شیعرەکانی (ئەحمەد بەگی ساحێبقران، سالم، نالی،...تاد"، جەخت لەسەر سەنعەت و شارەزایی شاعیرەکان دەکاتەوە، بەڵام لە شیعری هەر یەکە لە (دلدار، ڕەمزی، سەلام) ئاماژە بە هەندێك خاسیەتی شیعریان دەکات، کە دەکەونە ناو بازنەی بابەت و خاسیەتی ڕۆمانسیزمەوە، وەك "کێشەی کۆمەڵایەتی و بابەتی واقیعی، خەیاڵی واقیعی، بیری نەتەوەیی،"، هەروەها لە باسی (کەمالی)دا، ئەوەی خستووەتەڕوو، کە شیعرەکانی ناسك و بە سۆزن و کاریگەریی نالی بەسەرەوەیە و نالیش بە ناسکی هەست و خەیاڵ و بیر ورد وەسف دەکات *. بەم شێوەیە ڕەفیق حیلمی لە لێکدانەوە و شیکردنەوەی شیعری ئەو شاعیرانە وەك ڕەخنەگرێك ئاماژەی بە زۆر بنەما و خاسیەتی ڕۆمانسی کردووە و بەڵام لەسەر یەك بنەمای فکری و فەلسەفی یاخود بەپشت بەستن بە میتۆد و ڕێبازێکی ئەدەبی وەك ڕۆمانسیزم نەبووە، بۆیە دەبینین لە پاڵ ئەو بنەمایانەدا بنەمای تریش ئاماژەیان پێکراوە، کە دژ بە فکری ڕۆمانسیزم دەوەستێت، نامەنهەجی و ناڕۆمانسی بوونیش لە ڕەخنەکەدا لەوەوە سەرچاوە دەگرێت. ئەم جۆرە ڕەخنە و لێکۆڵینەوەیە لە لای زۆربەی ڕەخنەگران دەبینرێت، کە لە هەمان کاتدا، دوو بنەما و خاسیەتی دژ لە فکر و فەلسەفەدا کۆدەکەنەوە و هەڵسەنگاندنی بۆ دەکەن، بۆ نموونە

عەلائەدین سوجادی لە لێكۆڵینەوەكانی خۆی لەسەر شاعیران زۆر بنەما و بۆچوونی دژیەكی وەك "بیر و هەست و سۆز، خەیاڵ، فیتری، ئیلهام، شارەزایی، وەستاكاری، هونەر،....تاد"، دەخاتەڕوو، بۆ نموونە تەنیا بۆ بوونی سەرچاوەی شیعری، ئاماژە بۆ دوو ڕەهەندی ناكۆك لە یەكتر دەكات، (یەكەمیان شیعر بەناوی شاعیر دەبەستێتەوە، پێی وایە دەبێ شاعیر ، پێش هەموو شتێك توانایەكی لە ناوەوەی خۆیدا هەبێ، بۆیە جەخت لە وشەكانی سروشت و ئیلهام و فیتری و سۆز دەكاتەوە)(سایر،٢٠٠٨،ل٤١). لێرەدا ئەم بۆچوونەی سوجادی دەچێتە ناو ڕەخنەی ڕۆمانسییەوە و پەیوەستە بە فكر و فەلسەفەی تیۆری گوزارشتكردنەوە، بەڵام هەر لە پاڵ ئەو بۆچوونەدا، (ئاماژە بۆ بوونی توانایەكی تر دەكات، ئەویش توانا دەرەكییەكەیە، بۆ ئەمەش جەخت لە "شارەزایی، وەستاكاری، وردەكاری، فەن و هونەر" دەكاتەوە)(سایر،٢٠٠٨، ل٤١). بنەمای سنعەت و وردەكاری هونەریش بنەمایەكە وەك خاسییەتێك لە ڕێبازی كلاسیزمدا جێگەی خۆی هەیە.

ئەو ڕەخنەگرەی، كە لە هەموویان زیاتر بە تەنگ دەرخستنی ڕێبازە ئەدەبییەكان بووە، لە لای شاعیران و لەسەر بنەمای تایبەتمەندی و خاسییەتی ڕێبازی كلاسیك و ڕۆمانسی و ڕیالیزمی قسە لەسەر شاعیرییەتی شاعیرەكان دەكات، "كاكەی فەلاح"ە. لە كتێبی (كاروانی شیعری نوێی كوردیدا) كاكەی فەلاح باس لە كۆمەڵێك شاعیر دەكات، لە ڕوانگەی پرەنسیپ و خاسییەتەكانی ڕێبازە ئەدەبییەكانی وەك (كلاسیزم و ڕۆمانسیزم و ریالیزمی سۆشیالیزمی و ڕێبازی ریالیزمی شۆڕشگێڕانەوە)، بۆ نموونە لە زۆر ڕووەوە باس لە ڕۆمانسییەتی (ئەحمد هەردی) دەكات و بە هۆی بوونی تایبەتمەندی لە (بابەت و مەبەستی شیعری، هونەری شیعری، دەربڕین، زمان ...تاد)، شیعری هەردی بە شیعری ڕۆمانسیزم لەقەڵەم دەدات، لە هەمان كاتدا ئاماژە بەگۆڕانی شیعری هەردی دەكات بۆ ڕێبازی ڕیالیزمی شۆڕشگێڕانە. بەهەمان شێوەش سەیری شیعری دیلانیش دەكات و دەڵێت: (شیعرەكانی دیلان بە شێوە ڕۆمانسین و بەناوەرۆكیش ریالیزمی شۆڕشگێڕانەیە، ئەمەش بایەخی زیاتری بە شیعرەكە داوە لە ڕووی ناوەرۆك و ڕوخسارەوە)(كاكەی فەلاح، ب١، ١٩٨٠،ل٢١٩). هەروەها لە هەندێ شیعری "مەدهۆش"دا ئاماژەی بە كلاسیكییەتی شاعیر كردووە، هەروەها لە شیعرەكانی "كامەران موكری" و خۆشی وەك "كاكەی فەلاح" جەخت لەسەر بیری ڕێبازی ریالیزمی شۆڕشگێڕانە دەكاتەوە و بابەتەكانی شیعری بەو ڕێبازە دەبەستێتەوە، زۆرجار لە یەك

شاعیریشدا ئاماژەی بە چەند ڕێبازێکی جیاواز کردووە بەپێی قۆناغەکانی شیعری ئەو شاعیرە و بەپێی دەرکەوتنی تایبەتمەندی خاسیەتەکانی ئەو ڕێبازە لە شیعرەکاندا بۆ نموونە سەبارەت بە گۆران دەڵێت: ((گۆران قوتابخانەی ڕۆمانتیکی لە شیعردا بنیات نا ڕۆژ بەڕۆژ بەرز و بەرزتری کردەوە تا وردە وردە و کەم تا بێشێ بەرهەمی ڕیالیزمی و ڕیالیزمی ڕەخنەگرانە و شۆڕشگێڕانە و سۆشیالیزمی، لە بەرهەمەکانیدا سەریان هەڵدا))(کاکەی فەلاح، ب١، ل٥٤-٥٥). دیارە ئەم گۆڕانکارییەش تەدریجییە، لەگەڵ قۆناغەکانی تەمەنی گۆران بە ناو ڕێبازەکاندا ڕۆیشتووە، لە سەرەتادا، شیعرەکانی گۆران شێوازێکی کلاسیکیان هەبووە، دواتر بۆ شێوازی تر گۆڕاون، گۆران (لە شیعری "بەندیخانە" و "لاوکی سوور"ەوە، شاعیر کەوتە گۆڕین و پێ داگرتن و تەواوکردنی بەرزبوونەوەی بنچینە و قەوارەی قوتابخانەی ڕیالیزمی ڕەخنەگرانە و ڕیالیزمی شۆڕشگێڕانە بەرەو ڕیالیزمی سۆشیالیزمی، وەك ڕەنگ ڕشتنێك و دانانی بنچینەی سەرەتایی لە چلەکان بە دواوە ناو بەناو ئەم چەشنە بەرهەمەی ئەخستە ناوەوە))(کاکەی فەلاح، ب١، ل٦٩ــ٧٠). هەروەکو پێشتر ئاماژەمان پێکرد، کاکەی فەلاح لە لێکۆڵینەوە تیۆری و ڕەخنەیی و مێژووییەکانی تر زیاتر باس لە بیری ڕۆمانسیەت دەکات، بەڵام لە پاڵ چەند شاعیرێکی دیاریکراو ئەو خاسیەت و بنەما ڕۆمانسیانەی ئاماژە پێکردووە، هاوکات ئاماژەی بە خاسیەت و بنەمای ڕێبازی تریش کردووە، واتە بەرهەمەکەی هەڵسەنگاندن و خوێندنەوەیەکی تەواو ڕۆمانسی نییە، کە بۆ شاعیرانی پێشکەش کردبێ، بەڵکو خوێندنەوەیەکی ئاوێتە بە بۆچوونەکانی ڕێبازە ئەدەبییەکان، لە لایەکی تر ئەو لایەنانەی کە پەیوەستن بە فکری ڕۆمانسیەتەوە و کاکەی فەلاح ئاماژەی پێکردوون، تایبەتمەندی بەیاننامەی ڕەخنەیی نییە و لە فۆڕمی تیۆرێکی سەربەخۆ نەخراوەتەڕوو وەك نەخشە ڕێگایەك بۆ نووسینی دەقی شیعری لە داهاتوودا لەسەر ئەو نەخشە ڕێگایە، بەڵکو ئەو خاسیەت و بنەما ڕۆمانسیانەی کە باسی کردووە، لە شیعری شاعیرەکاندا هەستی پێکردووە و لە دەقی شیعری داهێنراودا دەری کردوون، نەك ڕەخنەیەك بێت لە پێناو داهێنانی دەق لە داهاتوودا.

ئیتر بەشێوەیەکی گشتی ئەوەی، کە پەیوەندداره بە ڕەخنەی ڕۆمانسیزمەوە، لە لێکۆڵینەوە و نووسراو و وتارە ڕەخنەییەکانی لێکۆڵەر و ڕەخنەگرانی کورد، تێبینی دەکرێت، بریتییە لە هەندێك باسی تێکەڵ و نامەنهەجی، کە لە چوارچێوەی ناساندنی دەقی شیعریدا و ئەرکی شیعری و سەرچاوەی شیعری، زۆرجار دەبینین باسیان لە خاڵێك یان بنەمایەك کردووە

کە دەچێتە ناو بازنەی تیۆری گوزارشتکردنەوە، یان بە ڕەخنەی ڕۆمانسییەوە گرێ دراوە، بەڵام ئاماژەیەکی پەرت و بڵاوە. لە پاڵ ئەوەشدا ئاماژەیان بە بنەمایەکی تر کردووە کە لە ڕێبازی کلاسیکییەت جەختی لەسەر کراوەتەوە یان ئاماژەیەکە دەچێتە ناو تیۆری لاساییکردنەوە یان تیۆرێکی ترەوە، یاخود هەندێ بنەمای ئەم تیۆر و ڕێبازە لەو شیکردنەوە و هەڵسەنگاندنانە بەدی دەکرێت، کە ڕەخنەگرەکان، بۆ دەقی شیعری شاعیران کردوویانە، لەسەر بنەمای بوونی زانیارییەکی گشتی لەسەر ئەدەب، کە لە پێناو خزمەتکردن بووە بە شاعیرێك، یان دەقی شاعیرێك کە لە ڕابردوودا بەجێ ماوە، بەڵام لە ناو ئەم شیکردنەوە و هەڵسەنگاندنەش، چەند ئاماژەییێکی تیۆری دەبینرێن، کە پەیوەستن بە تیۆری گوزارشتکردن، هەروەها کۆمەڵێك بۆچوونی ڕەخنەیی دەبینرێت، کە دەکەونە ناو ڕەخنەی ڕۆمانسییەوە، ڕەخنەیەك نەبووە کە کۆمەڵێك بنەمای فکری و فەلسەفی پێشکەش بکات یان کۆمەڵێك بنەما و خاسییەت بۆ نووسینی دەقی شیعری پێشنیاز بکات، کە بەجۆرێکی وەها کاریگەری هەبێت، کە کۆمەڵێك نووسەر و شاعیر لە دەوری خۆی کۆبکاتەوە. یاخود ڕەخنەیەك نەبووە لە پێناو گۆڕانکاری نووسرا بێت، بەجۆرێك بتوانێت ڕۆڵی لە دروستکردنی قوتابخانەیەکی شیعری یان ڕێبازێکی ئەدەبی هەبێت و لە پێناو ئەو ئامانجە هەڵبستێت بە دژایەتیکردنی نووسینی شیعر لەسەر شێوازی کۆن و ڕێبازی کلاسیکییەت.

ئەو ڕەخنەگرەی، کە تا ڕادەیەك لەو ئامانجە نزیك بووەتەوە، "سیاپۆشە"، کە نووسەری وتارێکی ڕەخنەییە، بەشێوەیەکی گشتی دەتوانین وتارەکەی بە ڕەخنەی ڕۆمانسی لە قەڵەم بدەین، بەوەی لە پێناو گۆڕینی ستراتیژییەتی دەقی شیعری دژایەتی شیعری کۆن دەکات، ئەم کارەش بە هۆی هەستی ناسیۆنالیستی و بیری نەتەوەخوازییە، بۆیە تاڕادەیەکی باش وتارەکەی هەڵچوونی پێوە دیارە، لە سەرەتادا دژایەتی شیعری کۆن و شاعیرە کلاسیکییەکان دەکات و شاعیرەکان هەموویان بە دڵدارێکی خۆپەرست و بێ باك لە قەڵەم ئەدات، کە جگە لەوەسفی ڕوخساری یار هیچی تر نازانن، بە جۆرێك سیاپۆش گۆرانی بێژە نەخوێندەوارەکانی زۆر پێ باشتر و بە تواناترن لەو شاعیرە بەناوبانگانەی کە خاوەنی بەلاغەتێکی بەرزن، هەروەکو دەڵێت: (ئەو لادێییەی، گۆرانی "کولنجەری" و "خاڵەی ڕێبواری" داناوە، گەلێ لەو شاعیرە کلاسیکیانە لە پێشترە لە لای من، چونکە ئەو لادێیە لە دەوروپشتی خۆی ڕوانیوە و ئەوەی بینیویەتی بە چەند واتایەکی سادە دایڕێشتووە، بەڵام شاعیرە کۆنەکانمان بە تکلیف

ویستوویانە شیعرێکی ئالۆز بنووسن، کەس لێی تێ نەگات)(سیاپۆش، ١٩٣٢،ل٤٢). هەروەها ئاماژە بەوە دەکات، کە تا ئێستا هەر ستایش کراون بە بایەخەوە سەیریان کراوە، کە ئەمەش بەهۆی نەزانی و نەبوونی شارەزاییەوە بووە، بەڵام ئێستا کاتی ئەوەیە بە چاوی ڕەخنەوە لێیان بڕوانین و ڕاست و چەوت و جوان و ناشیرینییان بخەینەڕوو، (تا ئێستا بێ لێکدانەوە هەڵمان کێشاون، لەمەشدا بیانوومان هەیە چونکە پیاو لە تاریکیدا جوان و ناشیرینی لا وەك یەکە، بەڵام لەمەودوا ڕۆشنایی زانین بەرچاومان ڕووناك ئەکاتەوە هەموو شتێ وەکو خۆی ئەبینین و پێویستە هەر شتێ بەپێی بەرزی و نزمی خۆی ڕێز بکەین بەپێی چاکی و خراپی ناوی لێ بنێین)(سیاپۆش، ١٩٣٢،ل٣٣). ئەم ڕەخنەگرە لە هەموو ڕوویەکەوە شیعری شاعیرانی کلاسیکی ڕەت دەکاتەوە و پێی وایە بۆ ئەو سەردەم و قۆناغە ناشێن و هیچ تایبەتمەندی و خاسییەتێکی نەتەوەیی و ناوچەیی بەسەرەوە نییە، بۆیە ئاماژەی بە هەندێك لە خاسییەتەکانی ڕوخسار و ناوەرۆکی شیعری کلاسیکی کردووە، وەك "زمان و وێنەی شیعری و ئەرکی شیعری، مەبەست و بابەت و بەلاغەت،...تاد" لەو ڕووەوە دژایەتی شیعری کلاسیکی ئەکات، دواتر "سیاپۆش"، لە ڕوانگەیەکی ڕۆمانسییەوە، هەڵدەستێت بە پێناسەکردنی شیعر و باسکردنی سروشتی شیعر و ئەرکی شیعری لە ڕوانگەی تێگەیشتنی شیللییەوە بە هەمان شێوەی ئەو پێناسەی شیعرمان بۆ دەکاتەوە کە دەڵێت: ((شیعر وێنەیەکی ژیانە و لەڕاستی ئەزەلییەوە وەرگیراوە، ئاوێنەیەکە ناشیرینی تێدا جوان ئەبینرێ، سەرچاوەیەکە تا ئەبەد جوانی و ژیری لێ هەڵ دەقوڵێ، شیعر پەچە لەڕووی جوانییەکی شاراوە لادەبات)(سیاپۆش، ١٩٣٢،ل٣٥). هەروەها بە بیرکردنەوەیەك، کە لە چوارچێوەی ڕەخنەی ڕۆمانسی جێگەی دەبێتەوە، لەسەر ئەو بنەمایە چییەتی و سروشتی شیعرمان بۆ دەخاتەڕوو، هەروەکو دەڵێت: (شیعر تەرجومانی دڵە، چی بە دڵا بێ، ئێش و ئازار، دەرد و خەفەت و هیوا و نائومێدی، شین و شادی، شیرینی و تاڵی، خۆش ویستن و قین، گومان و باوەڕ ترس و بێ باکی، خراپی و چاکیمان بە واتای ڕێکوپێك لە شێوەیەکی دڵگیرا بۆ دەرئەخات، کە هەموو کەسێ لە دەمی خوێندنەوەیدا شێوەیەکی دڵی خۆی تیا ئەبینێ، شیعر چرایەکە تاریکی ڕێی ژیانمان بۆ ڕۆشن ئەکاتەوە، یارمەتیمان ئەدات لە دۆزینەوەی ڕاستیدا، شیعر جوانی هەموو شتێکمان بۆ دەرئەخات،... شیعر ژیانە بە بێ دەنگ و سەنگ، هاوارکەر و قیژێنەر، ڕووخۆش و مۆن، چاو بەگریان، دەم بە پێکەنین، پڕ لە دڵداری دێت و ئەچێ)(سیاپۆش، ١٩٣٢، ٣٤ـ٣٥)، زۆر پێناسە و خستنەڕووی تریش بۆ چەمکی

شیعر دەخاتەڕوو، وەك پەیڕەویکەرانی ڕێبازی ڕۆمانسیزم دەردەکەوێت، هەروەها لە ڕووی ئەرکی شیعریشەوە ڕۆمانسییانە بیردەکاتەوە، داواکراوەکانی ڕۆمانسییەت و گوزارشتکردنی لە شاعیر دەوێت، یەکێك لە خاڵە جەوهەرییەکانی ئەم وتارە ڕەخنەییە، وەك بانگەشەیەکی ڕەخنەیی بۆ ڕۆمانسییەت دەردەکەوێت، هەربۆیە داواکاری تێدا بەدی دەکرێت، داوا لە شاعیران دەکات، کە ئەوان پێشەنگ و ڕابەری کۆمەڵن پێویستە بە خەم و ئازار و خۆشی و بەها مرۆڤایەتییەکاندا شۆڕببنەوە، گوزارشت لە ئازاری خود و کۆمەڵگا و کێشە جۆراوجۆرەکانی ژیانی تاکی کورد بکەن، هەروەك دەڵێت: ((بەسە ئیتر باسی یادی ئەسکەندەر، ئاوی بەقا، جامی جەم، ماهی کەنعان و عەزیزی میسر تاکەی لەسەر ئەم ڕێڕەوە دەڕۆن و لە کێشەی دەردی کۆمەڵایەتی خۆمان دوور دەکەونەوە تا زووە ڕووبکەنە گەل و نیشتیمان و جوانی سروشتی وڵات بکەن بە قیبلەگا بۆ هۆنراوەکانتان، گیر و گرفت و دەرد و خەفەت، خۆشی و تاڵی گەلەکەتان بکەن بە نیشانگا)) (سیاپۆش، ١٩٣٢،ل٣٨). لێرەدا دەبینین، کە ڕەخنەگر هەر بە تەنیا هەڵنەستاوە بە باسکردنی دەقی شیعری کۆن، بەڵکو داواکاری تێدایە کە بۆ بەرهەمی شیعری داهاتوو سوود بە شاعیران دەگەیێنێت، نووسەر وەك نەخشەیەك دەیەوێت جۆری بابەت و ناوەڕۆکی شیعری دەستنیشان بکات، بۆ شاعیرێك کە دەیەوێت لەو قۆناغەدا شیعر بنووسێت، ئەمە وەك بنەمایەکی ڕەخنەیی دەردەکەوێت، کە بریتییە لە گوزارشتکردن لە مرۆڤ وەك بوونەوەرێکی خاوەن خەم و خەفەت و پەیوەست بە کۆمەڵگەیەکی کێشەدارەوە، کە ئەمەش خزمەت بە دەقی نەنووسراو دەکات، ئامانجی نووسەر سوود گەیاندنە بە بەرهەمی شیعری داهاتوو، هەروەها لە بنەمایەکی تر جەخت لەوە دەکاتەوە کە پێویستە شاعیرانی کورد، ((ڕووبکەنە وێنە و ڕوخساری کۆمەڵگای کورد، وەرنە سەر باسی چۆن بەهێ مەڕ ئەدۆشێ، شیرین تەشی ئەڕێسێ و مەشکە ئەژەنێ، نازدار بە شان و مل لە ڕەز ئەگەڕێتەوە، وەرنە سەر باسی سروشتی بەرزی کێو و کەژە جوانەکانی کوردستان، شاخ و کێوی لووتکە گیراو لە ئاسمان چەمی خۆڕ و داستانی زەبەند و چڕ، ....هتد دەست هەڵگرن لە لاساییکردنەوە و چاو لێکردن))(سیاپۆش، ١٩٣٢،ل٣٨). ئەم وتارە ڕەخنەییەی سیاپۆش زۆر ڕەهەندی ڕۆمانسی لە خۆی دەگرێت و ئامانجیش لە پاڵ دژایەتیکردن و خوێندنەوەیەکی نەرێنی بۆ شیعری کۆن، وازهێنانی شاعیران بووە لە شێوازی شیعری کلاسیکی، کە بەپێی بۆچوونی سیاپۆش بەها و سوودی ئەدەبی و هونەری تێدا نەماوە، لە

ڕوانگەی بیرکردنەوەیەکی نەتەوەخوازییەوە داوای وازهێنان لە شیعری شێوازی کلاسیکی کوردی دەکات، کە بەلایەوە بریتییە لە لاساییکردنەوەیەکی کوێرانە و بێ بەها. لێرەدا پرسیارێك دێتە پێشەوە، ئەویش ئەوەیە، ڕاستە ئەو وتارەی سیاپۆش بەشێوەیەکی گشتی ڕەخنەی ڕۆمانسییە و فۆڕمێکی نزیك لە بەیاننامەی هەیە، بەحوکمی بوونی داواکاری لە شاعیران، بانگەشەی تێدایە بۆ فکری ڕۆمانسی، بەڵام نەیتوانیوە ڕۆڵی نوێکردنەوەی شیعر و دامەزراندنی قوتابخانەیەکی ڕۆمانسی بۆ شیعری کوردی ببینێت هەروەها ئەو وتارە نەیتوانیوە ببێتە هۆی جێگیرکردن و بڵاوکرنەوەی فکری ڕۆمانسی و ڕێبازی ڕۆمانسیزم لە ناوچەکەدا.

ئەم وتارەی سیاپۆش، کە نەیتوانیوە وەکو بەیاننامەیەکی ڕەخنەیی و مانیفێستێك بۆ نوێگەری و گۆڕانی دەقی ڕۆڵ ببینێت و کاریگەری لەسەر شاعیرانی ناوچە جیاجیاکاندا هەبێت، بۆ کۆمەڵێك هۆکار دەگەڕێتەوە، کە هەندێکیان پەیوەستن بە دۆخی تایبەتی نووسەری ڕەخنەکەوە، بۆ نموونە ئەم وتارە لە ڕۆژنامەی (ژیان) لە ژێر ناوی (سیاپۆش) بڵاوبوویەوە و لە "یادگاری لاوان"یش بەبێ ناو بە ئاماژەکردن بە لاوێکی دڵسۆزەوە بڵاوکراوەتەوە، ئەمەش بەپێی سروشتی ئەوکات و ئێستاش ناوبانگ و پێگە و ناسراوی نووسەر و شاعیرێك، کە خاوەنی پاشخانێکی ڕۆشنبیری و کۆمەڵێك چالاکی و بەرهەمی ئەدەبی و هونەرییە، لە لای خەڵکی گشتی و تەنانەت خوێنەریش کاریگەری زۆر زیاترە لە کەسێکی ون و یاخود لە نووسەرێك کە پێشتر هیچ دەرکەوتەیەکی ئەدەبی نەبووە، بۆیە خوێنەری وتارەکەی سیاپۆش هیچ ئاشنایەتییەکیان لەسەر شارەزایی و ئەزموونی خودی نووسەر نەبووە، بۆیە دەتوانین بڵێین، وەك نووسەرێکی وەهمی دەرکەوتووە و کەسیش ئامادە نەبووە بەدوای تێبینی و ڕێنمایی ڕەخنەگرێکی وەهمی بکەوێت. ئەمە لەلایەك، لە لایەکی تریشەوە ڕەخنەکە بەهۆی هەڵچوون و تووڕەبوونی نووسەر لە دەقی شیعری کۆن بنەمای زانستییانەی خۆی نەپاراستووە، هێندەی هێرشکردن و بێ بایەخکردنی شیعری کۆن و شاعیرانی کلاسیکە، ئەوەندە خستنەرووی بنەماکاری و هەڵسەنگاندن و ئاراستەکردنی تیۆری و ڕەخنەیی نییە، جگە لەوە هەروەکو کامل حەسەن بەسیر دەڵێت: (ڕەخنەگر بە ڕێبازێکی ئیستقرائی هەڵوێستەکەی بنیات نەناوە، بەڵکو زیاتر بۆچوونێکی سۆزدارییە بۆ پەرەسەندنی شیعری کوردی)(بەسیر، ١٩٩٠، ل٢٧٧). سەرەڕای ئەوە پیرەمێرد، کە شاعیر و نووسەرێکی بەناوبانگ و کەسایەتییەکی ڕۆشنبیر و شارەزا و ناسراو بوو لە سەردەمەکەی خۆیدا، دێت لە

زنجیـره وتارێکـدا، لە ڕۆژنـامەی ژیانـدا وەڵامێکـی تونـدی دەداتەوە و بۆچوونەکـانی ڕەت دەکاتەوە، کە ئەویش هەمان نەفەسی هەڵچوونی پێوە دیارە، بۆیە دەبینین (ئەو هەڵوێستە تونـد و تیژەی ئەو شاعیر و ڕەخنەگرانە دژی شیعری کـۆنی کـوردی گرتیـانەبەر، هەمـان هەڵوێسـت شیعری نوێشی گرتەوە، چونکە هەر لە ناو ئەمانەدا چەند دەنگێك بەرزبـوویەوە دژی شـیعری نوێ و بەتوندی ڕەخنەی لێ گرتووە و تەنانەت گاڵتەشیان پێـدەکات، هەر لەسـەر لاپەڕەکـانی ڕۆژنـامەی "ژیـان"دا، نووسـەرێك لە زنجیـره وتارێکـدا وەڵامێکـی تونـد و تیـژی وتـارە ڕەخنەییەکەی "سیاپۆش"ی داوەتەوە، بیروڕا ڕەخنەییەکانی پـێش خـۆی ڕەت کـردووتەوە و ڕەخنەیەکی توندی ئاراستەی شـیعری نـوێ کـردووە)(سـایر، ٢٠٠٦، ل٢٢٥). ئەو ڕەخـنەیەش بە هەمان شێوە، بە هۆی هەڵچوون و سـۆزداری بـۆ شـیعری کلاسـیکییەوە، نەیتوانیـوە سروشـتی ڕەخنەی بابەتیانەی خۆی بپارێزێت، بۆ نموونە ئەگەر سەیری وتارەکە بکەین دەبینـین، کە بەم جۆرە ئاماژەی بە نووسەرەکە کـردووە، (ئەو کـوڕەی دەربـارەی شـاعیرەکانمان دواوە و خـۆی شاعیر نەبووە و تـا لە چەنـد و چـۆنی و چـاکی و خراپـی شـیعر بزانـێ و لە هـونەری شـاعیران بگا)(پیرەمێرد، ١٩٣٣، ل٤). بەهۆی پێگەی شیعری کۆن لە ئەدەبیاتی کوردی و قورسایی ئەدەبـی و ڕۆشنبیری پیرەمێرد و بەرگری کردنی لە شیعری کۆن، وتـارەکەی سـیاپۆش کـاریگەرییەکی فکری دروست نەکرد و نەیتوانی وەکو پێویست ببێتە جێگەی گرنگی پێدانی شاعیرانی کـورد لەو قۆنـاغەدا، وتـارە ڕەخنەییـیەکەی پیرەمێـرد ئەکتیڤییەتـی وتـارە ڕەخنەییـیەکەی سیاپۆشـی دابەزاندەوە.

هەندێك هۆکاری تـریش هەبـووە، کە گشـتیە و پەیوەسـتە بە بـارودۆخی کۆمەڵگـا لە ڕووی سیاسی و ئایینی و کۆمەڵایەتییەوە، هەروەها پەیوەستە بە ژینگەی تـایبەت و سروشـتی نەتەوەیی و ناوچەیی، کە کاریگەرییان هەبووە لەسەر دروست نەبوونی گوتـارێکی ڕەخنەیـی و ڕەخنەی ڕۆمانسی، کە بەجۆرێك بێت قۆناغێکی شـیعری و ئەدەبێکـی نـوێی لێکەوێـتەوە، هەروەك لە وڵاتـانی ئەورووپـا ڕووی دا، ڕەوتـی مێژوویـی و گۆڕانکـاری و پەرەسـەندنەکانی ئەورووپا لەگەڵ کۆمەڵگەی کوردی، هەر لە سەرەتاوە جیـاوازییەکی زۆر گەورەی هەبـووە، لە هەمـوو ڕووێـکەوە، سروشـتی مێـژووی ئەورووپـا لە ڕووی فکـری و فەلسـەفی و ئەدەبـی و ڕووەکانی ترەوە تایبەتمەندییەکی گۆڕاوی ڕیشەیی و جووڵاوی بەردەوامـی هەیە، بـۆ نمـوونە وەکو شەمەندەفەرێك، کە لە ناو وێستگەی فکری و فەلسەفی یۆنانییەکان دەسـت پێـدەکات،

بۆ ماوەیەك لەسەر ئەو سکەیە دەڕوات و دواتر لە وێستگەی ڕۆمانییەکان دەوەستێت و ڕۆمانییەکانیش هەڵدەگرێت ماوەیەك بەم شێوەیە دەڕوات، تا وێستگەی سەدەکانی تاریکی ئەم شەمەندەفەرە لەسەر سکەیەکی زۆر خراپ و کپ و بێ دەنگ دەڕوات، تا دەگاتە وێستگەی سەدەکانی پانزە و خۆری ڕێنیسانسی لێ هەڵدێت و دەگەشێتەوە و لەسەر سکەی خۆی دەڕوات تا دەگاتە وێستگەی کلاسیکیەتی نوێ و دواتر وێستگەی ڕۆمانسیەت و وێستگەی ڕیالیزم و وێستگەی ڕێبازەکانی تر، هەر وێستگەیەك خاسیەتی فکری و فەلسەفی تایبەت بەخۆی هەبووە، لەسەر خاسیەتەکانی ئەو وێستگەیە ئەدەب و هونەریش هاتووەتە ناو شەمەندەفەرەکەوە، بەڵام بارودۆخی کورد و کۆمەڵگای کوردی هەرگیز تەوژمی فکری و فەلسەفەی نەکردووە بە بنەمای گۆڕانکاری و پەرەسەندنی لایەنەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی و ئەدەب و هونەر، تەوژمێکی فکری و فەلسەفی بە سواری شەمەندەفەرێکەوە بە مێژووی کورددا نەهاتووەتە خوارەوە، بڵاوبوونەوەی ئایینی ئیسلام لە ناوچەکەدا، بەرگی شارستانی و فکری ئایینی خۆی بە بەر هەموو کلتوور و بەرهەمی کوردی کردووە، بۆیە دەبینین، کە مێژووی کورد بەر لەئیسلام کۆمەڵەی بەتاڵە و واتە سفر لە ڕووی ئەدەبی و هونەرییەوە، لە ڕووی فکری و فەلسەفییەوە، بەڵکو دوای هاتنی ئایینی ئیسلام لەسەر بنەماکانی ئەم ئایینە دەست پێدەکات، ئەم ئایینەش بنەمای سەوابیتی خۆی هەیە، بۆیە ئەو گۆڕانکارییە تەدریجییە ڕێکخراوەی بە خۆیەوە نەبینیوە، بەڵکو ئەوەی هەیە عورفێکی ئایینی و کۆمەڵایەتییە، کە هەموو بارودۆخێکی ژیانی کوردی گرتووەتەوە لەناویشیدا ئەدەب و هونەر، ئەمەش لە نەست و نائاگایی کۆی هەر تاکێکی کورد، جێگیر بووە، بۆیە گۆڕانکاری کارێکی زۆر سەخت و دژوار بووە لە مێژووی کوردا، لەبەر ئەوەی ئایین بنەما و پرەنسیپی بۆ ئەدەب و هونەریش داناوە، بۆیە دەبینین، کە ئەدەب و هونەریش تا ڕادەیەك وەکو سەوابیتێك مامەڵەی لەگەڵدا کراوە، بووە بە ئایدۆلۆژیا لای شاعیرەکان، بۆیە دەبینین زۆر بە قورسی لە شوێنی خۆی جووڵاوە. ئەدەبی کوردیش شیعری کلاسیکی لەسەر بنەمای ئەدەبیاتی ڕۆژهەڵاتی بینا کراوە، ئەدەبی ڕۆژهەڵاتیش ئەدەبێکی ئیسلامییە، ئەم هەستی بەپیرۆز زانین و سەوابیتە لە نەستی شاعیری کورد و خوێنەری کوردیش تێبینی دەکرێت، چونکە (چێژی خوێنەر و خەڵکە گشتییەکە لەسەر شیعری کلاسیك ڕاهاتوو بوون، فاکتەرێکی بەهێز لە ئارادا نەبوو بەجۆرێك، کە بتوانێت، ڕووی خوێنەر لەو چێژە وەرگێڕێت، چونکە ئەو چێژە چێژێکی

کەڵەکەبووە و ڕەگێکی دەچێتەوە سەر ئاینیش، بنچینەکانی شیعری خۆماڵی ئەوەی لەباردانەبوو، ئەو تێڕوانینە، کەڵەکەبووە بگۆڕێت، تەنانەت شیعری نوێ لەکاتی سەرهەڵدانی خۆیدا ڕووبەڕووی گاڵتە پێکردن بوویەوە، چونکە شیعر و تایبەتمەندییەکانی شیعری کلاسیکی کوردی وەك بیروباوەڕێك سەیر دەکران)(حوسێن،٢٠١٨،ل١٢). لەبەرئەوەی لە ناو کۆمەڵگای کوردیدا، ژیانی تاك و گشتی و بۆنەکان بە ئاینەوە پەیوەستکراوە و خوێندن لە حوجرەکانی مزگەوت بووە، چۆن وەکو سەوابتێك مامەڵەیان لەگەڵ زانستە شەرعییەکان و حوکمە شەرعییەکان کراوە، بە هەمان شێوەش هەروەکو سەوابتیش مامەڵە لەگەل مەرج و پێوەر و هونەرەکانی شیعری و یاسا زمانەوانییەکان و بۆچوونە ڕەخنەییەکان کراوە. ئیتر شیعری کلاسیکی کوردی لای شاعیران و خەڵکە گشتییەکە، وەك سەوابتێکی ئایدۆلۆژی لێ هاتبوو، گوتاری ڕەخنەیی نەیتوانی بۆچوونی ڕۆمانسییەتی بەسەر کلاسیکییەتی کورددا فەرز بکات، ئەو چوارچێوەیە تێك بشکێنێت، بەڵام مێژووی ڕۆژئاوا و گوتاری ڕەخنەی ڕۆمانسی لە ئەورووپادا هێزی شکاندنی ئەو چوارچێوەیەی هەبوو، کە کلاسیکییەتی نوێ لە ئەورووپادا دروستی کردبوو، توانی پیرۆزیی ئایدۆلۆژی و ئاینی لە ئەدەب و هونەر دابماڵێت، بەڵام لە کوردستاندا تا ئێستا لە ناو ئەو چوارچێوە فکرییە ئایدۆلۆژی و ئاینییە دێن و دەچین، سەرەڕای هەندێك گۆڕانکاری.

کەناڵێك نەبووە بۆ بڵاوکردنەوەی وتارە ڕەخنەییەکان، بە شوێن و شار و شارۆچکە و گوندەکاندا، بۆیە ئەمە وای کردووە کە وتارە ڕەخنەییەکان بە شێوەیەکی بەرفراوان بڵاونەبنەوە لەکاتی خۆیدا و نەگەنە دەست هەموو خوێنەر و شاعیرێك لەو سەردەمەدا. مەسەلەیەکی تریش دێتە پێشەوە، کە پەیوەستە بە بیرکردنەوە و بۆچوونی بەشێکی زۆر لەو ڕەخنەگرانەی، لە دوای جەنگی یەکەمی جیهانییەوە وتاری ڕەخنەییان بڵاو کردەوە ئەویش ئەوەیە، کە بە نەفەسێکی چەپگەرایی دەیاننووسی و لەسەر ئەو بنەما ئایدۆلۆژییە دژی کلاسیکییەت دەوەستانەوە، لەبەر ئەوەی فکری چەپیش فکرێکی خواستراوی نامۆ بوو بە کۆمەڵگەی کوردی بۆیە تا ئێستاشی لەگەڵدا بێت چەپ نەیتوانی زاڵ بێت بەسەر چێژی گشتی خەڵك، مامەڵە نەکردنێکی تەندروست لەگەڵ فکری چەپ کارو کاردانەوەی لێکەوتەوە، بە شێوەیەکی نەرێنی سەیری ئەم ڕەوتە دەکرا، ئەمەش هەستی دژایەتی لە نێوان دوو چین دروستکرد، کە لە گوتاری ڕەخنەییشدا ڕەنگی دایەوە، بۆیە دەبینین، لەو سەردەمەدا، ئەم

دۆخە ڕەخنەی کوردی لە ڕەخنەی زانستی و بابەتی دوور خستەوە،(هەر لێرەوە دەگەینە ئەو ڕاستییەی کە کارکردنی هەندێ لە رەخنەگرانمان بەو دەستەڵاتەی کە لە بیرو باوەڕی سیاسی و ئایدۆلۆژییەوە سەرچاوەی گرتووە ، پێش ئەوەی زیانی بە شاعیران و بە دەقە شیعرییەکانیان گەیاندبێ، زیانی بە خودی ڕەخنەی کوردی گەیاندووە، چونکە بۆماوەیەکی زۆر تێڕوانینە رەخنەییەکانی لە بازنەیەکی داخراودا سووڕاندۆتەوە و ڕێگای بەوە نەداوە دەرگا لەسەر ڕێبازە رەخنەییەکانی تر بکرێتەوە))(محمد،٢٠١٦،ل٢٥ـ٢٦). بۆیە دوای ماوەیەك پاشەکشێ لەو پێداگرتنەی شاعیر و نووسەرە چەپخوازەکان دەبینین، تا ڕادەیەك گوتاری ڕەخنەیی لە بنەمای هەڵچوون و دژایەتی ئایدۆلۆژی ڕزگاری دەبێت.

جگە لەوە هۆکاری تریش هەن وەك نەبوونی یانە و کۆڕ و سەنتەری سەقافی بۆ گۆڕینەوەی بۆچوون و تێبینی ڕەخنەیی و گفتوگۆکردن و کۆکردنەوەی شاعیر و نووسەرانی هاوڕا و هاوبۆچوون لەسەر مەسەلە ئەدەبییەکان، هەروەها کەمی بڵاوبوونەوەی چاپ و چاپەمەنی و دەرنەچوونی ڕۆژنامە و ڕۆژنامەوانی، بە شێوەیەکی بەربڵاو، کە بە جۆرێك بێت بە هەموو شارو شارۆچکەکان و گوندەکان بڵاو بێتەوە، ئەوە وایکردووە، کە لەسەردەمی خۆی لەکاتی خۆیدا، وتار و بۆچوونە ڕەخنەییەکان بە شاعیر و خوێنەرەکان نەگات، بەمەش خوێندنەوەی تر و کاریگەری بە شێوەیەکی بەربڵاو دروست نابێت.

**ئەنجامەکان**

١. ڕەخنەی ڕۆمانسیزم و ڕێبازی ڕۆمانسیزم پەیوەستن بەیەکەوە، ڕێبازی ڕۆمانسیزم لەو بۆچوونە ڕەخنەییانە سەرچاوەی گرتووە، کە دژ بە ڕێبازی کلاسیزم خراونەڕوو، ئیتر بەرهەمی ئەدەبی داهێنراو پشتی بە خاسییەت و بنەماکانی ڕۆمانسیزم بەست، کە لە لایەن ڕابەرانی ڕۆمانسیزمەوە پێشکەشکران، لەهەمان کاتیشدا خاسییەت و بۆچوونە ڕەخنەییەکانیش، لێکەوتەی ئەو بەرهەمە ئەدەبییانەن، کە سروشتێکی ڕۆمانسییانەیان هەبوو.

٢. بەرهەمی داهێنراوی کوردی، بە هەر دوو جۆری شیعری کلاسیکی و شیعری نوێ، بەشێوەیەکی ڕێژەیی چەند بنەما و خاسیەتێکی ڕۆمانسییانەی لە خۆ گرتووە. ئەمەش سروشتێکی ڕۆمانسیانەی بە بەرهەمەکانیان بەخشیوە، بەڵام ڕۆمانسییەتی هەریەکەیان شێوازی تایبەت بەخۆی هەیە و بە سەردەم و ژینگە و ڕەهەندە دەروونی و کۆمەڵایەتییەکانی شاعیرەکەوە پەیوەستە.

٣. گوتاری ڕەخنەی ڕۆمانسیزم لە ڕەخنەی کوردیدا ڕەخنەیەکی گشتی و تێکەڵە و لەسەر بنەمای زانیاریی کەسی بەڕێوەچووە، بۆیە لە ڕەخنەی کوردیدا بانگەشە و ڕەخنەیەکی ڕۆمانسی، تێبینی ناکرێت لەسەر بنەمای ئەو هەلومەرجە تیۆری و مێژووییە کە لە ڕەخنەی ڕۆژئاوادا بوونی هەیە، لێکۆڵەری کورد لە پەراوێزی لێکۆڵینەوە لە شاعیرێکی دیاریکراودا، چەند خاسییەت و بنەمایەکی ڕەخنەییان خستووتەڕوو، ئینجا دەشێت ئەوە خاسییەتێك بێت لە ڕێبازی ڕۆمانسیزم.

٤. ئەو بۆچوونە ڕەخنەییانەی، کە لە لێکۆڵینەوە کوردییەکاندا، دەکەونە ناو ڕەخنەی ڕۆمانسییەوە، ڕەخنەیەك نەبووە کە بتوانێت ستراتیژییەکی ڕۆمانسی و کۆمەڵێك بنەما و خاسییەت بۆ نووسینی دەقی شیعری پێشنیاز بکات، کە بەجۆرێکی وەها کاریگەری هەبێت، کە کۆمەڵێك نووسەر و شاعیر لە دەوری خۆی کۆبکاتەوە، ڕۆمانسییەت لە ناو ڕێبازێکدا فۆرمەلە بکات.

٥. ئەو وتارە ڕەخنەییەی، کە تا ڕادەیەك لەو ئامانجە نزیك بووەتەوە، وتارەکەی سیاپۆشە، کە بەشێوەیەکی گشتی پشتی بە بۆچوونی ڕۆمانسی بەستووە لە ڕەخنەکەیدا، کە ویستوویەتی شیعری کوردی لەسەر ئەو بنەمایە بنووسرێت، بەڵام ئەوەش زیاتر هەڵچوونی پێوە دیاربووە و نەیتوانیوە وەك بانگەشە و مەنەفێستێکی ڕۆمانسییانە ڕۆڵی خۆی ببینێت.

## سەرچاوەکان

**یەکەم ـ بەزمانی کوردی:**

**أ ـ کتێبەکان:**


١. بەسیر، کامل حەسەن. (١٩٩٠) وێژەی کوردی و ڕەخنەسازی. بەغداد: چاپخانەی دار الجاحز.

٢. پیربـاڵ، د. فەرهـاد. (٢٠٠٤) ڕێبـازە ئەدەبییەکـان. چـاپی یەکەم. هەولێـر: دەزگـای چـاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس.

٣. حوسـێن، پ. ی. د. هیمـداد.(٢٠٠٧)دەروازەیەك بـۆ ڕەخـنەی ئەدەبـی کـوردی. چـاپی یەکەم. هەولێر: چاپخانەی خانی.

.٤ حوسـێن، پ. ی. د. هیمـداد. (٢٠٠٧) ڕێبـازە ئەدەبییەکـان. چـاپی یەکەم. هەولێـر: چاپخـانەی دەزگای ئاراس.

٥. حوسێن، هیمداد. (٢٠١٠) ڕۆژنامەوانیی کوردی. بەرگی پێنجەم. چاپی یەکەم. هەولێر: دەزگـای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس.

٦. حیلمـی، ڕەفیـق. (٢٠١٠) مێـژووی ئەدەبیـاتی کـوردی، بەرگـی یەکەم و دووەم. چـاپی دووەم. هەولێر: دەزگای ئاراس.

٧. خەلیـــل، د. ابـــراهیم محمـــوود. (٢٠١٧) ڕەخـــنەی ئەدەبـــی نـــوێ لە لاســـاییکردنەوەوە بـــۆ هەڵوەشاندنەوەگەرایی. وەرگێڕانی: پ. ی. د. محمد تاتانی. چاپی یەکەم. سلێمانی: چاپخـانەی کارۆ.

٨. سابیر، د. پەرێز (٢٠٠٦) ڕەخـنەی ئەدەبـی کـوردی و مەسـەلەکانی نـوێکردنەوەی شـیعر. چـاپی یەکەم. هەولێر: دەزگای ئاراس.

٩. شەمیسا، د. سیروس. (٢٠١٨) ڕێبازە ئەدەبییەکان. وەرگێڕانی: هیمـداد حوسـێن ـــ سـەنگەر نـازم. چاپی یەکەم. هەولێر: ناوەندی ئاوێر.

١٠. گەردی، پ. د. سەردار. (٢٠١٧) ڕەخنەی ئەدەبی. چاپی یەکەم. هەولێر: چاپخانەی هێڤی.

١١. قطوس، د. بەسام. (٢٠١١) دەروازەیەك بۆ میتۆدەکانی ڕەخنەی هـاوچەرخ. وەرگێڕانـی د. محمـد تاتانی. چاپی یەکەم. سلێمانی: چاپخانەی شڤان.

١٢. کاکەی فەلاح. (١٩٨٠) کاروانی شـیعری نـوێی کـوردی. بەرگـی یەکەم. چـاپی یەکەم. بەغـداد: چاپخانەی حسام.

١٣. کەریـــم، ئـــازاد عبدالواحیـــد. (٢٠٠٥) سۆســـیۆلۆژیای شـــیعری کـــوردی لە ڕووی پێـــوەرە ئاکارییەکانەوە، چاپی یەکەم. کەرکوك: چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە.

١٤. محمد، ڕێزان محمد غفور. (٢٠٠٥) ڕێبازی ڕۆمانسیزم لە شیعری کوردیدا لە (١٩١٨ ـ ١٩٤٥). نامەی ماستەر، بەشی زمانی کوردی. کۆلێژی پەروەردە بۆ زانستە مرۆڤایەتییەکان، زانکۆی سەلاحەددین.

**ب ـ ڕۆژنامە و گۆڤارەکان:**

١٥. پیرەمێرد. (١٩٣٣)، یادگاری لاوان. ژمارە ٣٧٥.

١٦. گەرمیانی، پ. ی. د. عادل مجید ـ اسماعیل جاف، م. سرود ولی. (٢٠١٤) ڕۆڵی شێخ نووری لە سەرهەڵدانی ئەدەبی کوردی. گۆڤاری ئوستاد. ژمارە ٢٠٩. بەغداد.

١٧. سابیر، د. پەرێز. (٢٠٠٨) سەرچاوەی شیعر وەك مەسەلەیەك لە ڕەخنەی ئەدەبی کوردیدا. گۆڤاری زانکۆ. ژمارە٣٣، هەولێر.

١٨. سیاپۆش. (١٩٣٢) بۆ شاعیرەکانمان. ڕۆژنامەی ژیان. ژمارەکانی "٣٣٥ـ ٣٣٦".

١٩. گۆران. (ساڵی ٤، ١٩٦١). کۆن و تازەیی لە هەڵبەستا، گۆڤاری هیوا، ژمارە ٣١.

٢٠. ع. بیمار. (١٩٧٠) دانیشتنێك لەگەڵ گۆراندا. گۆڤاری بەیان. ژمارە ٢.

٢١. محمد، پ. ی. د. دڵشاد عەلی. (٢٠١٦) دەقی شیعری لە نێوان شاعیر و ڕەخنەگردا. گۆڤاری زانکۆی کۆیە. ژمارە ٣٧.

**دووەم ـ بە زمانی عەرەبی :**

٢٢.ابو العزم، طلعت عبدالعزيز. (١٩٨١) الرؤية الرومانسية للمصير الانساني لدى الشاعر العربي الحديث. مصر: الهيئة المصرية العامة للكتاب.

٢٣.تيغم، فان. (١٩٧٥) المذاهب الادبية الكبرى في فرنسا. ترجمة: فريد انطونيوس. بيروت: منشورات عديدات.

٢٤.عباس، احسان. (١٩٨٧) فن الشعر. الطبعة الرابعة. الاردن: دار الشرق للنشر والتوزيع.

٢٥.عصفور، د. جابر. (١٩٩٧) نظريات معاصرة. طبعة الاولى. دمشق: دار المدى للثقافة والنشر.

٢٦.غنيمي هلال، د. محمد. (؟) الرومانتيكية. القاهرة، نهضة مصر للطباعة والنشر والتوزيع.

٢٧.غنيمي هلال، محمد. (٢٠٠٥) النقد الأدبي الحديث. الطبعة السادسة. القاهرة، مطبعة نهضة مصر للطباعة و النشر.

٢٨.فضل، د. صلاح. (٢٠٠٢) مناهج النقد المعاصر. الطبعة الأولى. القاهرة: ميريت للطباعة والنشر.

## ملخص البحث

## ابعاد النقد الرومانسي في النقد الأدبي الكوردي (١٩٢٠ إلى ١٩٧٥)

**د. ريبوار محمد اسماعيل**
قسم اللغة الكردية/ كلية التربية
جامعة صلاح الدين – اربيل

هـذا البحـث بعنـوان: ابعـاد النقـد الرومانسـي في النقـد الأدبـي الكـوردي (١٩٢٠ إلى ١٩٧٥). يرتبط البحث بالبحـث النقـدي، إنهـا تشـير بوجـه عـام إلى النقـد الأدبـي في إطـار التفكير الرومانسي.

يعرض البحث مبـادئ وأبعـاد النقـد الرومانسـي وفقًـا للخصـائص العامـة والمحـددة للرومانسية، إنه يشير إلى النقد الأدبـي مـن منظـور المدرسـة الرومانسـية. في هـذا البحـث، يشار إلى الدراسات الكوردية التي أجريت في إطار مبـادئ الرومانسـية. وهـذا هـو يـتم إبـراز وجهة نظر هذه الدراسات نحو النصوص الأدبية بعد ذلـك، يـتم عـرض المؤشـرات النظريـة للرومانسية وخصائص المدرسـة الرومانسـية في المقـالات والدراسـات. يـتم تفسـيرها وفقـا لمبادئ النقد الرومانسي.

**الكلمات المفتاحية: النقد الرومانسي ، نظرية النقد ، التعبير عن الذات ، الانفعال ، الخطاب النقدي.**

## Abstract

## Aspects of Romantic Criticism In Kurdish Literary Criticism (from 1920 to 1975)

This research is entitled “Aspects of Romantic Criticism In Kurdish Literary Criticism (from 1920 to 1975). The research is associated with critical research. It generally signals literary criticism within the framework of romantic thinking. The research presents the principles and dimensions of romantic criticism in accordance with general and specific characteristics of romanticism. It indicates literary criticism from the perspective of romantic school. In this research, Kurdish studies, conducted within the framework of principles of romanticism, are referred to. That is, the perspective of these studies towards literary texts is highlighted. Following this, theoretical indications of romanticism and characteristics of romantic school in the essays and studies are presented. They are interpreted according to principles of romantic criticism .

**Key words: Romantic Criticism, Theory of Criticism, Self-expression, Emotion, Critical discourse** .

# سایكۆلۆژیای ڕەنگ
# لە ڕەنگدانی (شێركۆ بێكەس) دا

**م. ی. مژدە ئیسماعیل نووری**
بەشی زمانی كوردی/ كۆلێژی پەروەردە
زانكۆی گەرمیان

**پێشەكی**

ئەوەی لێرەدا مەبەستمانە باسی لێوە بكەین ئەوەیە كە چۆن ڕەنگەكان بناسینەوە، بەشێوازێكی جوان و بە پێوەری ئەندازەیی هاوچەرخ، لەم توێژینەوەیەدا جگەلەوەی لەڕووی سایكۆلۆژیاوە ڕەنگەكان بایەخێكی گرنگیان هەیە لە ناسینەوەی بۆ مرۆڤ و دیاریكردنیان بەشێوەیەكی ڕێكوپێك، بەڵام بۆ جوانتركردنی توێژینەوەكەم ڕەنگم لای شاعیر (شێركۆ بێكەس) بەشێوەیەك لێكداوەتەوە بۆ ئەوەی لە دیدی ئەوەوە ڕەنگ و بەكارهێنانی ڕەنگ لای شاعیرانەوە بخەینەڕوو بۆ زیاتر ئاشنابوونمان بەمانای ڕەنگەكان، هەروەها بۆ دەرخستنی ئەو هونەرە گەورەیە كە لە زەینی شاعیرانەوە وێنای لێ دەكرێت و مرۆڤ سەرسام دەكات، بەڵام ڕەنگەكان سەختترین تیشكن كە لە پرێكدا خۆیان دەكەن بەزەینی مرۆڤدا و چاپ دەبن، لە بیركردنەوە و تێڕوانینمان بۆ ڕەنگەكان بەشێوەیەكی گشتی و تایبەتمەند لە سروشت و چواردەورمان، هەربۆیە دەڵێین ڕەنگ مەغزایەكی فرە ڕەهەندی هەیە، هەم لە هونەری شانۆ و دیكۆرات و تابلۆكێشاندا لای هونەرمەندان و جیاكردنەوەی چەندین شتی گرنگ و پڕ بایەخن لە چواردەورماندا ڕوودەدەن، وە هەروەها ئەوەی كە بەردەوام بە زیندوویی و بە پەنجەیەكی پیانوی ئێستاتیكیایی خۆی هەڵدەواسێت ئەوە هەناسەی ڕەنگە، كە لە بۆتەی ئەم وێنای شیعرییانەوە ڕەنگاو ڕەنگی دەقی هەرە پڕمانا و پڕ لە ڕەنگی شاعیران كە هەرجارە و بەشێوازێك لە شێوازەكان ڕەنگ لەبووندا پێناسەیەكی بەشیعرییەت بوونی خۆیمان پێ دەڵێ، كەواتە ڕەنگ خۆی جوانییەكی بێ وێنەی هەیە، بەڵام شاعیرانمان زیاتر ئەو جوانییەمان بۆ دەخەنەڕوو و پێمان دەناسێنن.

## بەشی یەکەم

**تەوەری یەکەم : (سایکۆلۆژیای ڕەنگ):**

ئەگەر بمانەوێت لە سایکۆلۆژیای ڕەنگ بدوێین ئەوا پێش هەموو شتێک دەبێت بزانین کە سایکۆلۆژیا خودی خۆی چییە ؟

وەک دەزانین کە سایکۆلۆژیا لە بنەڕەتدا زاراوەیەکی ئینگلیزییە (psychoology) وە لەزمانی عەرەبیدا زاراوەی (علم النفس) ی لەبەرامبەر دانراوە و لە زمانی کوردیشدا هەردوو زاراوەی (دەروونزانی و دەروونناسی) بە هاوتای زاراوەی سایکۆلۆژیا بەکاردێت، دەتوانین بڵێین دەروونناسی بریتییە لە : ((ژیانی دەروون و ئەوەی لەناو دەروونـدایە لە بیرکردنەوە و هەست و ئارەزوو بیرەوەری و هەڵچوون دەکۆڵێتەوە)) (سعدون، ٢٠١٥ : ٦٨) .

وشەی سایکۆلۆژیاش لە دوو وشە پێکهاتووە ئەوانیش (psychoo) بەواتای دەروون و (logy) یش بەواتای زانست دێت بەسەریەکەوە بەواتای (زانستی دەروونزانی یان دەروونناسی) دێت، ئەم زاراوەیە بۆ یەکەمجار لەلایەن ((دەروونناسی ئەمریکایی (ولیەم جەیمس)ەوە لە ساڵی (١٨٩٨) لە کتێبەکەی خۆیدا بەناوی (بنەماکانی دەروونناسی) بەکارهاتووە)) (وڵبەرت،٢٠١٥: ٥٦ – ٥٧)، وە بەچەندەها شێوەی دیکە ناسێنراوە و پێناسەکراوە و تاڕادەیەکی زۆریش هەندێک لە زانا و دەروونناسان بەلایەنی ئەدەبەوە گرییان داوە و دەڵێن ((دەروونناسی ئەو زانستەیە کە لە ڕەفتاری مرۆڤ دەکۆڵێتەوە کە لە ئەنجامی کارتێکەر و وروژێنەرەکان دەردەکەوێت و بەدوای پرۆسە مەعریفییەکان و ئەزموونەکانیدا دەگەڕێت)) (عزیز، ٢٠١١ : ١٩).

دیارە دەروونناسی پەیوەندییەکی پتەوی بە ئەدەب و هونەرەوە هەیە و لە هەڵسوکەوتەکان و ناخی مرۆڤ و شادی و ئازارەکانی مرۆڤ دەکۆڵێتەوە و دواتر وەک بەرهەمێکی ئەدەبی خۆیان دەنوێنن، چوون وەک ئاشکرایە کە دەروونناسی لە ناوەوە و دەرەوەی مرۆڤ دەکۆڵێتەوە و ڕەفتارە کردەییەکانی هەڵدەسەنگێنێت و قسە لەسەر بیرکردنەوە و فیکر و ئەندێشەی مرۆڤیش دەکات، هەر بۆیە لەناو ئەدەبدا دەبینین کە قوتابخانەی تایبەتی دەروونیمان هەیە کە قسە لەسەر ئەدەب دەکەن وەک

قوتابخـانەی دەروونشـیکاری ئەدەبی و ڕەخـنەی دەروونی ئەدەبی و دەروونناسی ئەدەبیمان هەیە بۆیە مەعریفە و نووسین کە لەئەنجامی هزر و بیر و خەیـاڵ و هەست و ئـازار و خـۆشی و بەرهەمـی شـاکاری ئەدەبی دروستـدەکەن وەئەمـانە هەموویـان پەیوەندییان بە ناو و ناخەوەی مرۆڤەوە هەیە، هەر بۆیە دەروونناسی بە ئەرکـی خـۆی دەزانێت کە قسەیان لەسەر بکات و لێیان بکۆڵێتەوە تا بتوانرێت باشترین پێشکەش بکرێت .

وەک ئاشکراشە کە لە ژینگەی مرۆڤایەتیدا یاخود لە جیهانی ڕەنگەکانـدا هەر ڕەنگێک ڕۆڵ و کـاریگەریی تـایبەتی خـۆی هەیە و کە پـێکەوەش تـێکەڵ دەکـرێن بایەخیان زیاتر دەبێ و کارە هونەرییەکان کامڵ و تەواتر دەکەن .

هەربۆیە دەروونناسەکان لەبارەی ڕەنـگەوە دەڵـێن: ((هەر ڕەنگێـک واتـایەکی تایبەتی خۆی هەیە، هەروەها لەو ڕەهەندەوە لە خەسڵەت و تایبەتمەندییەکانی مرۆڤ تێدەگەین)) (هـیمەت، ٢٠١٢ : ٦) . هەروەها (ماکس لۆشەر) ی مامۆستای دەروونناسی لە زانکۆی (بازل) لە سویسرا جەخت لەسەر ئەوە دەکـاتەوە کەوا ((هەمـوو ڕەنگێـک خاوەن کەسایەتییەکی تایبەتە، و ڕەنگ سیمای کەسایەتی دیاری دەکـات)) (سلێمان، ٢٠٠٩ : ١٦٦) . هەر لەبارەی ڕەنگەوە لەڕووی سایکۆلۆژییەوە فەیلەسوفی یۆنانی (فیسا غۆرس) وتوویەتی ((ڕەنگ کاریگەری لەسەر نەفسییەتی مرۆڤ هەیە، و پەیوەنـدیی باشیشی هەیە بە میتۆدەکانی سروشت و کەون و ژمارەکانەوە)) (عمر، ١٩٨١ :١١١) .

یەکێک لە گرنگترین ئەرکەکـانی ڕەنـگ، بەخشینی خەسـڵەتی واقیعیـانەیە بە وێنە و دیمەنەکانی هەروەها لێکچوون و جیاوازییەکان لە نێوانیاندا ڕوونتر دەکـاتەوە، جـگە لە وروژانـدنی سـەرنجی بینەر و خولْقانـدنی بـاری دەروونیـی جۆراوجـۆر و وەڵامدانەوەی سۆزاوییانە، سەرەڕای ئەو کاریگەرییانەی لەسەر چاوی مرۆڤ بەجێـی دەهــێڵن، وە ئاشکراشــە هەنــدێک لە ڕەنگەکــان بە ڕەنگــی گەرم نــاسراون وەک ڕەنگەکـانی (زەرد، پرتەقـاڵی، سـوور) وە هەنـدێکی تریشـیان بە ڕەنـگە سـاردەکان ناسراون وەک (شین، سەوز، بەنەوشە) هەندێ ڕەنگیش بێلایەنن وەک (ڕەش، سپی)، وە هەندێ ڕەنگمان هەیە کە کاریگەرییەکی ئەرێنی (پۆزەتیف) لەسەر چاوی مرۆڤ بەجێ دێڵن وەک ڕەنگە کراوەکان واتە ئەو ڕەنگـانەی کە لە ڕەنگـی سـپییەوە نـزیکن

وەک (پەمەیی و ڕەساسیی کاڵ، ... هتد) یان ئەو ڕەنگانەی کە لە ڕەنگی ڕەشەوە نزیکن وەک (نیلی، قاوەیی تۆخ، ... هتد)، بەڵام بەپێچەوانەوە ڕەنگمان هەیە کاریگەریی نەرێنی (نێگەتیف) دەکاتە سەر چاوی مرۆڤ بۆنموونە ڕەنگی (سوور).

ئاشکراشە کە لە ڕووی دەروونییەوە ڕەنگ کاریگەرییەکی زۆری لەسەر مرۆڤ هەیە چوون ((ڕەنگ بەشێکی دانەبڕاوە لە ڕۆشنبیری و یادەوەری و خەونی مرۆڤ . ڕەنگ بەشێکە لەو جیهانەی تێیدا دەژین و بەردەوام لەگەڵماندا دەژێت و بەشداریمان لەگەڵدا دەکات)) (علی، ١٩٨١: ٦٨) . دەتوانین ئەوەش بڵێین کە ڕەنگ یەکێکە لەو بنچینانەی کە لە لێکدانەوەی وێنە و دیمەنەکاندا پەنای بۆ دەبرێت، لەبەرئەوەی گەورەترین کەرەستەی کۆنترۆڵکردنی هەنووکییانەی میزاج و حەوسەڵەی مرۆڤە بەمەرجێک ڕێکخراو و گونجاوبێت و هەماهەنگی تێدا بێت و هەست و نەستی مرۆڤ بە ڕاستی و دروستی بیگوێزێتەوە ئینجا وەک ڕووناکی سوودی لێ بینرابێت و لە دیمەن یان جلوبەرگدا بەکارهێنرابێت، بۆیە وا پێویست دەکات لە سەرجەم بوارەکاندا دیزاینەر ئاگای لە کاریگەری هەڵچوونی ڕەنگە جۆراو جۆرەکان بێت، وە لە دیکۆرسازیشدا باشتر وایە ڕەنگە ڕوون و گەشەکان بۆ بوار و ڕووبەرە تەسک و بچووکەکان بەکاربهێنرێن، بەڵام سێبەر و ڕەنگە کاڵەکان بۆ بوار و ڕووبەرە فراوانەکان باشترن .

پرۆسەی پەسەندکردنی ڕەنگ ڕێژەیی و تایبەتە و بەهەڵێیستە و پشت بەسروشتی ئەو ورووژێنەرە جوانە دەبەستێت کە تاکەکەس ڕووبەڕووی دەبێتەوە، هەروەها پەیوەندیشی بە ئەزموونی مرۆڤ و ئەندێشە و هەست و نەستەوە هەیە کە کەسەکە دەیخاتە سەر کۆمەڵێک ڕەنگی زاڵ لە کارێکی هونەریدا، پەسەندکردن و خۆشویستنی ڕەنگ لای هەندێک کەسی دیکە پەیوەستە بە سروشتیی بوونی ڕەنگەکان واتا ئەو کاتەی خودی ڕەنگەکە لە سروشتدا بوونی هەیە، لە زۆربەی حاڵەتەکاندا جا مانا و کاریگەریی گۆڕاوی هێمایی ڕەنگ، لە مانا فیزیاییی ڕەنگەکە گرنگترە .

هەر لەبارەی ڕەنگەکانەوە زانایان و دەروونناسەکان گەشتوونەتە ئەو بڕوایەی کەوا چوار کۆمەڵە ڕەنگ هەن ئەوانیش : (ڕەنگە گەرمەکان و ڕەنگە ساردەکان) یان

(ڕەنگە کرۆماتیکییەکان و ئەکرۆماتیکییەکان)، ڕەنگە گەرمەکانیش (زەرد، سوور، پرتەقاڵی) لەخۆ دەگرێت و ڕەنگە ساردەکانیش (شین، وەنەوشەیی، سەوز) لەخۆ دەگرێت . بەزۆریش ڕەنگە گەرمەکان بە ڕەنگێکی شەڕانگێز ناسراون، بەڵام بەپێچەوانەوە ڕەنگە ساردەکان بە ڕەنگێکی ئارام و هێمنکەرەوە ناسراون بۆ مێشک و دەروونی مرۆڤ . وە ڕەنگە (کرۆماتیکییەکانیش) پێکدێن لە هەر چوار ڕەنگە سەرەکییەکەی شەبەنگە ڕۆژ واتە ڕەنگی (سوور، زەرد، سەوز، شین) وە ڕەنگە (ئەکرۆماتیکییەکانیش بریتین لە هەردوو ڕەنگی (ڕەش، سپی) .

زنجیرەی ڕەنگە پەسەندکراوەکان لە کۆمەڵگەیەکەوە بۆ کۆمەڵگەیەکی دیکە و لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی دیکە و لە ڕەگەزێکەوە بۆ ڕەگەزێکی دیکەش گۆڕانکاری بەسەردا دێت، بۆنموونە لە ئەنجامی چەندین توێژینەوەدا ئەوە دەرکەوتووە کەوا ئافرەتان زیاتر ڕەنگە سووک و کاڵەکانیان پێ پەسەندترە، بەڵام پیاوان زیاتر حەزیان بە ڕەنگە چڕوتۆخەکانە، ئەم پەسەندکردنەی ئافرەتانیش زیاتر پشت بە ڕەنگی شتەکە دەبەستێ نەک شێوەکەی، کەچی پەسەندکردن لای پیاوان دەگەڕێتەوە بۆ شێوە نەک بۆ ڕەنگ .

**تەوەری دووەم : (چەمک و ناسینی ڕەنگەکان):**

وەک دەزانین کەوا هەموو ڕەنگەکان کاریگەرییان لەسەر یەکە بە یەکەی تاکەکان دروست کردووە و، هەربۆیە هەموو کەس ڕەنگێکی تایبەت بەخۆی هەیە و خووی بەو ڕەنگەوە گرتووە، ئەوەش لە هەست و نەستەوە بۆی بەرجەستە بووە، هەروەها خۆشەویستی و مەراق و حەزکردنی ڕەنگیش لە ئافرەتەوە بۆ پیاوان دەگۆڕێت .

وە زۆرجاریش لەڕێگەی ڕەنگەکانەوە دەتوانین کەسایەتی دیاریبکەین، یاخود لەڕێگەی پۆشینی ڕەنگێکەوە دەتوانین لەناخ و دەروونی کەسی بەرامبەر بگەین .

بەچەند جۆرێک ئاماژە بە چەمکی ڕەنگ کراوە بۆ نموونە دەتوانین بڵێین ڕەنگ بریتییە لە سیفەتی تەنێک و دەبێتە ناسنامەی جیاکاری لەنێوان ئەوانی دیدا .

یـاخود وتـراوە ڕەنـگ ((لە بنچیـنەدا پـێکەوە وتەیەکـی بیۆلـۆژییە و لە تـۆڕی چـاوەوە بەرهەم دێــت یــان ئەو هەســتپێکردنەی چـاوە، کە لە ڕێــگەی شــەپۆلی ڕوونــاکییەوە بەرهەم دێــت)) (ڕەئــووف، ٢٠١٦ : ٤٥٧) . یــان دەوترێــت ڕەنــگ ((یەکانگیرکەرە و پەیبردنە، گەڕانەوەیە، بینینەوەیە کە سنووری نییە ... هتـد)) (سالار، ٢٠٠٩ : ٨٥).

شارەزایان پۆلێنیان بۆ کات و جۆری ڕەنگەکان داناوە، بۆنموونە : ڕەنگی سپی ((بەڕەنگێکی کـراوە و قـووڵی خەیـاڵ و شـادومانی دەزانـن، کە تیشـکەکانی فشـار و پاڵەپەســتۆی دەروونی و کێشــەکانی ژیــنگە کــاری تــێ ناکــات، وە ئەو ڕەنــگە بە ڕەنگێکی هەسـتیاریش دەناسرێـت، ئاماژەشـە بـۆ پـاکی و بـێگەردی و ڕاسـتگۆیی و ئاشـتی و ... هتـد وا لە کەسـەکان دەکـات لەڕووی دەروونیـیەوە هەسـت بە ئـارامی بکەن)) (عبدالوهاب، ١٩٨٥ : ٨٥) .

هەمووشــمان ئەوە دەزانــین کەوا ڕەنگــی ڕەش: نیشــانەی پرســە و خەم و دڵ تەنگییە، بەڵام ئەم ڕەنگە لە ژیانی ئەمڕۆماندا بـووەتە شـتێکی بـاو و بەڕادەیەکـی زۆر لەنـاو پۆشـاک و مـۆدەی ئافرەتانـدا بەکاردەهێنرێـت و بـووەتە ڕەنگـی سـەردەم و سەرنجڕاکێشانێکی سیحراوی پێوەیە، دەوترێ ئەو کەسانەی کە ڕەش پۆشـن زۆر دڵ گران و دڵ تەنگن و وە زۆریش خەمخۆری مـاڵ و منـداڵیانن، بەگشـتی ئەو ڕەنـگە لە زۆربەی ئافرەتـان دەکەوێـت، واتە جەسـتە و باڵایـان بەشـێوەیەکی ناسـک و جـوان پیشان دەدات و شاعیرانیش بەڕادەیەکی زۆر ئاماژەیـان بەم ڕەنـگە کـردووە و بەزۆری چواندوویانە بە چاو و پرچی ڕەگەزی بەرامبەرەوە.

ڕەنگی زەرد : کاریگەری لەسەر دەسەڵاتی هەموو تاکەکـان زۆرە، و بڕوابـوون بە دۆستایەتی و سۆز و بەردەوامی و کۆشش بۆ پێگەیاندن دەگەیەنێت، وە ئەم ڕەنـگە لە وڵاتانی جیهاندا نیشانەیە بۆ خۆر و ڕەنگی خۆریش وەک دەزانـین ژیـان بەخشـە و بەڕەنگێکی دڵخۆشـکەر دادەنرێـت . دوو بۆچـوونیش هەیە لەسـەر ئەم ڕەنـگە : ((١ سەرچاوەی ڕووناکی هەموو گیاندارانە . ٢ بەواتای کانزایەکی بەنرخ و جوان دێـت کە زێڕە)) (زەنگەنە، ٢٠٠٢ : ٨٢)

ڕەنگی سوور : ڕەنگی شەیدابوون و ئەڤین و خۆشەویستییەکی قوولە و ژنان وەکو کەسایەتییەکی بەهێز و بڕوا بەخۆبوون دەیپۆشن زیاتریش لە ڕۆژ و کاتە خۆشەکانیاندا وەک دەربڕینێک بۆ خۆشی دڵیان دەیپۆشن، وە ئەم ڕەنگەش بەلای زۆربەی وڵاتانی جیهانەوە بەواتای شەڕ و شۆڕش و شەهیدبوون و قوربانیدان دێت و وە بەڕەنگێکی ترسناک و هێمای شتی خەتەرناکیش دێت بۆنموونە لای میللەتێکی وەک ڕۆمانییەکان هەرکاتێک ئاڵای ڕەنگ سوور هەڵبکرایە ئەوەی بەمانای بەرپابوونی جەنگ دەهات .

ئەم ڕەنگە ((لە داستانەکانیشدا بەکار هێنراوە)) (ڕەئووف، ٢٠١٦ : ٤٦٩) .

ڕەنگی سەوز : ڕەنگی سروشت و ژیانە و ڕەنگێکی سەرنجڕاکێش و دڵ کراوە و دڵگیرە و ئافرەتان بۆ جوانی بەکاری دێنن، وە لەزۆربەی وڵاتانی جیهاندا بەواتای گەشەسەندن دێت لەبوارە جیاجیاکانی ژیاندا وە لە هەندێک ((وڵاتانی جیهاندا بەمانای ئارامی و دڵنیایی و ڕەزامەندی دێت، زۆربەی شاعیرانی جیهانیش نموونەیان بۆ ئەم ڕەنگە بەهارەیە هێناوەتەوە)) (زەنگەنە، ٢٠٠٢ : ٨٧) .

ڕەنگی شین : ئەمەش ڕەنگێکی جوان و هێمن و ئارام و دڵکراوەیە و نیشانەیە بۆ حەوانەوەی دەروونی مرۆڤ و ((پەیوەندی بەلایەنی دەروون و بیروباوەڕەوە هەیە و لەتوانایدایە جەوێکی خەیاڵی و ڕۆمانسی دروست بکات)) (عمر،١٩٨١ : ١٨٣) .

ڕەنگی پرتەقاڵی : ئەمەش یەکێکە لەو ڕەنگانەی کە جوان و سەرنج ڕاکێشە و ڕەنگێکی خۆشەویستە لای ژنان و زیاتر سەرنجی ژنان ڕادەکێشێ وەک لەوەی پیاوان، وە بەڕەنگێکی بوار سازیش دادەنرێت .

ڕەنگی بەنەوشەیی : ڕەنگێکی ناسک و ئارامە و دەتخاتە ناو خەیاڵێکی قووڵەوە، وتراوە زیاتر ئەو ژنانە ئەم ڕەنگە دەپۆشن کەوا خەریکی تاکتیکن و دەتوانن بەئاسانی بگەنە مەرامەکانیان. لێرەدا زیاتر ئاماژەمان بەو ڕەنگانە کردووە کە ڕەنگێکی سەرەکین بەلای زۆربەی چین و توێژەکانەوە یەتایبەتیش لای ڕۆشنبیران و هونەرمەندان و شاعیران کە لە بەرهەمەکانیاندا ئاماژەیان پێ کردووە .

بەپێی دانانی خشتەیەکی باوەڕپێکراوی ڕەنگەکان لەلایەن زانایانەوە ئەوە دەرکەوتووە کە باشترایە ڕۆژانی شەممان ڕەنگی بۆر و بەنەوشەیی و هەناری

بپۆشرێت، وە ڕۆژانی یەک شەممانیش ڕەنگە تۆخەکان بپۆشرێت وەک (مارۆنی، قاوەیی تۆخ، سەوزی تۆخ ... هتد)، وە ڕۆژانی دووشەممان ڕەنگی سوور، سێشەممان ڕەنگی پرتەقاڵی و چوار شەممان ڕەنگی زەرد و پێنج شەممان ڕەنگی سەوزی کاڵ و ڕۆژانی هەینیش ڕەنگی خاکی زیاتر بپۆشرێت .

## بەشی دووەم

**ڕەنگ لە ڕەنگدانی (شێرکۆ بێکەس) دا :**

ئاشکرایە هەریەکێک لە ڕەنگەکان خاوەنی واتا و مەبەست و کاریگەریی تایبەتی خۆیانن و ژیان و بیرەوەرییەکانی پێوەیە و، ڕەنگ لە وشە دەربڕیوتر و خێراتر و کاریگەرتریشە وە کاریگەری ڕەنگ و ویست و نەویستی ڕەنگ لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی دیکە یان لە تەمەن و ڕۆژگارێکەوە بۆ تەمەن و ڕۆژگارێکی دیکە یان لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی دیکە دەگۆڕێت، واتا ڕەنگ ڕەها نییە بەڵکو ڕێژەییە، هەرچۆن لە ڕووی سایکۆلۆژییەوە دەگۆڕێت، وە کایگەری و ڕەنگدانەوەی ژینگە دەستپێکەرە لەو کارەدا، ژینگە هۆگری کۆمەڵە ڕەنگێکمان دەکات کە پاپەندی ساتەکانی تەمەنە هەروەکو ڕەنگی خۆر، بیابان دەریا، یان وەکو ڕەنگی مێرگ و چیا و پێدەشت و گرد و تەلان ... هتد .

وە هەموو ئەو ((ڕەنگانەی سروشت تێکەڵی هەست و حەزو ئارەزوو دەبن لە پۆشاک و بیناسازی و سەرجەم (ئێکسسوار)اندا دەردەکەون هەر ڕەنگەو واتا و باوەڕێکە، هەردوو ڕەنگی (ڕەش و سپی) پتر لێکدانەوە و واتایان هەیە، لە داستان و حیکایەت و بەیت و باڵۆرەکان و بواری فۆلکلۆردا پانتاییەکی گەورەیان داگیر کردووە، هەروەها ڕەنگ جاران وا باو بوو لەکاتی مارەبڕین یان شەکراو خواردنەوەدا حەوت جۆر شیرینی سپی ڕەنگ دادەنرا، بڕواداربوون کە ئەوە هات و بەختیاری پێوەیە)) (سالار، ٢٠٠٩ : ٢١- ٢٢).

دەتوانین بڵێین ڕەنگ هەروەکو نۆتی مۆسیقا وایە کە هەریەکێک لەو نۆتانە یان پیتانە هەمەجۆرە و بەست و واتا و هێمای تێدایە، وە چەند شارەزاتربین لە بەکارهێنان و مامەڵەکردن لەگەڵ ڕەنگەکاندا، هێندەش ئاشناتر دەبین بە چێژی ڕەنگ

و ئەو چێژەش تا دێت تێماندا پتر دەبێت، وە چێژە ڕەنگی مۆسیقا نەشونمامان تێدا دەکات هەتا بتوانێ هاوشانی چێژە مرۆڤایەتییەکە بێتەوە، هەتا لە دیراسەکردنی ڕەنگ قووڵتر بینەوە ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت هەروەک چۆن کەسێک هەوڵی خاوێن کردنەوەی ئاوێکی پەنگ خواردوو بدات، بۆئەوەی ئاوێکی پاکی ئەوتۆی دەست بکەوێت کە بووژێنەرەوەی جەستە و گیان و دەروون بێت، وە ڕەنگ و ژیانە و دەربڕینی سەرجەم سات و کاتەکانێتی، هەر لەبەر ئەو زیندوویێتییە و کاریگەرێتی ڕەنگەکانەوەیە کە (شێرکۆ بێکەس) ی شاعیر چامەیەکی گەورە و کراوەی بۆ هونەرکاری ڕەنگ تەرخانکردووە، لەم چامە شیعرییەدا ڕەنگ بووەتە ((شوناس و شەبەنگ و یەکێکە لە ڕەگەزە هەرە سەرەکی و دیارەکانی جوانناسی و سەرنج ڕاکێشی بە مەدلولکردنی کۆی دیوانەکەی شاعیرە)) (ڕەئووف، ٢٠١٦ : ٤٥٤) .

نەک تەنیا وەک کەرەستەیەکی ئاسایی بەڵکو وەک زۆرشتی گەورە لە بونیادە شیعرییەکەیدا ((ڕەنگەکان ئەرکیان لە ئەستۆدایە دەدوێن و هەڵوێست دەنوێنن، وە جیهانێکە لەڕەنگی شاعیر، شاعیر حیسابێکی وردی ئەندازەداری بۆ تەلارە شیعرییە ڕەنگینەکەی کردووە و بە چاکی ڕەچاوی شێوە و ناوەڕۆکی لە چوارچێوەی تابلۆ شیعرییەکاندا کردووە هەر ڕەنگەو بە (تۆن)ی پێویستی حاڵەتەکەوە داناوە ...))(سالار، ٢٠٠٩ : ٢١- ٢٢)، هەروەها شاعیر لە خولگەی چەند ڕەنگێکی دیاریکراودا نەوەستاوە، بەڵکو بە دەیان جۆر ڕەنگی لە چامەکەیدا بەکارهێناوە و مەبەستە هۆنراوەییەکانی خۆی پێ دەربڕیوە، بۆنموونە ((ڕەنگی زەرد هەر زەرد نییە بەتەنها ڕەنگی لیمۆیی گۆگردی بەکاردەهێنێت، لە بەکارهێنانی ئەم جۆرە ڕەنگانە شێوە ڕەنگەکانمان دێنە بەرچاو، چونکە لیمۆ هەرچەندە زەردیش بێت زەردییەکەی ئەم جیاوازە لە زەردێکی تر جۆرەها ڕەنگی تریشی بەکارهێناوە)) (عیسا، ٢٠٠٩ : ١٤١).

ڕەنگ لەو شتە جوانە هەست بزوێنانەیە کە خاوەن کۆمەڵە خاسیەتێکە و هەر خاسیەتێکیش چەندین لایەنی پڕ بە پڕی جیهانی هەیە، ڕەنگ زمانە و زمانێکی جوان و دەربڕیوە و بەرجەستەکەرە و لە ڕێگای ئەو زمانە جوان و ڕەوانبێژییەوە کە لە وشەکان جوانتر و بالاترە، ڕاستەوخۆ لەگەڵ هەستەکان و ناخدا دەورووژێ و بەکەمترین ماوە کاردانەوە و کارلێکردن دروست دەکات، وە مەرجیش نییە ئەم

کاردانەوەیە لەسەدا سەد وەکو یەک بێت یان ڕەهابێت ڕێژەییە و بەپێی کات و شوێن و بارو حاڵەت دەگۆڕێت، وە ڕەنگ خاوەنی چەندەها لایەنە، هەر بۆیە هەموو جۆرە لێکدانەوەیەکی هەیە و دەتوانرێت هۆکارەکەشی بزانرێت، ڕەنگ بنەمایەکی سەرەکی پێکهێنانی هۆنراوەیە چونکە ((توانایەکی گەورەی ڕەگەزەکانی ئێستاتیکای لەخۆیدا هەڵگرتووە، هەرلەبەر ئەمەشە ڕەنگ لەسەر ئاستەکانی (وەسفی _ لێکچوون _ هێما _ ئایکۆن ... هتد) بەکارهێنراوە، ئەمەش ڕۆڵی ڕەنگ ئەوەندەی تر ئاڵۆز و مانادارتر کردووە)) (عبید، ٢٠١٣ : ٤٤) . ئاشکراشە کە ڕەنگەکان بەپێی حاڵەت، دەگۆڕێن هەر ئەو حاڵەتەش واتای پێ دەبەخشێت بۆ نموونە ڕەنگی سوور هێمای خۆشەویستی و مزگێنی و شۆڕش و شەفەقە و لەهەمان کاتیشدا لە شانەی شەڕدا بەواتای مەرگ و شەهیدبوون و بەرگی لەسێدارەدان و ... هتد دێت. لەنێو چامەی ڕەنگدان و لەم کۆپلەیەدا دەڕوانین تا بزانین ڕەنگی سوور چی دەکات و چیمان پیشان دەدات :

((گوڵاڵەیەک
بۆ تووتڕکێ نوشتایەوە
دەستی ماچ کرد
کە لێبووەوە و هەستایەوە
ڕەنگی سووری
ڕژابووە بەرپێی تووتڕک و
هەتا مردن
بەداخی ڕەنگی زەردەوە تلایەوە)) (بێکەس، ١٣٩٤ :١١٥).

لێرەدا شاعیر ڕەنگی سووری وەکو ڕەنگی گوڵاڵە و ڕەنگی خوێن بەکارهێناوە، چونکە وەک ئاشکرایە کەوا گوڵاڵە ڕەنگی سوورە و کاتێک دەنووشتێتەوە بۆ ماچکردنی دەستی تووتڕک بەهۆی ئەوەی کە دڕکێکی تیژی هەیە دەچێتە دەستی گوڵاڵە و خوێنی سووری لێ دەچۆڕێ هەتا خوێن لە جەستەیدا نامێنێت و جەستەی لاواز و ڕەنگی زەرد هەڵدەگەڕێت . شاعیر لێرەدا گوڵاڵەی چواندووە بە مرۆڤێکی خۆشەویست و بە هەست، بەڵام بە پێچەوانەوە تووتڕکی چواندووە بە مرۆڤێکی بێ

هەست و دڵ ڕەق و بێ بەزەیی . هەر لێرەشەوە دەتوانین ئەوە بڵێین کەوا (شێرکۆ بێکەس) ی شاعیر خاوەنی درەوشاوەترین ڕۆژانی تەمەنی شیعری ڕۆژگارەکەیەتی و دیارترین دیاردەی ئەدەبی گەلەکەمانە، وە لێرەدا دەمەوێت لە یەکێک لەو زمانانە یان بابەتانە بدوێم و کۆششی-تێدا بکەم کە زمانی یاخود جیهانی ڕەنگە، ڕەنگیش ڕەنگەکانی شێرکۆ بێکەسە ((ئەو جۆرە زمانەی شیلەی هەنگوێنی جوانی جاویدانی گەشەی داهێنانی لێوە دەچۆڕێ، نمە بارانیەتی، زمانێکە لە سەرووی زمانی ئاساییەوە، ئەو زمانەی ڕاستەوخۆ لەگەڵ هەستەکاندا دەدوێ و مامەڵە دەکات بەهەستی شەشەمیەوە، ئەم جارەیان لە (ڕەنگدان) دا زمان ڕەنگە ڕەنگ زمانە، ڕەنگیش چەشنەها لایەن و واتای لەسەر دەستی شاعیردا پەیداکردووە و هەر ڕەنگەش زادەی حاڵەتێکی شیعری کردووە و خاسیەت و هێما و دەلالەتی نوێی پێ بەخشیوە، ڕەنگ بۆتە بوونەوەرێکی هەرە زیندوو))(سالار، ٢٠٠٩ : ١٥).

شاعیر لە سەرەتای چامە دیوانی والای (ڕەنگدان)دا گەروویەکی زۆر دروست و ڕەوای بۆ ناوەوەی بابەتەکەی خستۆتە ڕوو بەم جۆرە دەست پێدەکات و دەڵێت :

((بێ پێشەکی و یەکسەر لە دارژانی ڕەنگەکانەوە
ئەم ئێوارەیە وا هاتووم ..
لێرە ببم بە شمشاڵ و ڕەنگ بژەنم ..
ڕەنگ .. ڕەنگ .. ڕەنگ .. ڕەنگ ..
کێ ئەتوانێ ڕەنگ بژەنێ ؟! ... من ئەیژەنم !
وەختێ فوو ئەکەم بە ((زەرد)) دا گێژەڵووکەی زەردەپەڕێ
لەناو ڕۆحما هەڵئەکات و
گەواڵەیەکی زەردەڵە وماڵئاوایی ڕەوتینێکی ئەم پایزە
ئەمکا بە کاژەی پێدەشت
بەڕێڕەوێ لە باخی گشتیی خەمتاندا و
وردە وردە دامئەپۆشێ .
کێ ئەتوانێ ڕەنگ بژەنێ ؟! من ئەیژەنم !
ئەو دەمەی سپی ئەژەنم هەر پەپوولەی سپی خەونە و

هەر نەورەسی سپیی شیعرە و .. هەر حەیرانی بەفرانبارە و
هەر منداڵیی و کلووی یەکەم دڵدارییە و
بەسەر مندا دێتە خوارێ ! ...)) (بێکەس، ١٣٩٤ : ٧ – ٨) .

لێرەدا دەتوانین ئەوە بڵێین کە بەڕاستی لەئاستی ئەم هونەر نواندنەی شاعیر ((جوانترین ئارایشت و ڕازاندنەوەی تەلاری نازەنین و بۆشناخ و جوان هەڵچوونی شیعر کراوە و ڕەنگینترین پەنجەرەی بلوورینی لەو کۆشکەدا داناوە، کە ئەگەر (خاو بزانێ چەندە و چۆنە ؟!)) (سالار، ٢٠٠٩ : ١٣).

لێرەدا شاعیر زۆر بەجوانی ڕەنگەکانی بەکارهێناوە بەجۆرێک کە خوێنەر سەرسام دەکات، وەک دەبینین لەنێو ڕەنگی (زەرد) دا دەژی ئەمەش لێکدانەوەی خۆی هەیە، پاشان وەرزی (پایز) کە ئەمیش دەلالەتی شیعری خۆی هەیە، و ڕەنگی زەرد و یەکانگیری پایز و زەردی خۆرئاوابوون و گەڵاڕێزان لەنێو ڕۆحی شاعیرە و شاعیر دەکات بە کاژەی کاروان و زەردەپەڕی تەمەن دەست پێدەکات.

پاشان شاعیر لە ڕەنگی سپییەوە سپی دەژی و دەژی، پەپوولەی سپی، بەڵام سپی خەون کە ئەویش بەهەمان شێوە لێکدانەوەی خۆی هەیە، نەورەسی سپی نەورەسیش دەلالەتی شیعریی خۆی هەیە، سپی شیعریی پاشان بەیەکانگیری منداڵی و یەکەم دڵداری و بەدەم حەیرانی بەفرانبارەوە ! ئەو دوو وێستگەیە کە هەرگیز ناسڕێتەوە، منداڵی وەک دەزانین کە زەینی منداڵ پاک و بێگەردو ڕووتە و شتی جوان تۆمار دەکات، وە یەکەم دڵداریش ورووژاندنی کۆمەڵە هەستێکە کە هی لەبیرچوونەوە نییە، ڕەنگی سپی خاڵی هاوبەشی هەردووکیانە بەتایبەت لەڕووی پاکژی و بێگەردییەوە لە دووتوێی ئەو دوو سەردەمانەوە هەستکردنێکی مەبەستدارە، بەبوون لە جێی خود و ناخدا، وە ئەو ئەرکە نوێیەی بە ڕەنگ سپاردووە، لەم کۆپلە شیعرەدا ڕەنگ دەبینی کە یەکانگیرکردنی کۆمەڵە هەستێکە لە ڕووکەشدا هێمن و هێدییەو وە لە ناوەوەشدا ورووژان و خرۆشان و زرنگانەوەیە، هەروەها لەسایەی ئەو خاسیەتە سپییەدا خەون و حەیران و منداڵی و یەکەم دڵداری و نەورەسی سپی و بەفر ... هتد، لەو سپییەدا ئەوە بەهاری شاعیرە یان مەیل و ئارەزووە بۆ ئەو بەهارە و بینینەوەی گوڵی سپی و ڕەنگی ئەو باخانەیە، کە سەرەتای بەهاریان پۆشیوە و بە شنەبا

و شکۆفە چاویان هەڵهێناوە ئەوە ڕەنگی سەرەتایە هەرچۆن کۆپلەی سەرەتای چامە دیوانەکەیە، کە سپی دابارینە بەسەر گیانی خۆزگەی شاعیردا وە (ئارام و هێمن)ەو، گەڕانەوەیەکی گیانییە بۆ سات و ڕۆژە ساکار و ساماڵەکان و پەیبردنە بەو ڕێگایەی ئارەزووی بینینەوەیەتی و دەکرێ پێناسەی ڕەنگ لەم کۆپلەیەدا بەم شێوەیە بکرێت : ڕەنگ، یەکانگیر کردنەوە و پەیبردنە، گەڕانەوەیە، بینینەوەیە، کە سنووری نییە .

شاعیر لە چامەکەی بەردەوام دەبێت و لە ڕەنگی سپییەوە ڕوو لەدژە ڕەنگەکەی خۆی دەکات کە ڕەنگی ڕەشە (کۆنتراس) دروست دەکات و دەڵێت :

((کێ ئەتوانێ ڕەنگ بژەنێ ؟! من ئەیژەنم
وەختێ فوو ئەکەم بە ڕەشدا، ڕووباری ڕەشی زووخاوێ
ئەهەژێت و شەپۆلی کوێر خۆی ئەکێشێ بەکەناری شەوی مندا و
تەمومژی کێوە ڕەشێ، لەهەردوو قاچی کۆچمەوە
تا سەر و ملی زایەڵەم دائەگرێت و لە دەراڵی تەنگەبەری
هەناسەیشما، ڕەشەبایەک، ((با)) یەکی ڕەش،
بە گڤە گڤی پرسیار و سۆراخەوە، دێت و ئەچێ
ئەو وەختەی کە ڕەش ئەژەنم
سەرپۆشی ڕەشی ژنانی شیعرستانم و گوڵی ڕەشی
کچەکانی و بسکی درێژی شیوەنی زستانێکم تێ ئەئاڵێ!))

(بێکەس، ١٣٩٤ : ٨ - ٩)

دیسانەوە ئەگەر تەماشای ئەم پارچە شیعرەیش بکەین دەبینین چەند بەجوانی شاعیر پەنای بردۆتە بەر بەکارهێنانی ڕەنگەکان بەجۆرێک کە سەرنجمان ڕادەکێشێ و سەرسامان دەکات، لێرەدا دەتوانین ئەوە بڵێین کە بەکارهێنانی ڕەنگ لای شاعیران (دیلاکروا، گۆیا، ئازاد شەوقی) چەند بەهادارە، ئەوا لەم چامەیەشدا گەر بەهاکەی زیاتر نەبێت ئەوا کەمتریش نییە، واتە (شێرکۆ بێکەس) لە بەکارهێنان و ئاماژەکردنی بە ڕەنگەکان توانیویەتی بگاتە ئاستی ئەو شاعیرە ناودارانە و شان لەشانیان بدات ئەمەش بلیمەتیی شاعیرمان بۆ دەردەخات، لەگەڵ سوود وەرگرتنی لە شاعیرانی بیانی شاعیر دەڵێت کێ دەتوانێ ڕەنگ بژەنێ، من ئەیژەنم شاعیر بۆیە ئەم

دێـڕە بەکـاردێنێ چـونکە پێـی وایە کە ئەم یەکەم کەسـە بەم کـارە هەسـتاوە و کەسی دیکە لەپێش ئەم بەم کارە هەڵنەستاوە و ڕەنگی نەژەندووە، وە شـاعیر ((ڕەنگـی نەک تەنها بە ئاواز و مۆسیقا کردووە، بەڵکو بە گەلێک شـتی دیـکە، وە لەلایەکـی دیـکەوە ئەو بڕوابەخۆبـوونە بەهێـزەیە کە تەنهـاو تەنهـا توانـا و بلـیمەتی لێهـاتوویی خەلاّتی مەزنـانی دەکـات ئەو گیـان و هەڵوێسـتی و (التحـدي)یە مـافێکی خـاوەن سـەرمایە گەورەکانی داهێنەرانە)) (سالار، ٢٠٠٩ : ١٢٠).

لێرەدا لەهەموو کەس زیاتر شاعیر خودی خۆی دەزانێ کام سیلەی جاویـدانی وە چ ئافرانـدنێک لە زمـانی شـیعرەکانیەوە دەچـۆڕێ و چ ڕووبـارێکی ڕێکـخەری ڕێگای لێوە هەڵگرتووە، بڕوانن چ گەشتێک و چ ڕۆڵێـک و چ ئەرکێکـی بە ڕەنگـی ڕەش داوە و هەر ڕەنگەو تایبەتمەندێتیی خۆی هەیە و حـاڵەتی خـۆی هەیە و هـێماو دەلالەتی خۆی شاعیر و شەو و ڕستەی گونجـاوی ڕەنـگەکەی خسـتۆتە بەردەسـت، بۆیە هاوتا و هاوتەریبی و هاومەبەستی لەنێوان ڕەنگ و واتاکانیـدا دروسـت کـردووە، وە کەرەســتەکانی هەروەکــو بیناســازێکی بەســەلیقە و بەتەرازوو بەوردەکــارییەوە بەکاریهێناوە و کۆمەڵێک وشە و دەسـتەواژە و ڕسـتەی جـوانی دەربڕیـوە و لە هەمـان کاتیشـدا حـاڵەتی بـۆ ڕەنگـی ڕەش هێنـاوەتەوە وەکـو ڕووبـاری ڕەشی زووخـاوی، شـەپۆلی کـوێر، کەنـاری شـەوی مـن، تەمـومژی کێـوە ڕەش، دەراپـی تەنـگەبەری، هەناسەیش و، ڕەشەبای رەش و گڤە گڤی پرسیار و سەرپۆشی ڕەش و ... هتد، شـاعیر لە ڕێگەی ڕەنـگەوە سیناریۆیەک یـان داڕشـتنێکی سینەمایی ئامـادە کـردووە و هەر بەڕەنگ مەبەست و بیرۆکە و گەشتی بەباری دەروونییەوە دانـاوە . شـاعیر بەجۆرێـک ڕەنگەکـانی تـێکەڵ بەیەک کـردووە کە ڕەنـگە ئەسـتەمبێ بـۆ خـوێنەرێکی ئاسـایی لەواتـای ئەو ڕەنگـانە تێبگـات ئەمەش دانـایی و شـارەزایی شـاعیرمان پیشـان دەدات لەبارەی ڕەنگەکانەوە .

وەک دەبینـین لە کـۆپلەی یەکەمـدا جیهـانێکی سـپی و لە دووەم کۆپلەشـدا چەسـپاندنێکی کلۆڵی و خاکسـپاری و تراژیـدیای (سـەرپۆشی ڕەشی شیعریسـتانم) پاپەندی هەندێ حاڵەتی کردووین کە بۆکرووزی لـێ دێـت و جەرگ دەسـووتێنێ و لۆژیک لە حوکمی سیناریۆی ڕەنگەکەدا وا دەڵێت و ئەوە نەبێـت کە ڕەنگـی شـاعیر

زەوق و تەرخانی تاک یا حاڵەتێبێ، بەڵکو ڕەنگ کەرەستەیە و ئەوەی خۆی نیازیەتی پێی دروست دەکات وەک ئەو قوڕەی پەیکەرساز و سیرامیک کاری پێدەکەن و مرۆڤی پێ دروست دەکەن، یان گوڵدان یان هەر شتێکی دیکە، ڕەنگ لای شاعیر هەمیشە لە جووڵە و گۆڕاندایە و ئەرک لەدوای ئەرکی پێ ئەسپێردرێ و پێی ئەنوێنێ، واتە چەق بەستوو نییە شاعیر لەدوای ژەنینی ڕەنگی سپی و ڕەش لەپاشاندا دەستی بۆ ژەنینی ڕەنگێکی دیکە بردووە کە ئەویش ڕەنگی سوورە، کە دەڵێم ژەنینی ڕەنگ مەبەستم ئەوەیە کەوا شاعیر گیان و بەرگێکی نوێی بەجەستەی ڕەنگەکاندا کردووە و دەتوانین ئەوە بهێنینە پێش چاومان کەوا شاعیر لەسەر شانۆیە و نەی دەژەنێ وە لە گەرووی نەیەکەیەوە ڕەنگ دێتە دەرەوە بەشێوەی پەپوولەی باڵ نەخشین و ڕەنگاو ڕەنگ، وە بەرە بەرە ڕەنگەکان دێنە سەماکردن و دەبنە شانۆ، یان بۆنموونە کاتێک هونەرمەندێک ئامێرێکی مۆسیقی دەژەنێ دەبینین لەژێر ئەو ئامێرەوە ڕەنگ دەبارێ ئەمەش خۆی لەخۆیدا هەڵکشانێکی ئێستاتیکییە و لەشوێنی خۆیەوە هاتۆتە ئاراوە، ئەمجارەیان (شێرکۆ بێکەس) بەشێوەیەکی زۆر جوان ڕەنگی سوورمان بۆ دەژەنێ، بەڵام لە پلە ڕەنگێکی کاڵترەوە دەست پێدەکات کە ئەویش ڕەنگی (پەمەیی) یە، گەشتر و ئاڵتر و گەرمتر دەبێت بەسەر ڕەنگی سوور و ئاڵدا هەڵدەگەڕێ، شاعیر دەڵێت :

ڕەنگ .. ڕەنگ .. ڕەنگ .. ڕەنگ..
((وەختێ پەمەیی بژەنم .. لەپاش تۆزێ ئەبم بە سوور
هەروەختێکیش سوورم ژەنی
من ئیتر بووم بە زارگەلی ئەو مێژووەی
دەنکە دەنکە تەرزەی سوور و نمە نمەی ژانی سوور و،
وشە وشەی دەنکی سوور و، من هەڵاڵەم تیا ئەبارێ)) (بێکەس، ١٣٩٤ : ٩).

ئاشکرایە کە ڕەنگی پەمەیی یەکێکە لەو ڕەنگانەی کە بەواتای ئەڤینی و شەیدایی و نەوایی دێت، وە ڕەنگێکی ناسک و نازداری خانمانەیە، بەڵام دەکرێ لێرەدا بپرسین بۆ لە ڕەنگی پەمەییەوە بۆ ناو ڕەنگی سوور ؟! دیارە هەر ڕەنگەو

چەنـدین لایەنی هەیە بەهەمـان شـێوە هەمەجـۆر واتـا و مەبەستیشی ـ هەیە، بۆنمـوونە ڕەنگی سوور نیشانەی

(خـوێن، شـەفەق، شـۆڕش، جەربەزەیـی، کوشـتار، گەرمـی، ئەویـن، ئـاگر، توندوتیژی و نیشانەی ڕۆژی خۆشەویستیشە) بەڵام هەر ڕەنگەو بەپێی شـوێن و کـات و حـاڵەت و سـەردەمێک واتـاکەی دەگۆڕێـت بۆنمـوونە شـاعیری بەناوبـانگی میللەتەکەمان (پیرەمێرد) دەڵێت :

((من ڕەنگی سوورم بۆیە خۆش ئەوێ

مژدەی شەفەقی لێ دەس ئەکەوێ)) (ڕەسووڵ، ١٣٩٧ : ١٠٢).

لێـرەدا پیرەمێـردی شـاعیر ڕەنگـی سـووری بـۆ واتـا و مەبەسـتێکی دیـکە بەکارهێناوە، باس لەوە دەکات کەوا ڕەنگـی سـوور مـژدە و خـۆشی پێـوەیە و هـێمای ئـازادی و سـەرکەوتن و شـەهادەتە، واتە بەپێـی مەبەسـتە شـیعرییەکە واتـاکەشی دەگۆڕێت .

دەبینین (شێرکۆ بێکەس) لەم کۆپلەیەدا مەبەستی لە ڕەنگـی سـوور ئەو ڕەنـگە (پۆزەتیڤ) ەیە، کە کـارلێککردنی ترشـۆکەیی لەگەڵ تیشـکە چـالاکە بزوێنەرەکانـدا دەکات، ئەو ڕەنگەی کە لە یەک چـرکەدا چـوار ملیـۆن ڕەنـگە لەریـنەوەی هەیە، ئەم ڕەنگە تێکەڵ بەمێژوو بووەو چووەتە ناو مێژووەوە و هێنانی گەل و بەتایبەتی زارگەلی جـگەلەوەی پەیوەسـتی مێـژوو بەگەلەوە، وە لەڕووی وێـنەی شـیعری و ئێسـتاتیکی مەعریفیشەوە گونجاوە و چووەتە ناو مێژوویەکی سوور، سووری سـەرتاپا خوێنـاوی، هەربۆیە تەرزە سوورە، ژوان سوورە، وشـە دەنگـی سـوورە ... هەڵاڵەش نەک بەسـەر شاعیردا دەبارێت بەڵکو لەشاعیر خۆیەوە دەبارێت و لە نـاخی شـاعیردا هەڵاڵە بـارانە، ((هەڵاڵەش ئەو گـــوڵە کێـــوییە ناســـکەیە کە ڕەنگێکـــی ئـــاڵی هەیە و هەڵاڵەی کۆهسـارانیش تەمەنی یەک هەفـتەیە، بەڵام لەگەڵ هەسـتە ڕۆمانسـییەکەیدا گەلـێ مەبەستی جوانی لەخۆی گرتووە هەڵاڵە بارین نەشئەی ڕابردوو ئێستا دەبارێ، خـوێن دەبارێ بۆیە خوێن سوورە، لفە لفەی نەرمە بارانی بۆ ژانی سوور خواسـتووە)) (سـالار، ٢٠٠٩ :٩٠) دەتـوانین ئەوە بڵێـین کە چـامەی (ڕەنگـدان) ڕازاوەتـرین و بەپیتـترین کێڵگەی ئەو ئاوازە بێدەنگانەیە کە (شێرکۆ بێکەس) لە بێدەنگییەوە هێنـاویەتیە گـۆ و

گۆرانی وتن و سەما و هەڵسوکەوت و هەڵوێست نواندن، نەک هەر ئاوازە، بەڵکو ڕەنگ و ژەنیارە و لەهەمان کاتدا و لە مەزنترین و باڵاترین پلەدا ژیان دەژەنێ .

وە لە کۆتایی تابلۆی ڕەنگداندا شاعیر دەستی کردووە بەوەی کە بەشێوەیەکی شاراوە ڕەنگەکان بەکار بهێنێت، ئەمەش لای زۆربەی شاعیران بەکارهێنراوە و بەرامبەر بەهەر ڕەنگێک ڕەمزێک یان هێمایەک بەکار هێنراوە، وە ئەم ڕەنگانە لەنێو شیعردا بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ ئاماژەن بۆ ڕەنگە ئاشکراکان . بۆنموونە :

((شەو، سێبەر، ئاماژەن بۆ ڕەنگی ڕەش
بەفر ئاماژەیە بۆ سپی
خوێن، گوڵاڵە، شۆڕش ئاماژەن بۆ ڕەنگی سوور
پایز ئاماژەن بۆ ڕەنگی زەرد ... هتد)) (هذاع، ٢٠٠٨ : ١٣٢).

شاعیر بە وشەی (شەو) یان (ڕەش) دەست پێدەکات و ڕەنگیش لە سێ کەرەستە خۆی دەگرێتەوە (شەوی مەرگ، لمی بیابان، زریکەی کۆچ)، کۆی ئەو سێ کەرەستەیە یەک واتا دەگەیەنن، بەتایبەت لای میللەتی کورد واتای (جینۆساید) دەگەیەنێت، کەوا ڕژێمی بەعسی ـ داگیرکەر بەسەر میللەتی کوردیدا هێنا، واتە مەبەست لە کارەساتی (ئەنفال)ە ئەو کارەساتە جەرگبڕەی کە بۆ هەمیشە لە یادی گەلی کوردا چەسپاوە و لەبیر ناچێتەوە، خودی شاعیریش ئەو کارەساتەی ئاوێزانی یەکێک لە ڕەنگە شاراوەکان کردووە و دەڵێ (پێی دەڵێن ڕەنگی ئەنفال) .

شاعیر لەم بارەیەوە دەڵێت :

((کە شەو داهات
لەناو دۆڵێکی وڵاتدا
لە هەرکوێیەک خۆت بتەوێ
ئەتوانی سێ ڕەنگ تێکەڵکەی
بەیەکەوە و لەناویەکدا لەناو دۆڵدا
تێکیان هەڵدەی :
شەوی مەرگ
لمی سەحرا و

زریکەی کۆچ
بەیەکەوە تا بەیانی بیانشێلی
ئەنجام ڕەنگێک دروست ئەبێ، ڕەنگێکی نوێ
پێی ئەڵێن: ڕەنگی ((ئەنفالیی)!)) (بێکەس، ١٣٩٤ : ٣٠)

شاعیر لێرەدا بەدوای ڕەنگێکەوە وێڵە و ڕەنگێکی دەوێ، کە بتوانێ گوزارشت لەو کارەساتە بێ وێنەیە بکات و، ڕەنگێ کە بتوانێ سەختیی ئەو کارەساتە دەرببڕێ و پڕبەپڕی قووڵی تراژیدیاکە بێت، ئەو حاڵەتەی کە هیچ ڕەنگێک یان وشە و ڕستە و جۆرە داڕشتنێک و هیچ شیعرێک ناتوانێ دەریببڕێ و دەرەقەتیبێ، بەڵکو هەر هەموو ڕەنگەکان دۆشداماون بەرامبەر بەو کارەساتە جەرگبڕە ((کەواتە شاعیر لە ڕاستە ڕێگایەکەوە، داوای بینینەوەی ڕەنگێک دەکات، بەڕوونی بێت وێنەکە بخاتە ڕوو، ئەو ڕووداوەی باس لە قەڵاچۆکردنی بەستەزمانانی دەکات، زمان لە بەردەمیدا دێتە گرێ و گۆ ناکات)) (سالار، ٢٠٠٩ : ٩٧). شاعیر چامە واڵاکەی بەڕەنگێکی دیکەی شاراوە کۆتایی پێدێنێت ئەویش (ڕەنگی مەرگە) بەڵام ((ڕەنگی مەرگ وەک ویستبێتی لەم چامەیەوە بە ڕەنگەکان و گەشتە ڕەنگەکەی ژیانی خۆی وێنە بکێشێ و کۆتاییەکەشی (خوانەویستە) بەمەرگی خۆی بهێنێ و لەدوا دێڕەکانیشدا دیاری دەستی هەر ڕەنگە، ئەو ڕەنگەی کە مایەی سەرسام بوون بێ نەبینراوبێ)) (سالار، ٢٠٠٩ : ٩٨).

شاعیر دەڵێت :
((چاوەڕێم بە !
ئەی ڕەنگی مەرگ
لە نوختەیەکی سەرسامدا چاوەڕێم بە !
کتومت وەک سەرسامبوونی وڵاتەکەم،
لەبەردەم مێژووی چەقۆدا !.
لە نوختەیەکی سەرسامدا چاوەڕێم بە !)) (بێکەس، ١٣٩٤ : ١٢٦).

لەم کۆپلەیەشدا بەهەمان شێوەی کۆپلەکانی دیکە شاعیر باسی لەڕەنگ کردووە، بەڵام ڕەنگێکی جیاوازتر لە ڕەنگەکانی دیکە کە ئەویش (ڕەنگی مەرگە)

دیارە بەلای شاعیرەوە مردنیش ڕەنگێکی تایبەت بەخۆی هەیە کە ڕەنگە ئێمە تا ئێستاش زەینمان بەلایدا نەڕۆشتبێ و درکمان پێ نەکردبێ، شاعیر زۆر بەجوانی یاری بە ڕەنگەکان کردووە و خوێنەری ئاشنا بەهەندێ ڕەنگی نوێ کردووە .

**ئەنجام**

لە کۆتایی ئەم توێژینەوەیەدا گەشتم بەم ئەنجامانەی لای خوارەوە :

١ـ ڕەنگ یەکێکە لە بنەما سەرەکییەکانی دروستکردنی وێنەی هۆنراوەیی نوێخواز و وێنەی هونەری لای شاعیران، بەتایبەتیش لای (شێرکۆ بێکەس)ی شاعیر.

٢ـ شاعیر لە چامەکەیدا بەزۆری ڕەنگی بەکارهێناوە و بەپێی مەبەستی تایبەتی خۆی، ویستوویەتی لە ڕێگەی ئەو مەبەستانەوە گوزارشت لە ناخی خۆی بکات و کارەسات و ناخۆشییەکانی میللەتەکەی بخاتە پێش چاوی خوێنەر .

٣ـ وەک دەبینین شاعیر بەشێوەیەکی زۆر ناسک و جوان و ورد و قوووڵ و سەرنجڕاکێش ڕەنگی بەکارهێناوە و هۆنراوەکانی پێی ڕازاندۆتەوە .

٤ ـ لە ڕێگەی ئەم توێژینەوەوە ئەوەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە کەوا تا چەند پەیوەندییەکی بەتین و پتەو لەنێوان ئەدەب و سایکۆلۆژیادا هەیە .

٥ـ شاعیر بەدوو جۆر پەنای بۆ بەکارهێنانی ڕەنگەکان بردووە، وەک لە هۆنراوەکانیدا دەبینرێت ئەوانیش بەشێوەی ئاشکرا و شاراوەیە .

٦ـ لە ڕێگەی ڕەنگەکانەوە دەتوانین لە ناخ و دەروونی کەسانی دەوروبەرمان تێبگەین .

٧ـ هەندێ جار تەنیا ڕەنگێک دەتوانێت گوزارشت لە زۆر شت بکات و زۆر شتمان بیر بخاتەوە و پیشان بدات .

## لیستی سەرچاوەکان

أ_ سەرچاوە کوردییەکان :
١_ بێکەس، شێرکۆ ١٣٩٤: ڕەنگدان، چاپی یەکەم، ناوەندی بڵاوکردنەوەی نیشتیمان، سنە.
٢_ ڕەسووڵ، موحەمەد ١٣٩٧: دیوانی پیرەمێرد، چاپی یەکەم، ناوەندی -بڵاوکردنەوەی کانی کتێب.
٣_ ڕەئووف، لوقمان ٢٠١٦: دەقی کوردی لە ڕوانگەی سیمۆلۆژییەوە، چاپی یەکەم، دەزگای ئایدیا.
٤_ زەنگەنە، مستەفا ٢٠٠٢: ڕەنگ لە زمانی کوردیدا، چاپی یەکەم، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر.
٥_ سالار، ئەحمەد ٢٠٠٩: ڕەنگ لە ڕەنگداندا، چاپی یەکەم، چاپخانەی کەمال، سلێمانی.
٦_ سعدون، سامان عیزەدین ٢٠١٥: دەقە شیعرییەکانی گۆران لە ڕوانگەی دەروونناسییەوە، چاپی یەکەم، چاپخانەی تاران.
٧_ سلێمان، هانی ٢٠٠٩: دەروونزانی گشتی، چاپی یەکەم، نێوەندی بڵاوکردنەوەی ئارام.
٨_ عزیز، عیزەدین أحمد ٢٠١١: بنەماکانی دەروونزانی گشتی، چاپی دووەم، چاپخانەی ڕۆژهەڵات، هەولێر.
٩_ عیسا، هاوژین سلێوە ٢٠٠٩: بنیاتی وێنەی هونەری لە هۆنراوەکانی (شێرکۆبێکەس)دا، چاپی یەکەم، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی.
١٠_ وڵبەرت، لویس ٢٠١٥: خەمۆکی، و: کەمال فاروق نەسرەدین، چاپی یەکەم، چاپخانەی چوار چرا، سلێمانی .

ب_ سەرچاوە عەرەبییەکان :
١- عبدالوهاب، شكري ١٩٨٥: الاضاءة المسرحية، الهيئة المصرية للكتاب، القاهرة .
٢- عبيد، كلود ٢٠١٣: الالوان، المؤسسة الجامعية للدراسات والنشر والتوزيع، بيروت .
٣- علي، أسعد ١٩٨١: مسرح الجمال والحب والفن في صميم الانسان، الطبعة الثالثة، دار الرائد، بيروت .
٤ _عمر ،احمد مختار ١٩٨١: اللغة واللون، العالم كتب، القاهرة.
٥_ هذاع، ظاهر محمد ٢٠٠٨: اللون ودلالات في شعر، الطبعة الاولى، عمان .
پ_گۆڤار :
١_ هیمەت، فازڵ ٢٠١٢: گۆڤاری نیگا، ژمارە (١٢٦) .

## ملخص البحث

## علم نفس الألوان في لون ديوان الشاعر(شيركو بيكس)

م.م. مژدة اسماعيل نوري
قسم اللغة الكوردية/ كلية التربية/ جامعة گرميان

من الواضح ان إحدى العناصر الاساسية لإنشاء أي تصميم فني او قصيدة رائعة هي اللون الذي يستخدمه الشعراء في قصائدهم، والتي من خلاله سوف يعرضون قصائدهم، حيث يتم استخدامه في فترة زمنية محددة وله اهمية ليس فقط في المنهج الكلاسيكي أو الرومانسي و إنما اكثر الشعراء يستخدمون اللون في قصائدهم، لهدف خاص محدد خلف اعطائهم اللون في قصائدهم.

ان أحد الشعراء الذي اشار الى اللون اكثر من بقية الشعراء الذين اشاروا الى اللون والذي لديه ديوان (مجموعة من القصائد) بعنوان (اللون) هو الشاعر (شيركو بيكس) حيث ان هذا الشاعر كان له تأثيرا كبيرا على الشعر بحيث أدخل لونا مختلفا آخر الى قاموس الالوان في الشعر .

محتوى هذه الدراسة تتكون من جزئين :

الجزء الاول / والذي فيه يتم التعرف على الالوان وانواعها بشكل نظري .

الجزء الثاني / وهو الجزء العملي للبحث حيث يتم فيه تحليل ابيات شعر الشاعر التي تشكل اللون فيها دورا كبيرا في التعبير عند هدف القصيدة .

في نهاية هذه الدراسة عرضت النتيجة وخلاصة البحث باللغتين الانكليزية والعربية بالإضافة الى المصادر .

في هذه الدراسة اظهرت او وضحت (طريقة التحليل الوصفي) .

ومع هذا بحثي يتضمن مجموعة من الكلمات القفلية التي اهمها هذه الكلمات (اللون، الحارة، الباردة، اللونيات، اللالونيات) .

# Abstract the study

## The psychology of colors in the color of the poet(sherkobekas)

It is obvious one of the basic item of producing or creating design of art, and splendour poem is coulor that is used by poets . They will show their poem through it . It is used in every period,

Poets used couler in their poems, and behind giving couler has special purpose . one of the poet more than other poets pointed to couler and has adivan (collection of poems) by the name of couler is(SherkoBekas) . This poet made agreat impact even he brought another different couler to the dictionery of couler .

The content of the study consist of two parts : First part, type and recognizing couler showed in the theoretical part . The second part is the practical part which analyze the verses of the poet that couler has agreat role in expressing the aim of the poem . At the end of the study the result and abstract is giving in English and Arabic language with the sources . In this study I demonstrated the process of (method analyzing descriptive ) .

# هاوبێژی لە پەندەکانی (پیرەمێرد)دا

**م. ی. مەسعود بەکر ئەحمەد**

بەشی کیمیای ژیانی کلینیکی / کۆلێژی زانستە تەندروستییەکان/ زانکۆی هەولێری پزیشکی

**پێشەکی:**

هاوبێژی دیاردەیەکی زمانیی باوە و لە گشت زمانەکانی جیهانـدا بـوونی هەیـە، ئەگەرچی ڕێژەیان لە زمانێك بۆ زمانێکی تر جیاوازە، لێکۆڵەران هاوبێژی بە هێـزێکی ئـابووری بـۆ بـەهای زمـانی لەقەڵـەم دەدەن، چونکـە هـاوبێژی ڕۆنـانی سـەرەکی و گەوهەری لەخۆ دەگرێ بۆ شۆڕشی زمانی، کە ئەمەش بە بارێکی سروشـتی بـۆ زمـان دادەنرێت، زمانی کوردیش لە دیاردەی هاوبێژی بێبەش نییە و زۆر بـە زەقـی هەسـتی پێدەکرێت. توێژینەوەکە باس لە دیاردەی هاوبێژی لە زماندا دەکـات، کـە بابـەتێکی سەرەکییە لە چوارچێوەی پەیوەندییە واتاییەکانی نێوان وشەدا.

**ناونیشانی توێژینەوەکە:**

توێژینەوەکە بەناونیشانی: هاوبێژی لە پەندەکانی (پیرەمێرد)دا

**هۆی هەڵبژاردنی توێژینەوەکە:**

هــۆی هــەڵبژاردنی توێژینەوەکــە بــۆ ئــەوە دەگەڕێتــەوە، کــە ویســتوومانە بەشێوەیەکی ڕوون بـاس لـە دیـاردەی هـاوبێژی لـە زمـانی کـوردی بکـەین، چونکـە هـاوبێژی بابـەتێکی گرنگـی زمانـە لـە بـواری واتـادا، بۆیـە ئێمـە لێـرەدا هەوڵمانـداوە بەشێوەیەکی تێروتەسەل باسی لێوە بکەین و نموونەی بـەرچاوی لـە زمانەکەمانـدا بـۆ بهێنینەوە.

**سنوور و بواری توێژینەوەکە:**

سنووری توێژینەوەکە لـە ئاسـتی واتاسـازی وشـەدایە لـە چوارچێـوەی ڕسـتە و دەقی شیعری لە پەندەکانی پیرەمێردی شاعیردا.

**ڕێبازی توێژینەوەکە:**

توێژینەوەکـە لـەڕووی واتاسـازییەوەیە، ڕێبـازی (وەسـفی شـیکاری) لـەخۆ گرتووە.

**گرنگی توێژینەوەکە:**

گرنگـی توێژینەوەکـە لەوەدایـە، کـە بـە شـێوەیەکی کـارەکی و ورد بـاس لـە دیـاردەی هـاوبێژی و بابەتـەکانی دەکـات لـە زمـان و زمـانی کـوردی بەتایبـەتی، بەپشتبەسـتن بەنموونـە هاوبێژییـەکان لـە پەنـدەکانی پیرەمێـردی شـاعیردا، لەگـەڵ لێکدانەوە و باسکردنی نموونە هاوبێژەکان.

**ناوەرۆکی توێژینەوەکە:**

توێژینەوەکـە لـە پێشـەکی و دوو بـەشی سـەرەکی پێکـدێت و بـە ئـەنجام و سەرچاوەکان کۆتایی دێت.

بـەشی یەکـەم، لـە سـێ تـەوەر پێکـدێت. تـەوەری یەکـەم ئـەم بابەتانـە لـەخۆ دەگرێـت: هـاوبێژی لـەڕووی زاراوە و زمانەوانییـەوە، چـەمك و پێناسـەی هـاوبێژی، هاوبێژی لە زماندا. تـەوەری دووەم پێکهـاتووە لـە: ئاستەکانی هـاوبێژی، جۆرەکـانی هاوبێژی، سەرچاوەی دروستبوونی هاوبێژی. تەوەری سێیەم: چۆنیەتی جیاکردنەوەی وشەی هاوبێژ لـە وشـەی فرەواتـا، و جیاکردنـەوەی وشـەی هـاوبێژ لـە فرەواتـا بـەپێی فەرهەنگ لەخۆ دەگرێت.

بەشی دووەم بـەشی کـارەکی توێژینەوەکەیـە و ئـەم بابەتانـە بـەخۆوە دەگـرێ. یەکەم: هاوبێژی نێوان دوو ناو لە پەندەکانی پیرەمێرددا. دووەم: هاوبێژی نێـوان نـاو و ئاوەڵناو لە پەندەکانی پیرەمێرددا. سێیەم: هاوبێژی نێوان ناو و ئاوەڵکار لە پەنـدەکانی پیرەمێرددا. چـوارەم: هـاوبێژی نێـوان نـاو و کـار لـە پەنـدەکانی پیرەمێـرددا. پێنجـەم: هاوبێژی نێوان دوو کار لە پەنـدەکانی پیرەمێـرددا. شەشـەم: پەیوەنـدیی نێـوان کـار و ئاوەڵناو لە پەندەکانی پیرەمێرددا. لە کۆتاییشدا کورتەیەك لە لێکۆڵینەوەکە بە هـەردوو زمانی عەرەبی و ئینگلیزی خراوەتەڕوو.

## بەشی یەکەم
## ئاوڕدانەوەیەک لە هاوبێژی

### ١-١- هاوبێژی لە ڕووی زاراوە و زمانەوانییەوە:

Homonymy لــە بنچینــەدا وشــەیەکی یۆنانییــە و لــە دوو مــۆرفیم پێکهــاتووە، ئەوانیش (homo)، کە بە واتای (هەمان، یاخود وەك یەك) دێت، لەگەڵ (onoma)، کـە بە واتای (دەربڕین) دێت. (شریـف بوشـارب، ٢٠١٦: ١٤٠)، لـە زمـانی ئینگلیزیشـدا دوو وشـەکە بـە گۆڕانکـاری و دەسـتکارییەوە لێکـدراون و بـووە بـە (Homonymy) (عبـدالكريم مجاهـد، ١٩٨٥: ١١٢) کـە لـە زمـانی کـوردی بـە واتـای (هـاوبێژی) یـان (هاودەنگی) دێت. هاوبێژی بەو دوو وشە، یان زیاتر دەڵێن، کە لـە دەربـڕین، یـان لـە نووسین، یاخود لە دەربڕین و نووسیندا وەکو یەکن، بەڵام لە واتـا و ڕەگـەزدا جیـاوازن و لە یەکتر دوورن، یان دیاردەیەکە لە وشە هاوبێژەکان دەکۆڵێتەوە، هـەروەها هەنـدێ جار هاوبێژی هەندێ لە دانـەکانی زمـان و کەرەسـتەی تـریش لـە خـۆ دەگـرێ، وەك هەندێ لە (ئامراز و مۆرفیم و فرەیز و ڕستە)کان.

هاوبێژی وشەیەکی لێکدراوە لە سێ مۆرفیم پێکهاتووە، مۆرفیمی {هاو}، کـە بـە واتای هەمان، یان وەك یەك دێت، مۆرفیمی {بێـژ} بـە واتـای گـوتن، یـاخود دەربـڕین دێت، لەگەڵ مۆرفیمی بەندی وشەگۆڕی {ی}، کە مۆرفیمێکە فۆرمی وشـە دەگـۆڕێ، بەڵام واتا بنجییەکەی هەروەکو خۆی دەهێڵێتەوە.

### ١-١-١- چەمك و پێناسەی هاوبێژی:

هەندێ بارودۆخ لە زماندا هەڵدەکەوێ، کـە دەبێتـە هـۆی دروسـتبوونی چەنـد وشەیەکی وەك یەك لە دەربڕیندا، بەڵام لـە واتـادا جیـاوازن. (رمضـان عبـدالتواب، ١٩٩٩: ٣٠٨) لە زمانەوانیدا Homonym هاوبێژی بریتییە لەو وشانەی، کە هاوبەشـن لـە هـەمان ڕێنووس و هەمان دەربڕین، بەڵام لە واتادا جیـاوازن، وشـەکانیش بنچینـەیان جیـاوازە. وەك: bear (گیانـدار- ورچ) و bear (هەڵـدەگرێت- کـار)، left (پێچەوانـەی ڕاسـت- چـەپ) و left (جێیهێشـت- کـاتی ڕابـردوو). (Veronika Richtarcikova, pdf: 1) هاوبێژی ئاسایی ئاستەنگ لە بەرانبەر تێگەیشـتنی زمـانی بـە ڕادەیـەکی هەسـتپێکراو

دروست ناکات، وشەکانی لەم جۆرە دەگەڕێنەوە بۆ جۆری وشەی جیاواز لە بەشە ئاخاوتنی جیاواز، کە تەواو جیاوازن لە یەکتر، هەروەك ئەوەی هەندێکیان ناون و هەندێکیان کارن، هەندێکیان ئاوەڵناون و هەندێکیان ئاوەڵکارن (ستیفن اولمان، ١٩٧٥: ١٢٦).

عەلی عەبدولواحید دەڵێ: ((کاتێك بۆ وشەیەك چەند واتایەك هەبێت، هەر یەکێك لە وشەکانیش لە ڕێگەی واتای ڕەسەنەوە ئاماژەی بۆ بکرێت، نەك لە ڕێگەی خوازەوە ئەوە بەوە دەوترێت هاوبێژی)). (علي عبدالواحد وافي، ٢٠٠٤: ١٤٥) لە زمانی عەرەبیشدا دیاردەی هاوبێژی گەلێ زۆرە و وشە هاوبێژەکان زۆر بە زەقی هەستیان پێدەکرێت. ((بۆ نموونە لە کتێبی "مراتب النحوين" کە (أبي طيب)ی زمانەوان نووسیویەتی، وشەی (خال) بە چەندەها واتا دێنێتەوە، وەك: (برای دایك، شوێنێکی بەتاڵکراو، چۆڵ و تێدا نەماو، سەدەی ڕابردوو، ئاژەڵی بار و سوار، وەك (وڵاخ)، پیاوی لەخۆبایی، خاڵی سەر ڕوو، هەور، چیای ڕەش (چیای گەورە)، ئەو بەرگەی مردووی پێ دادەپۆشرێ (کفن)، پیاوی خواپێداوی باش، وشتری قەڵەو و گەورە، گومان و پێشبینیکردن، پیاوی بە تەمەن، ئێسترەوان، پیاوی تەنها و بێ تاوان، بە خەیاڵدا هاتن)). (عبدالرحمن جلال الدين السيوطي، ب.ت: ٣٧٦)

لەگەڵ ئەوەی زۆرجار شێوەی نووسین و درکاندنی وشە هاوبێژەکان تەواو وەکو یەکن، بەڵام لە نووسیندا سیاقی ڕستە، و لە قسەکردندا سیاقی ئاخاوتن ڕۆڵی سەرەکی دەبینن لە دەستنیشانکردنی واتای هەریەکەیان و جیاکردنەوەی لەوەی تر. (Potter, 1961: 59)

**١-١-٢- هاوبێژی لە زماندا:**

**أ- هاوبێژی لای زمانەوانە ڕۆژئاواییەکان:**

هاوبێژی بریتییە لەو وشانەی، کە لە واتادا جیاوازن، بەڵام لە دەربڕیندا وەکو یەکن. (Fromkin & Roodman, 1978: 167) یاخود بریتییە لە چونیەکی دوو وشەی سەربەخۆ، یان زیاتر، کە لە بنچینەدا سەرچاوەیان جیاواز بێت و بە ڕێکەوت دروست بووبن، وەك وشەی sound لە بنەڕەتدا لە چوار سەرچاوەی جیاوازەوە سەرچاوەی

گرتووە و دواتر لە پێکهاتەدا لەیەك نزیك بوونەتەوە و بوون بە یەك، بەڵام بە واتای جیاواز. sound وشەیەکی جێرمەنیی کۆنە و بە واتای (جەستە تەندروست) دێت، بەڵام sound لە زمانی ئینگلیزی کە بە واتای (دەنگ) دێت، لە بنچینەدا بۆ وشەی son دەگەڕێتەوە، دەنگی /d/ گۆڕانەکە بۆ وشەکە و دواتر بۆی زیادکراوە. لە زمانی فەرەنسی sound بە واتای (پێوانی قووڵایی) دێت، کە بۆ کاری sonder درێژ بۆتەوە، هەروەها sound لە هەندێ لە زمانە جەرمانییە جیاوازەکان بە واتای (گەرووی ئاو) دێت. (ستيفن اولمان، ١٩٧٥: ١٢٥)

**ب- هاوبێژی لای زمانەوانە عەرەبەکان:**

زانا ئوسوڵییەکان لەبارەی هاوبێژییەوە گوتوویانە: ((دەربڕینێکە ئاماژە بە دوو واتای جیاواز، یان زیاتر دەکات)) (عبدالرحمن جلال الدين السيوطي، ٢٠٠٨: ٣٦٩)، هاوبێژی ئەو دەربڕینەیە، کە زیاتر لە واتایەك لە خۆ دەگرێت. (أحمد مختار عمر، ٢٠٠٩: ١٤٧)، ((وشە هاوبێژەکان ئەو دەربڕینانەن، کە لە شێوەدا وەك یەکن، بەڵام لە واتادا جیاوازن)). (توفيق محمد شاهين، ١٩٨٢: ٢٨) ئەگەر دەربڕینێك لە زماندا ئاماژە بە دوو شتی جیاواز بکات ئەوا بە هاوبێژی ناودەبرێت. (إبراهيم أنيس، ١٩٨٤: ٢١٢) هاوبێژی لە زماندا ئەو کاتە دروست دەبێت، ئەگەر چەند شتێکی جیاواز بە یەك ناو دەرببڕێن. (حاتم صالح الضامن، ١٩٨٩: ٧٨) وەك:

العجوز١: زەوی

العجوز٢: چێڵ

العجوز٣: دار خورما (حازم علي كمال الدين، ٢٠٠٧: ١٦٠).

"سيبويه" زمانەوان لە بارەی هاوبێژییەوە دەڵێ: بریتییە لە دوو وشەی وەك یەك بۆ دوو واتای جیاواز، وەك:

السائل١: پرسیارکەر

السائل٢: شلە (سيبويه، ١٩٨٨: ٧)

بۆیە لەگەڵ ئەوەی وشە هاوبێژەکان لە دەربڕیندا وەك یەکن، بەڵام لە بنچینەدا هەریەك لە وشە هاوبێژەکان وشەی سەربەخۆن، نەك سەرچاوەی تاکە وشەیەك بن، وەکو:

الجد١: باوکی دایك، یان باوکی باب

الجد٢: بەخت

الجد٣: کەنار (سالم سليمان الخماش، ٢٠٠٧: ٩)

**پ- هاوبێژی لە زمانی کوردیدا:**

ئەوڕەحمانی حاجی مارف لە بارەی هاوبێژییەوە دەڵێ: ((چۆن لە گشت زمانێکدا، هەروەها لە زمانی کوردیشدا وشە هەن، کە بە وتن و خوێندنەوە و نووسین وەك یەکن، بەڵام واتایان جیاوازە، وەك:

باو١- دەستوور

باو٢- باوك

باو٣- زیادەی شتێك بە سەر شتێکی تردا)). (ئەوڕەحمانی حاجی مارف، ٢٠١٤: ٣١٦، ٣١٧)

هاوبێژی دیاردەیەکی زمانییە و لە هەموو زمانەکانی جیهاندا بوونی هەیە و هەستی پێدەکرێت، بەو دوو وشە، یان چەندان وشەیە دەوترێت، کە لە دەربڕیندا وەك یەکن، بەڵام لە واتادا جیاوازن، بۆ نموونە (گڕ) لە زمانی کوردیدا بە چەندەها واتا دێت، هەموو واتاکانیش لەیەك دوورن. وەك:

گڕ١: کڵپە.

گڕ٢: ددانی یەکێك کە بۆ لای پێشەوە دەرچووبێت.

گڕ٣: دەنگی فڕۆکە و ئۆتۆمبێل و ئامێری تر، هەروەها بۆ دەنگی کەسێك، کە نائاسایی بێت.

گڕ٤: لە یاری چاوشارکێ دەگوترێ. (فەتاح مامە عەلی، ١٩٨٩: ٤، ٥)

کەواتە هاوبێژی لە زماندا بەو دوو وشە، یان زیاترە دەڵێن، کە لە دەربڕین و نووسیندا وەك یەکن، بەڵام هەریەکەیان ئاماژە بۆ واتایەکی جیاواز دەکەن.

**١-٢- ئاستەکانی هاوبێژی:**

هاوبێژی کۆمەڵێ، یان جووتێ دانەی مۆرفۆلۆجی، یان سینتاکسین، لە دەربڕیندا یەکن، بەڵام لە ڕووی واتا و ڕۆنان و ڕەگەزدا جیان، لەگەڵ ئەوەی ئەم

دیاردەیە لە زماندا بەزۆری لە ئاستی وشەدا هەیـە، بـەڵام هەنـدێ جـار لـە ئاسـتەکانی تریش ڕوو دەدەن، هەروەك لە خوارەوەدا ئاماژەی بۆ دەکەین.

**١-٢-١- هاوبێژی لە ئاستی وشەدا:**

لەم ئاستەدا هەردوو دەربڕینە هاوبێژەکە مۆرفیمی سەربەخۆ (وشە)ن، وەك:

شیر١: شیری خواردنەوە

شیر٢: شمشێر

**١-٢-٢- هاوبێژی لە ئاستی فرێز:**

لەم ئاستەدا هەردوو دەربڕینە هاوبێژەکە فرێزن، وەك:

لەبەر ماران١: لە پێش ماڵان

لەبەر ماران٢: بەهۆی ماری خشۆکەوە

**١-٢-٣- هاوبێژی لە ئاستی پاڕستەدا:**

لەم ئاستەدا دەربڕینە هاوبێژەکان پاڕستەن، وەك:

کە پێم لێنا١: کە بە سەری کەوتم.

کە پێم لێنا٢: کە خواردنەکەم بە ئەو لێنا.

کە پێم لێنا٣: کە دانم پیانا.

**١-٢-٤- هاوبێژی لە ئاستی ڕستەدا:**

لەم ئاستەدا هەردوو هاوبێژەکە ڕستەن، وەك:

لێم خوڕیەوە١: دووبارە خۆم لەو توورە کرد.

لێم خوڕیەوە٢: دووبارە هاژوشتمەوە. (فەتاح مامە عەلی، ١٩٨٩: ٧)

**١-٢-٥-جۆرەکانی هاوبێژی:**

**١-٢-٥-١- هاوبێژی جیانووس، یا هاودەنگ Homophone:**

زاراوەیەکە لە شیکردنەوەی واتایی بۆ ئاماژەکردن بەو وشانە بەکاردێت ، کـە لـە گۆکردندا وەك یەکن، بـەڵام لـە ڕێنـووس و واتـادا جیـاوازن. (R. R. Hartman, 1971: 104)، بۆ نموونە لە زمانی ئینگلیزیدا وشەی site (شـوێن، پێگـە) و sight (دیمـەن) لـە

ڕێنووسدا جیان و لە دەربڕیندا وەکو یەکن، بەمەش دەگوترێت Homophone هاوبێژ (ف- بالمر، ١٩٨٥: ١١٧)، هاوبێژی جیانووس (هاودەنگ) لە زمانی ئینگلیزیدا زۆرە، وەك: sea (دەریا) بە شێوەی ناو- see (دەبینێ) بە شێوەی کار (أحمد مختار عمر، ٢٠٠٩: ١٦٧)، بەڵام بە پێچەوانەوە لە زمانی کوردیدا نییە.

**١-٢-٥-٢- هاوبێژی هاوپیت Homograph:**

زاراوەیەکە لە شیکردنەوەی واتاییی بۆ ئاماژەکردن بەو وشانە بەکاردێت، کە هەمان ڕێنووسیان هەیە، بەڵام لە گۆکردن و واتادا جیاوازن. (David Crystal, 2008: 230)، بۆ نموونە هەردوو وشەی lead (مادەی ڕەساس) و lead (ئەو پەتەی کە ئاژەڵی پێدەبەستنەوە) بە یەك شێوە دەنووسرێن، بەڵام دەربڕین و واتایان جیاوازە. (ف- بالمر، ١٩٨٥: ١١٧) لە خوێندنەوەدا هێز (سترێس) و هەڵوەستە ڕۆڵی سەرەکییان لە دیاریکردن و جیاکردنەوەی وشە هاوپیتەکان هەیە. لە زمانی کوردیدا هاوبێژی هاوپیت بەگشتی بۆ جیاوازی دانانی (هێز) و (هەڵوەستە) لە شوێنی دەربڕیندا دەگەڕێتەوە، کە لە خوارەوە باسیان دەکەین.

١- نموونەی هاوبێژی بە هۆی (هێز)ەوە، وەك:

هەمانە'١: کیسەیەکە لە پێستی مەڕ، یا بزن دروست دەکرێت.

'هەمانە٢: ئێمە هەمانە.

نەمام'١: درەختێك کە تازە ڕواوە و هێشتا پێنەگەیشتووە.

'نەمام٢: من نەمام (فەوتام). (بێخاڵ عبدالله سعید، ١٩٨٩: ٦٠)

٢- نموونەی هاوبێژی بەهۆی هەڵوەستەوە، وەك:

بەرماڵ١: دووگردی نوێژ

بەر ماڵ٢: پێش ماڵ (بەر دەرگا)

**١-٢-٥-٣- هاوبێژی تەواو Homonymy:**

زاراوەیەکە لە شیکردنەوەی واتاییی بەکاردێت بۆ ئاماژەکردن بەو یەکە فەرهەنگیانەی، کە هەمان شێوەیان هەیە، بەڵام لە واتادا جیاوازن. (David Crystal, Homonymy 2008: 231) هاوبێژی بریتییە لە پەیوەندیی نێوان شێوە و واتا،

لە نووسیندا بریتییە لە زنجیرەیەك لە پیت، لە ئاخاوتندا بریتییە لە زنجیرەیەك لە دەنگ (Charles W. Kreidler, 1998: 52) وەك: bank1 و bank2، کە یەکەمیان بە واتای (دامەزراوەی دراوی- خەزێنە) دێت و ئەوەی دووەمیش لە زمانی ئینگلیزیدا بە واتای (کەناری دەریا) دێت. (جون لاینز، ١٩٨٧: ٤٥) هەروەها نموونەی ئەم جۆرە هاوبێژییە لە زمانی کوردی، وەك:

ئاش١: جێی هاڕینی دانەوێڵە.

ئاش٢: چێشت. (محمد معروف فتاح، ٢٠١١: ١٧٤)

کەواتە هاوبێژی تەواو ئەو وشانە دەگرێتەوە، کە لە ڕووی ژمارەی دەنگەکان، ڕیزبوونی دەنگەکان، شێوەی دەنگەکان، جۆری دەنگەکان و نووسینی دەنگەکان تەواو وەکو یەکن، بەڵام لە واتا و ڕەگەزدا جیاوازن.

**١-٢-٦- سەرچاوەی دروستبوونی هاوبێژی لە زمانی کوردی:**

سەرچاوەی دروستبوونی هاوبێژی لە زمانی کوردی بۆ ئەم خاڵانەی خوارەوە دەگەڕێتەوە:

١- بوونی چەند دیالێکت و بەشە دیالێکتێك لە زمانی کوردی هۆیەکی گرنگە لە دروستبوونی وشەی هاوبێژدا، وەك:

بەش١: پارچە، لە کرمانجی خواروو.

بەش٢: گیانداری ناوچەوان سپی، لە دیالێکتی کرمانجی ژووروو.

٢- لە ئەنجامی تێپەڕبوونی کات و ڕۆژگار واتای هەندێ لە وشە فرەواتاکان لە یەکتر دوور کەوتوونەتەوە و بوونەتە وشەی هاوبێژ، وەك:

زێ ١: ڕووباری زۆر گەورە.

زێ ٢: ئەندامی مێینە.

٣- چۆن لە مێژووی پەیدابوونی وشەی گشت زمانێکدا، ئاواش لە مێژووی پەیدابوونی زمانی کوردیدا وشەی وەك یەك هەیە، بەڵام واتایان جیاوازە، وەك:

باهوو١: شان و قۆڵ.

باهوو٢: ئاسۆ.

٤- هەندێ جار لە باری گۆڕینی وشەدا، وەك لکاندنی ئامراز، هەروەها کورتکردنەوە و سوانەوەی وشە، وشەی هاوبێژ دروست دەبێت. (ئەوڕەحمانی حاجی مارف، ١٩٧٥: ١٨، ١٩)

٥- هەندێ جار بەهۆی وەرگرتنی وشە لە زمانی بێگانەوە بۆ زمانی ڕەسەن هاوبێژی دروست دەبێت، کاتێك لە بەرانبەر وشە وەرگیراوەکەدا وشەیەك هەبێت لە زمانە ڕەسەنەکەدا وەك ئەو بێت، ئەو کاتە دوو وشەکە لە شێوەدا وەك یەك دەبن، بەڵام لە واتادا جیاواز دەبن و هاوبێژی لە زماندا دروست دەکەن. (إفتخار محمد علي، ٢٠٠٤: ١٥٨) وەك وەرگرتنی وشەی (ئاذار) لە زمانی عەرەبی و گۆڕینی دەنگی /ذ/ بۆ /ز/ لە زمانی کوردی و بوونی بە ئازار کە دەکاتە مانگی (٣)ی ساڵ، لە بەرانبەر وشەی (ئازار) کە بەواتای (ئێش) دێت، هاوبێژی دروست کردووە.

٦- بەکارهێنانی خوازە بۆ وشەیەك دەبێتە هۆی گواستنەوەی واتای وشە لە واتا ڕەسەنەکەوە بۆ واتای مەبەست (خوازراو)، ئەمەش دەبێتە هۆی دروستبوونی جیاوازیی واتا و گۆڕانی واتای وشە. (شريف بوشارب، ٢٠١٦: ١٣٢) وشە خوازراوەکە دەبێتە هاوبێژ بۆ وشە ڕەسەنەکە، هەروەها هەندێ جار لە ئەنجامی زۆر بەکارهێنانیدا وشە خوازراوەکە سیمایەکی نوێ وەردەگرێت و دەبێتە وشەیەکی ڕەسەن لە زماندا. (إبن سيده، ١٩٩٦: ١٧٣)

**١-٣- چۆنیەتی جیاکردنەوەی وشەی هاوبێژ لە وشەی فرەواتا:**

جیاکردنەوەی وشەی هاوبێژ لەگەڵ وشەی فرەواتا لە دوو خاڵدا دەردەکەوێت:

١- سەرچاوەی دروستبوونی وشە هاوبێژەکان بۆ وشەی جیاواز دەگەڕێنەوە، بەڵام سەرچاوەی دروستبوونی وشە فرەواتاکان بۆ یەك بنچینە (وشە) دەگەڕێتەوە.

٢- واتای وشە هاوبێژەکان لەیەکتر دوورن، بەڵام واتای وشە فرەواتاکان نزیکن لە یەکتر. (ئەوڕەحمانی حاجی مارف، ١٩٧٥: ١٤) بۆ نموونە لە زمانی کوردیدا (خاڵ- خاڵی ڕوومەت) و (خاڵ- برای دایك) و (خاڵ- نوقتە) هیچ پەیوەندییەکی واتایی پێکەوەیان نابەستێتەوە، هەروەها هیچ ئەدگارێکی واتایی هاوبەشیان نییە. کەواتە ئەمانە تەنیا هاوبێژن (سەلام ناوخۆش و نەریمان خۆشناو، ٢٠٠٩: ٢٢٦)، بە پێچەوانەوە ئەو

وشانەی، کە لە یەك بنچینەوە هاتوون و واتاکانیان لە یەك نزیکن بە فرەواتا لە قەڵەم دەدرێن، وەك: ڕۆژ (خۆر) و (ڕۆژەکانی هەفتە). (عەبدولواحید موشیر دزەیی، ٢٠١٠:١٠٥)

**١-٣-١ جیاکردنەوەی وشەی هاوبێژ لە فرەواتا بەپێی فەرهەنگ:**

بۆ جیاکردنەوەی وشە هاوبێژەکان لە وشە فرەواتاکان و تۆمارکردنیان لە فەرهەنگدا، دەبێ ڕەچاوی دوو خاڵ بکرێت:

١- ئەگەر وشەکان هاوبێژ بوون، دەبێ لە فەرهەنگدا بەپێی ژمارەی وشە هاوبێژەکان دەروازەی سەربەخۆ و جیایان بۆ بکرێتەوە و دابەش بکرێن، واتە لە دوو دەروازەی جیاواز، یان زیاتر بنووسرێن بەپێی ژمارەی وشە هاوبێژەکان، بەم شێوەیەی خوارەوە، وەك:

هەڵات١: دەرکەوت

هەڵات٢: ڕایکرد

هەڵات٣: ترشان

٢- بەڵام ئەگەر وشەکان فرەواتا بوون، دەبێ هەموو وشە فرەواتاکان بەسەر یەك دەروازەدا دابەش بکرێن، چونکە حیسابی یەك وشە بۆ وشە فرەواتاکان دەکرێت و بەم شێوەیەش دەنووسرێت، وەك:

بەردان: ١- ئازادکردن

٢- بەڕەڵڵا کردن

٣- خستنە خوارەوە (تاڵیب حوسێن عەلی، ٢٠١٤: ٢٨٦، ٢٨٧)

**١-٣-٢ جیاکردنەوەی وشەی هاوبێژ و فرەواتا بەپێی زانستی ئیتمۆلۆجی:**

بەپێی زانستی Etymology (زانستی مێژوو و ڕەگەزی وشە) دەبێ بگەڕێینەوە بۆ سەرچاوەی دروستبوونی وشەکە تا دەگاتە ئەمڕۆ، واتە ئەو گۆڕانکارییانەی لە ڕووی دەنگ و واتاوە بەسەریدا هاتووە بە درێژایی مێژووی وشەکە. (صباح رشید قادر، ٢٠٠٠: ١٤) بەپێی ئەم میتۆدە لە لێکۆڵینەوەیەکی ئاوادا ئەگەر دەرکەوێ فۆڕمەکان لە ڕەگی جیاوازەوە سەرچاوەیان گرتبێ و بە تێپەڕبوونی کات فۆڕمی دەنگ و نووسینیان وەکو

یەکی لێهاتبێ، ئەوا وەکو هاودەنگ (هاوبێژی) – هاونووس دەخرێتەڕوو. (کورۆش سەفەوی، ٢٠٠٦: ٥٣) واتە ئەگەر بنچینەی پێکهاتنی وشەکان جیاواز بوون، ئەوا ئێمە لە بەرامبەر هاوبێژیدایین، بەڵام ئەگەر لە ڕووی ئیتمۆلۆژییەوە دەرکەوێ فۆڕمە لێکچووەکان لە یەك ڕەگەوە گەردان کرابن، ئەوا وەکو فرەواتایی دەخرێتەڕوو. واتاناسەکان زانستی ئیتمۆلۆجی بە خاڵێکی گرنگ دادەنێن بۆ جیاکردنەوەی هەردوو دیاردەی هاوبێژی و فرەواتایی لە یەکتر. بۆ نموونە لە زمانی کوردییدا وشەی (ئازار)، دوو واتای هەیە، وەك:

ئازار ١: ئێش

ئازار ٢: مانگی ئازار

لەبەرئەوەی ڕەگەزی هەردوو وشەکە یەك نین و جیاوازن، بۆیە بە هاوبێژ دادەنرێن، بەڵام واتاکانی وشەی (مانگ)، لەبەرئەوەی لەیەك بنچینەوە سەرچاوەیان گرتووە، ئەوە بە فرەواتا دادەنرێن نەك هاوبێژ، وەك:

ڕۆژ: ١- ڕۆژی ئاسمان (خۆر). ٢- ڕۆژەکانی حەفتە. ٣- ڕووناکی، پێچەوانەی تاریکی.

**١-٣-٣ جیاکردنەوەی وشەی هاوبێژ و فرەواتا بەهۆی لێڵیی کەرەستەکانەوە:**

لە واتاسازیدا زاراوەی لێڵی Ambiguity ئەوە دەگەیەنێ، کە وشەیەك، یان ڕستەیەك زیاتر لە واتایەکی هەبێ، تەمومژی لە زماندا بەهۆی کەرەستە هاوبێژ و فرەواتاکان دروست دەبێت. لە ناو ڕستەدا زۆرجار کەرەسەیەك، یان زیاتر لێڵی دروست دەکات، وەك: (کوڕەکە شیرەکەی بە کابرا فرۆشت) وشەی شیر کە وشەیەکی هاوبێژە تەمومژی واتایی بۆ ڕستەکە دروست کردووە، لەبەرئەوەی ئەم وشەیە زیاتر لە واتایەکی هەیە، شیر ١ (شمشێر)، شیر ٢ (شیری خواردنەوە- حلیب)، بۆیە بۆ ڕەواندنەوەی ئەم تەمومژییە دەبێ پەنا ببەینە بەر ڕۆنانی خوارەوەی ڕستەکە بۆ دۆزینەوەی واتاکانی، وەك:

١-کوڕەکە (شمشێر)ەکەی بە کابرا فرۆشت.

٢-کوڕەکە (حلیب)ەکەی بە کابرا فرۆشت.

هـەروەها لـە ڕسـتەی (کورسـییەکی نـوێ بـۆ موحەممـەد تـەرخان کـرا)، ئـەم ڕستەیەش تـەمومژی واتـایی دروسـت کـردووە، بـەهۆی وشـەی (کورسـی)یەوە، کـە وشەیەکی فرەواتایە، چونکە نازانرێ ئایا مەبەست لـە کورسـی، (کورسـی ئاسـایی)یە، یاخود (پلەوپۆستە).

## بەشی دووەم
## هاوبێژی بە پێی بەشەکانی ئاخاوتن لە دیوانی (پەندەکانی پیرەمێرد[1])دا

**٢-١- هاوبێژی نێوان دوو ناو لە (پەندەکانی پیرەمێرد)دا:**

(١)- ئەوی هەڵگری بە وشك و تەڕە
لە ماڵی خۆیا شای بەحر و بەڕە
بەڕە شڕ دەشۆی بە ئاوی کانی
قەدری ئاو مەگەر لە چۆڵ بزانی (پەندەکانی پیرەمێرد، ل ١٧)

بەڕە١: بر، وشەیەکی عەرەبییە و بە واتای وشکانی دێت.

بـەڕە٢: ((ژێرەخەرێکـە لـە بـەن دروسـت دەکرێـت)) (شـێخ محەمـەدی خـاڵ، ٢٠١٧:٥٦)

(بـەڕە)ی دێـڕی یەکـەم هـاوبێژە لەگـەڵ (بـەڕە)ی دێـڕی دووەم، هـەردوو وشەکەش ناون.

(٢)- ئای بۆ ئەو ڕۆژەی ترس دێ بە سەرا
کونەمشك لامان ئەبێ بە سەرا (پەندەکانی پیرەمێرد ، ل ٦٨)

سەرا١: سەری مرۆڤ

سەرا٢: ((کۆشك، خانوو)) (زانەر محەمەد، ٢٠١٢: ١٨٩)

سەرا" لە نیوە دێڕی یەکەم بە واتای (سەر) دێت و لـە نیـوە دێـڕی دووەم بـە واتای (کۆشك) دێت، هەردوو وشەکەش هاوبێژی ناوین.

(٣)- وا هات جەمعی قاز کە بوو بە قازان
مەنجەڵی گەورەیش پێی ئەڵێن قازان (پەندەکانی پیرەمێرد، ل ١٥١)

قازان١: بە واتای (کۆی قازەکان) دێت، کە ناوێکی کۆیە و بەهۆی مۆرفیمی [ان] کۆ دروستبووە.

قازان٢: مەنجەڵی گەورەی چێشت لێنان.

وشەی "قازان" لە نیوە دێڕی یەکەم ناوێکی کۆیە و کۆی (قاز)ە، بەڵام لە نیوە دێڕی دووەم ناوێکی تاکە، بەو مەنجەڵە گەورەیە دەڵێن، کە خواردنی زۆری تێدا دروست دەکرێت و هەردوو وشەکەش هاوبێژن لە زمانی کوردیدا.

(٤)- کە لە شەڕ دوور بین خودامان یارە

با هەر سەیران بێ لە گردی یارە (پەندەکانی پیرەمێرد، ل ٢٥٥)

یارە١: پشت و پەنا.

یارە٢: ناوی تەپۆلکەیەکە، دەکەوێتە پارێزگای سلێمانی.

وشەی "یارە" لە کۆتایی نیوە دێڕی یەکەم بە واتای (پشت و پەنا) دێت و لە کۆتایی نیوە دێڕی دووەمیش بە واتای (ناوی شوێن) دێت، هەردوو وشەکەش هاوبێژن.

(٥)- ئاگری جەهەننەم ناهێنێتە بیر

بە پاڵی شەیتان ئەکەوینە (بیر) (ل ٣٤٥)

بیر١: فکر (هۆش).

بیر٢: چاڵێکی قووڵی تەسکە لە زەویدا. (شێخ محەمەدی خاڵ، ٢٠١٧: ٧٢)

"بیر" لە هەردوو نیوە دێڕی یەکەم و دووەمدا ناوە و دوو وشەکەش هاوبێژن، بەڵام لە نیوە دێڕی یەکەم بە واتای (فکر) دێت و لە نیوە دێڕی دووەم بە واتای (چاڵ) دێت.

(٦)- ئینسان لە نسیان دروست کراوە

بیری ناو بیری لە بیر نەماوە (پەندەکانی پیرەمێرد، ل ٢٦٤)

بیر١: یاد.

بیر٢: چاڵ، مەبەست (گۆڕ)ە.

بیر٣: فکر (زیهن).

لە نیوە دێڕی دووەمدا وشەی "بیر"ی یەکەم بە واتای (یاد) دێت و "بیر"ی دووەم بە واتای (گۆڕ) و "بیر"ی سێیەم بە واتای (فیکر، زیهن) دێت.

(٧)- بەڵام کە (کەباب) بوو بە بابۆڵە

تێی ئەورووژێن، ڕۆڵە و بابۆڵە (ل ٤٢٧)

بابۆڵە١: لەففە، ((پارووە نانی درێژ و پێچراو)). (گیوی موکریانی، ٢٠١٧: ٨٤)

بابۆڵە٢: باوك.

"بابۆڵە" لە نیوە دێڕی یەکەم بە واتای (لەففە) دێت و لە نیوە دێڕی دووەمیش بە واتای (باوك) دێت، هەردوو وشەکەش هاوبێژن.

(٨)- بە هەر چوارپەلدا ئەکەونە (جووتە)

کردەیان لەگەڵ شەیتانا جووتە (پەندەکانی پیرەمێرد، ل ٤٣٩)

جووتە١: لووشکە، (لێدان بە پێیەکانی پشتەوە) تایبەتە بۆ ئاژەڵ. ((لەقەی وڵاخی یەکسمە بە هەردوو پاشووی)). (شێخ محەمەدی خاڵ، ٢٠١٧: ١٥٥)

جووتە٢: دوو، دووانە، دووانە هاوڕێ.

وشەی "جووتە" لە نیوە دێڕی یەکەم بە واتای (لووشکە) دێت، کە زیاتر بۆ گیانداری ئەسپ و گوێدرێژ بەکاردێت، بەڵام شاعیر بە شێوەی خواستن بۆ مرۆڤ بەکاری هێناوە، کەچی لە نیوە دێڕی دووەمدا جووتە بە واتای (وەك یەك) هاتووە.

(٩)- یەکێکیان تیایە ئاگری بن کایە

کە شێخ و مەلاش دێنێتە کایە (پەندەکانی پیرەمێرد، ل ٤٤٢)

کایە١: کا، خواردنی ئاژەڵە لە قەسەڵی پاشماوەی قەدی گەنم، یا جۆ دروست دەکرێ.

کایە٢: نۆرەیەك لە یارییەك. یاری. (شێخ محەمەدی خاڵ، ٢٠١٧: ٤٤١)

"کایە" لە نیوە دێڕی یەکەم بە واتای (کای خواردنی ئاژەڵ) دێت، هاوبێژە لەگەڵ کایەی نیوە دێڕی دووەم، کە بە واتای (یاری) دێت.

(١٠)- سەرمایە و سەروەت ڕم و ئەسپێ بوو

لە چڵکا لەشیان پڕ لە ئەسپێ بوو (پەندەکانی پیرەمێرد، ل ٤٨٤)

ئەسپێ١: یەك ئەسپ.

ئەسپێ۲: ئەسپێی سەر، زیندەوەرۆچکەیەکی ڕەشی بچووکە بە هۆی چڵکی و پیسییەوە دەچێتە لەش و سەری مرۆڤ و خوێنەکەی دەمژێت.

"ئەسپێ" لە نیوە دێڕی یەکەم بە واتای (ئەسپ) دێت و لە نیوە دێڕی دووەم بە واتای (ئەسپێی سەری مرۆڤ ) دێت، دوو وشەکەش هاوبێژن.

(۱۱)- تەلیسمی جامی چل کلیلەیە
زمانی دانا بە کلیلەیە (ل ۱۷۹)
کلیلە۱: گەوهەر.
کلیلە۲: کلیل.

وشەی "کلیلە" لە نیوە دێڕی یەکەم لە زمانی عەرەبی بە واتای (گەوهەر) دێت، کە شاعیر بەکاری هێناوە، و لە نیوە دێڕی دووەم کە شاعیر لە زمانی کوردی بەکاری هێناوە بە واتای (کلیل) دێت، هەردوو وشەکەش هاوبێژن.

**۲-۲- هاوبێژی نێوان ناو و ئاوەڵناو لە (پەندەکانی پیرەمێرد)دا:**

(۱۲)- (بەفر) وەك سەرم باری بە سەرما
کوێستانیم باکم نییە بە سەرما (ل ۵۹۵)
بە سەرما۱: بە سەر من.
بە سەرما۲: بە ساردی و سۆڵە.

"بە سەرما" لە نیوە دێڕی یەکەمدا فرەیزی ناوییە و بە واتای (بە سەر من) دێت، و لە نیوە دێڕی دووەمدا فرێزی ئاوەڵناوییە و بە واتای (بە ساردی) دێت، هەردوو وشەکەش هاوبێژن.

(۱۳)- ئەڵێن بارەگای خودا بە حەقە
بێکەس لەبەر شەق ئەحواڵی شەقە (ل ۲۲۰)
شەق۱: زللە.
شەق۲: خراپ.

وشەی "شەق"ی یەکەم لە نیوە دێڕی دووەم ناوە و بە واتای (زللە) دێت و وشەی "شەق"ی دووەمی هەمان نیوە دێڕ ئاوەڵناوە و بە واتای (خراپ) دێت، دوو وشەکەش هاوبێژن.

(١٤)- پیاو بێ (سەرمایە)، کوشتەی سەرمایە

(با) لەو کونەوە تا بێ سەرمایە (ل ٢٨١)

سەرمایە١: سەروەت و سامان.

سەرمایە٢: ساردی و سۆڵە.

وشەی "سەرمایە"ی یەکەم لە نیوە دێڕی یەکەم ناوە و بە واتای (سامان) دێت، بەڵام "سەرمایە"ی دووەمی هەمان نیوە دێڕ، ئاوەڵناوە و بە واتای (ساردی و سۆڵە) دێت، دوو وشەکەش هاوبێژن.

(١٥)- هەندێ تەماعیان هێندە مەحکەمە

سوێندی درۆیان خوارد لە مەحکەمە (ل ٣٤٩)

مەحکەمە١: قایم (پتەو).

مەحکەمە٢: دادگا.

"مەحکەمە" لە نیوە دێڕی یەکەم ئاوەڵناوە و بە واتای (قایم، پتەو) دێت، لە نیوە دێڕی دووەم ناوە و بە واتای (دادگا) دێت، هەردوو وشەکەش هاوبێژن.

(١٦)- تۆ تێری ئەکەی لە نان و کەرە

ئەو کە تێری خوارد پێت ئەڵێ کەرە (ل ٦٢٦)

کەرە١: خواردنێکە کە بە ژەندن لە شیر دروست دەکرێت و لە پەنیر دەچێت.

کەرە٢: لە بنچینەدا "کەر" ناوی گیاندارێکی یەکسمی باربەری بەسەزمانی گوێ درێژە (شێخ محەمەدی خاڵ، ٢٠٠٥: ٣٧٦)، بەڵام زۆرجار بە هۆی خواستنەوەش بۆ مرۆڤ بەکاردێت، کە بە واتای (نەزان) دێت، هەروەکو شاعیر بۆ ئەم مەبەستەی بەکارهێناوە.

**٢-٣- هاوبێژی نێوان ناو و ئاوه‌ڵكار له‌ (په‌نده‌كانی پیره‌مێرد)دا:**

(١٧)- هه‌موو وڵاتمان شوكر ئاوایه‌

قه‌ره‌داغ ناوی زه‌ردی ئاوایه‌ (ل ١٢)

ئاوایه‌١: به‌م شێوه‌یه‌، به‌م چه‌شنه‌یه‌.

ئاوایه‌٢: گوند، دێ، ئاوایی.

"ئاوایه‌" له‌ نیوه‌ دێڕی یه‌كه‌مدا ئاوه‌ڵكاره‌ و به‌ واتای (به‌م شێوه‌یه‌) دێت و له‌ نیوه‌ دێڕی دووه‌م ناوه‌ و به‌ واتای (گوند، ئاوایی) دێت.

(١٨)- خزمه‌تی وه‌ته‌ن گوزه‌شته‌ی پاره‌

هه‌موو بۆ پاره‌ ئه‌بین به‌ پاره‌ (ل ٤٠)

پاره‌١: ساڵی پار، ساڵی ڕابردوو.

پاره‌٢: دراو.

پاره‌٣: پارچه‌، له‌ت، كه‌رت.[٢]

وشه‌ی "پاره‌" له‌ كۆتایی نیوه‌ دێڕی یه‌كه‌م ئاوه‌ڵكاری كاتییه‌ و به‌ واتای (پار) دێت، هه‌روه‌ها پاره‌ی یه‌كه‌می نیوه‌ دێڕی دووه‌م ناوه‌ و به‌ واتای (دراو) دێت و پاره‌ی دووه‌می نیوه‌ دێڕی دووه‌م ئاوه‌ڵكاره‌ و به‌ واتای (كه‌رت، له‌ت) دێت.

(١٩)- حه‌وته‌وانه‌مان بۆ دێته‌ به‌ر ماڵ

ئێمه‌ ئه‌یده‌ینه‌ به‌ر گورزی به‌رماڵ (ل ٩٢)

به‌ر ماڵ١: پێش ماڵ، به‌ر ده‌رگا.

به‌رماڵ٢: ته‌نراوێكی بچووكه‌ پاك و خاوێن ڕاده‌گیرێ و نوێژی له‌سه‌ر ده‌كرێ. (عه‌لی نانه‌وازاده‌، ٢٠٠٥: ٤١٤)

"به‌ر ماڵ" له‌ نیوه‌ دێڕی یه‌كه‌م به‌ واتای (به‌ر ده‌رگا) دێت ئاوه‌ڵكاره‌، له‌ نیوه‌ دێڕی دووه‌م به‌رماڵ ناوه‌ و به‌ واتای (دووگردی نوێژ) دێت، كه‌ دوو وشه‌ی هاوبێژن.

(٢٠)- له‌ كوێی بێخه‌وه‌ ڕه‌مه‌زان پاشا

((محان)) جاڕ بدا و بانگ كا له‌ پاشا (ل ٥١٦)

پاشا١: پادشا، مه‌لیك.

پاشا٢: پاشان، دواتر.

وشەی "پاشا" لە نیوە دێڕی یەکەم ناوە، بە واتای (پادشا، مەلیك) دێت، بەڵام لە نیوە دێڕی دووەم ئاوەڵکاری کاتییە و بە واتای (دواتر) دێت، وشەکانیش هاوبێژن.

(٢١)- ئەمڕۆ ڕۆژێکە سیاسەت باوە

لە زۆرە ملێ چیت داوە، باوە (ل ٥١٧)

باوە١: دەستوور، بڵاو.

باوە٢: باوك.

"باوە" لە نیوە دێڕی یەکەم ئاوەڵکارە و بە واتای (بڵاو) هاتووە (شێخ محەمەدی خاڵ، ٢٠٠٥: ٢٧)، بەڵام لە نیوە دێڕی دووەم ناوە و بە واتای (باوك) دێت. هەردوو وشەکەش هاوبێژن.

(٢٢)- هەوای دانەیە مورغ ئەخاتە داو

سەودای ناوو داو پیاو ئەخاتە ناو (ل ٢٩٠)

ناو١: إسم.

ناو٢: لە ناو.

وشەی "ناو" لە نیوە دێڕی یەکەم ناوە و بە واتای (إسم) دێت، بەڵام لە نیوە دێڕی دووەم ئاوەڵکاری شوێنییە و بە واتای (لە ناو) دێت، هەردوو وشەکەش هاوبێژن.

**٢-٤- هاوبێژی نێوان ناو و کار لە (پەندەکانی پیرەمێرد)دا:**

(٢٣)- یاخوا دەردەگا نەکەوێتە دێ

پاقلە تەواو بوو، وا باینجان دێ (ل ١١)

دێ ١: گوند، لادێ، ئاوایی.

دێ ٢: پێدەگات.

وشەی دێ لە نیوە دێڕی یەکەم ناوە، بە واتای (گوند، لادێ) دێت، لە نیوە دێڕی دووەمیش کارە، بە واتای (پێگەیشتن) دێت، هەردوو وشەکەش هاوبێژن.

(٢٤)- بزن بە مەڕی گوت وا زستان دێ

با خانۆچکەیەك بکەین نزیك دێ (ل ٣٤٣)

دێ١: دێت، دەگات.

دێ٢: گوند، لادێ، ئاوایی.

وشەی "دێ" لە نیوە دێڕی یەکەم کارە و بە واتای (گەیشتن) دێت، بەڵام لە نیوە دێڕی دووەم ناوە و بە واتای (گوند، ئاوایی) دێت، هەردوو وشەکەش هاوبێژن.

(٢٥)- خۆشیان ئەرێی هێشووە خۆشناوێ

جنێو فرۆش بی، باوکتت خۆش ناوێ (ل ١٧)

خۆشناوێ١: تیرە (هۆز)ی خۆشناو

خۆش ناوێ٢: خۆش نەویستن

وشەی "خۆشناوێ" لە نیوە دێڕی یەکەمدا ناوە و بۆ (تیرەی خۆشناو) دەگەڕێتەوە، کەچی لە نیوە دێڕی دووەمدا کارە و بە واتای (خۆش نەویستن) دێت، هەردوو وشەش هاوبێژن.

(٢٦)- ئەودەمە هۆشم لێ شێواو وەستام

کە هەرچی هەڵسا وتی ئاش وەستام (ل ٤٦)

وەستا١: ڕاوەستان.

وەستا٢: ((پیشەزان، پیشەگەر)). (گیوی موکریانی، ٢٠١٧: ١٢٧٩)

وشەی "وەستا" کە لە کۆتایی نیوە دێڕی یەکەم هاتووە کارە، بە واتای (ڕاوەستان) دێت، بەڵام هەمان وشە، کە لە کۆتا نیوە دێڕی دووەم هاتووە، ناوە و بە واتای (کارساز) دێت.

(٢٧)- خوا ئەم چوار فەسڵەی بۆیە وا دانا

کە ئیعتیباری پێ ناکا دانا (ل ١٧٧)

دانا١: دروست کرد.

دانا٢: زانا.

"دانا" لە کۆتایی نیوە دێڕی یەکەم کارە و بە واتای (دروستکردن، جێگیرکردن) دێت، بەڵام لە کۆتایی نیوە دێڕی دووەم ناوە و بە واتای (زانا) دێت.

(٢٨)- ئومێدی دۆستی لە بەدخوو مەکە

ناگۆڕێ ئەگەر بیشچێتە مەکە (ل ٥٦٠)

وشەی "مەکە" لە نیوە دێڕی یەکەمدا کارە و بە واتای (نەکردن) دێت، بەڵام لە نیوە دێڕی دووەمدا ناوە و بۆ شاری (مەککە) دەگەڕێتەوە. هەردوو وشەکەش هاوبێژن.

(٢٩)- کە بە خودبینی خۆت لە خۆت گۆڕی

زوو لە خۆت ئەگەی شایستەی گۆڕی (ل ٢٦٩)

گۆڕی١: گۆڕین.

گۆڕی٢: گۆڕ.

وشەی گۆڕی لە نیوە دێڕی یەکەم کارە و بە واتای (گۆڕین) دێت، بەڵام لە نیوە دێڕی دووەم ناوە و بە واتای (گۆڕ، قەبر) دێت، هەردوو وشەکەش هاوبێژن.

(٣٠)- کە تۆ بە نان و بەرگی کەس نەبی

ئەچیتە ڕیزی یارانی (نەبی) (ل ٢٧١)

نەبی١: نەبیت، نەبوون.

نەبی٢: پەیامهێنەر.

وشەی "نەبی" لە نیوە دێڕی یەکەم کارە و بە واتای (نەبوون) دێت، بەڵام لە نیوە دێڕی دووەم ناوە و بە واتای (پەیامهێنەر) دێت، هەردوو وشەکەش هاوبێژن.

(٣١)- بە ئیملای کۆنە (سڕ) و (سەر) بران

(سڕ) و (سەر) هەردوو پێکەوە بران (ل ٢٨٢)

بران١: برانە.

بران٢: بردران.

وشەی "بران" لە نیوە دێڕی یەکەم ناوە و بە واتای (برا) دێت، بەڵام لە نیوە دێڕی دووەم کارە و بە واتای (بردن) دێت، هەردوو وشەکەش هاوبێژن.

(٣٢)- کاری خۆماڵی بێگانەی ناوێ

ئەم ناوە پیاون بە هەموو ناوێ (ل ٥٠٣)

ناوێ١: نەویستن.

ناوێ٢: ناو (إسم).

وشەی "ناوێ" لە نیوە دێڕی یەکەم کارە و بە واتای (نەویستن) دێت، بەڵام لە نیوە دێڕی دووەم ناوە و بە واتای (ناو، إسم) دێت، هەردوو وشەکەش هاوبێژن.

(٣٣)- ئەمڕۆ بۆ باران فەرەنجیم بەیتێ
سبەینێ بۆ تۆ ئەبێ بە بەیتێ (ل ٤٥٨)

بەیتێ ١: پێدان، بەخشین.
بەیتێ ٢: (خانوو) بە زمانی عەرەبی.

وشەی "بەیتێ" لە نیوە دێڕی یەکەم کارە، بە واتای (دان) دێت، بەڵام لە نیوە دێڕی دووەم ناوێکی زمانی عەرەبییە و بە واتای (خانوو) دێت.

(٣٤)- ئەوەی کە لەسەر تەجروبە بڕوا
هەرچییەك بڵێت پێی بکە بڕوا (ل ٥٨٩)

بڕوا١: ڕۆیشتن.
بڕوا٢: متمانە.

"بڕوا" لە نیوە دێڕی یەکەم کارە و بە واتای (ڕۆیشتن) دێت، لە نیوە دێڕی دووەم ناوی واتاییە و بە واتای (باوەڕ) دێت، دوو وشەکەش هاوبێژن.

(٣٥)- هۆش درەختێکە کردەوە بەریە
لە بڕانەوە، بەری، بەرییە (ل ٢٣٦)

بەریە١: بەرەکەیتی.
بەرییە٢: بردن.

وشەی "بەریە" لە نیوە دێڕی یەکەم ناوە و بە واتای (بەر، بەرهەم) دێت، بەڵام لە نیوە دێڕی دووەم کارە و بە واتای (بردن) دێت، کە دوو وشەی هاوبێژن.

**٣-١- هاوبێژی نێوان دوو کار لە (پەندەکانی پیرەمێرد)دا:**

(٣٦)- قورئان فەرموویە پشت بە خوا بەستە
ئەتخاتە ڕێی ڕاست ئەو سایە بەستە (ل ٢٧)

بەستە١: قایم کردن.
بەستە٢: کافی.

وشەی "بەستە" لە نیوە دێڕی یەکەم بە واتای (قایم کردن) دێت، لە نیوە دێڕی دووەمیش بە واتای (کافی) دێت، وشەکانیش هاوبێژن.

(٣٧)- کە هاتە ئێرە منیش هەروام دی

کەچی وەعدی دا زوو هێنایە دی (ل ٥٨)

دی ١: بینین، دیتن.

دی ٢: ئەنجامدان.

وشەی "دی" لە نیوە دێڕی یەکەم بە واتای (دیتن) دێت، (ت) لابراوە بە مەبەستی ئاسانی دەربڕین، بەڵام لە نیوە دێڕی دووەم بە واتای (کردن، ئەنجامدان) دێت، هەردوو وشەکەش هاوبێژن.

(٣٨)- خوا بیدا و وێنەی ئەستێرە هەڵات

بەدکار بە هەڵات، ڕوو زەرد بوو هەڵات (ل ٣٠٨)

هەڵات ١: دەرکەوت.

هەڵات ٢: ڕایکرد.

وشەی "هەڵات" لە نیوە دێڕی یەکەم بە واتای (دەرکەوتن) دێت و لە نیوە دێڕی دووەم بە واتای (ڕاکردن) دێت، کە دوو وشەی هاوبێژن. (گیوی موکریانی، ٢٠١٧: ١٣١٢)

(٣٩)- پیاومان لە زۆر شوێن مەردی ئەنوێنێ

بەدخوا خەریکە وا ئەو ئەنوێنێ (ل ٥٠٣)

ئەنوێنێ ١: دەردەخات.

ئەنوێنێ ٢: دەخەوێنێ.

وشەی "ئەنوێنێ" لە کۆتا نیوە دێڕی یەکەم، کە بە واتای (دەرخستن) دێت، هاوبێژە لەگەڵ هەمان وشە لە کۆتایی نیوە دێڕی دووەم، کە بە واتای (نوستن) دێت.

(٤٠)- بە(بێ هۆش داروو) تریاك ئەبێژن

خۆڵی مردوومان بە سەرا ئەبێژن (ل ٥٠٣)

ئەبێژن ١: دەڵێن.

ئەبێژن٢: دەبێژن (بێشتنەوە، یا بێژینەوە) بەهۆی بێژینگ (سەرەند)، کە لە چاوگی (بێشتن)ەوە دروست بووە.

وشەی "ئەبێژن" لە نیوە دێڕی یەکەم بە واتای (گوتن) دێت، کەچی لە نیوە دێڕی دووەم بە واتای (لە بێژینگ دان) دێت، کە لە چاوگی (بێشتنەوە)وە وەرگیراوە. هەردوو وشەکەش هاوبێژن.

(٤١)- خوا پێداو بە ڕۆژ سەرخەو ئەشکێنێ

بۆ پاسەوان شەو خەو سەر ئەشکێنێ (ل ٥١٠)

ئەشکێنێ ١: دەکات.

ئەشکێنێ ٢: دەشکێنێ.

وشەی "ئەشکێنێ" لە نیوە دێڕی یەکەم بە واتای (کردن) دێت، بەڵام لە نیوە دێڕی دووەم بە واتای (شکاندن) دێت، هەردوو وشەکەش هاوبێژی یەکترن.

(٤٢)- دوای ئەوەی کەوا گیانمان ئەکێشرێ

لەملا خراپە و چاکە ئەکێشرێ (ل ٦١٠)

ئەکێشرێ ١: دەبردرێ، بردن.

ئەکێشرێ ٢: کێشان.

وشەی "ئەکێشرێ" لە نیوە دێڕی یەکەم بە واتای (بردن) دێت و لە نیوە دێڕی دووەم بە واتای (کێشان) دێت، کە دوو وشەی هاوبێژن.

(٤٣)- کە منداڵەکەت لە برسا ئەگری

ئیتر نازانی چ ڕێیەك ئەگری (ل ٦١١)

ئەگری ١: گریان.

ئەگری ٢: گرتنە بەر.

"ئەگری" لە نیوە دێڕی یەکەم بە واتای (گریان) دێت و لە نیوە دێڕی دووەم بە واتای (گرتنە بەر) دێت. دوو وشەکەش کاری هاوبێژن.

**٣-٢- هاوبێژی نێوان کار و ئاوەڵناو لە (پەندەکانی پیرەمێرد)دا:**

(٤٤)- ئەوەی لە سەر کار پیاوی دانابێ

ئەبێ سەر کاری پیاوی دانا بێ (ل ٢٨٢)

دانا١: دانان.

دانا٢: زانا، شارەزا. (گیوی موکریانی، ١٩٩٩: ٤٠٨)

وشەی "دانا" لە نیوە دێڕی یەکەم کارە و بە واتای (دانان) دێت، بەڵام لە نیوە دێڕی دووەم ئاوەڵناوە و بە واتای (زیرەك) دێت و هەردوو وشەکەش هاوبێژن.

(٤٥)- زۆری وایش هەیە چڵکن و گەڕە

کە ئاسن گەڕا ئەوسا بە گەڕە (ل ٥١٩)

گەڕ١: گڕوو (گەڕی).

گەڕ٢: جوولە (ڕۆیشتن).

"گەڕ" لە نیوە دێڕی یەکەم ئاوەڵناوە و بە واتای گەڕی (گڕوو) دێت، کە نەخۆشییەکە لە شێوەی پەڵە تووشی پێستی مرۆڤ دەبێت، بەڵام لە نیوە دێڕی دووەم کارە و بە واتای (جوولە) دێت، دوو وشەکەش هاوبێژن.

**ئەنجام**

لە کۆتایی نووسینی ئەم توێژینەوەیەدا بەم ئەنجامانەی خوارەوە گەیشتین:

١-هاوبێژی لە زماندا بەزۆری لە ئاستی وشەدا دروست دەبێت و بە دەگمەن لە ئاستەکانی تر دروست دەبێت.

٢-هاوبێژی لەنێو دیوانی پەندەکانی پیرەمێرددا زۆربەی هەرە زۆریان هاوبێژین لە ئاستی وشەدا.

٣-وشە هاوبێژەکانی نێو پەندەکانی پیرەمێرد هەموو بەشە سەرەکییەکانی ئاخاوتنیان لەخۆگرتووە لە زمانی کوردیدا، بە تایبەتی لە هەردوو بەشە ئاخاوتنی ناو و کاردا.

٤-هەریەك لە وشە هاوبێژەکان واتایەکی جیاواز و سەربەخۆی هەیە و دوورە لەوەی تر.

٥-هاوبێژی بە دیاردەیەکی واتایی دادەنرێت لە زماندا، وشە یاخود پێکهاتە هاوبێژەکان پەیوەندییەکی واتایی لەنێوانیان هەیە و هەر ئەم پەیوەندییەش بەیەکیان دەبەستێتەوە لە زماندا.

٦-هاوبێژی بە هێزێکی ئابووری بۆ بەهای زمان لەقەڵەم دەدرێ.

## لیستی سەرچاوەکان

### أ- سەرچاوەی کوردی:


١- ئەورەحمانی حاجی مارف (١٩٧٥)، وشەی زمانی کوردی، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد- بەغداد.

٢- ---------------- (٢٠١٤)، فەرهەنگی زاراوەی زمانناسی، چاپی دووەم، چاپخانەی ڕۆژهەڵات- هەولێر.

٣- بێخاڵ عبدالله سعید (١٩٨٩)، واتاسازی وشە، نامەی ماستەر، زانکۆی سەلاحەددین- هەولێر.

٤- تاڵیب حوسێن عەلی (٢٠١١)، واتاسازی، چاپی یەکەم، چاپخانەی ڕۆژهەڵات- هەولێر.

٥- ------------ (٢٠١٤)، زانستی زمان و زمانی کوردی، چاپخانەی ڕۆژهەڵات- هەولێر.

٦- تۆفیق محمود ئاغا (٢٠١٤)، پەندەکانی پیرەمێرد، چاپی دووەم، بڵاوکراوەی هەژار.

٧- زانەر محەممەد (٢٠١٢)، فەرهەنگی گیرفانی ئۆکسفۆرد، چاپخانەی چوارچرا- هەولێر.

٨- سەلام ناوخۆش و نەریمان خۆشناو (٢٠٠٩)، زمانەوانی، بەرگەکانی یەکەم و دووەم و سێیەم، چاپی یەکەم، چاپخانەی منارە- هەولێر.

٩- شێخ محەمەدی خاڵ (٢٠٠٥)، فەرهەنگی خاڵ، کوردی- کوردی، چاپی دووەم، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە- هەولێر.

١٠---------------- (٢٠١٧)، فەرهەنگی خاڵ، کوردی- کوردی، چاپخانەی ڕۆژهەڵات- هەولێر.

١١-عەبدولواحید موشیر دزەیی، (٢٠١٠)، واتاسازی وشە و ڕستە، چاپخانەی ڕۆژهەڵات، چاپی یەکەم- هەولێر.

١٢-عەلی نانەوازادە (٢٠٠٥)، فەرهەنگی هەرمان، بەرگی یەکەم، چاپی دووەم، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە- هەولێر.

١٣-فەتاح مامە علی (١٩٨٩)، هاودەنگ لە زمانی کوردیدا، نامەی ماستەر، زانکۆی سەلاحەددین- هەولێر.

١٤- صباح رشید قادر (٢٠٠٠)، هاوبێژی و فرەواتایی لە (گیرەك) دا، نامەی ماستەر- لە زمانی کوردی، کۆلێژی زمان - زانکۆی سلێمانی.

١٥- کوروش سەفەوی (٢٠٠٦)، چەند لایەنێکی واتاسازی، وەرگێڕانی: دلێر سادق کانەبی، چاپی یەکەم، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە - هەولێر.

١٦- گیوی موکریانی (١٩٩٩) فەرهەنگی کوردستان، کوردی-کوردی، چاپی یەکەم، چاپخانەی ئاراس- هەولێر.

١٧- ----------- (٢٠١٧)، فەرهەنگی کوردستان، کوردی- کوردی، چاپی دووەم، چاپخانەی ڕۆژهەڵات- هەولێر.

١٨- محمد معروف فتاح (٢٠١١)، زمانەوانی، چاپی سێیەم، چاپخانەی حاجی هاشم- هەولێر.

**ب- سەرچاوەی عەرەبی:**

١٩- أحمد مختار عمر (٢٠٠٩)، علم الدلالة، الطبعة السابعة، مطبعة عالم الكتب- القاهرة.
٢٠- إبراهيم أنيس (١٩٨٤)، دلالة الألفاظ، الطبعة الخامسة، مكتبة الأنجلو المصرية- القاهرة.
٢١- إفتخار محمد علي (٢٠٠٤)، إبراهيم أنيس وأنظاره الدلالية والنحوية، رسالة ماجستير- الجامعة الأردنية- كلية الدراسات العليا، عمان.
٢٢- توفيق محمد شاهين (١٩٨٢)، المشترك اللفظي نظرية وتطبيقا، مطبعة مكتبة وهبة- القاهرة.
٢٣- جون لاينز (١٩٨٧)، اللغة والمعنى والسياق، الطبعة الأولى، مطبعة دار الشؤون الثقافية العامة- بغداد.
٢٤- حاتم صالح الضامن (١٩٨٩)، علم اللغة، مطبعة التعليم العالي- الموصل.
٢٥- حازم علي كمال الدين (٢٠٠٧)، علم الدلالة المقارن، مطبعة مكتبة الاداب- القاهرة.
٢٦- رمضان عبدالتواب (١٩٩٩)، فصول في فقه العربية، الطبعة السادسة، مطبعة مكتبة الخانجي- القاهرة.
٢٧- سالم سليمان الخماش (٢٠٠٧)، المعجم وعلم الدلالة، pdf.
٢٨- ستيفن اولمان (١٩٧٥)، دور الكلمة في اللغة، ترجمة: كمال محمد بشير، مطبعة مكتبة الشباب، الجيزة.
٢٩- سيبويه (١٩٨٨)، الكتاب، تحقيق وشرح: عبدالسلام محمد هارون، ج١، ط ٣، مطبعة مكتبة الخانجي- القاهرة.
٣٠- الشريف بوشارب (٢٠١٦)، ظاهرة الترادف والإشتراك اللفظي في كتابي الفروق اللغوية وفقه اللغة، رسالة ماجستير، جامعة محمد امين دباغين- الجزائر.
٣١- عبدالكريم مجاهد (١٩٨٥)، الدلالة اللغوية عند العرب، دار الضياء –الأردن.
٣٢- عبدالكريم محمد حسن جبل (١٩٩٧)، في علم الدلالة، مطبعة دار المعرفة الجامعية- الأسكندرية.
٣٣- عبدالرحمن جلال الدين السيوطي (٢٠٠٨)، المزهر في علوم اللغة وأنواعها، تعليق: محمد أحمد جاد المولى بك، محمد أبوالفضل إبراهيم، علي محمد البجاوي، الجزء الأول، الطبعة الثالثة، مكتبة دار التراث- القاهرة.
٣٤- علي عبدالواحد وافي (٢٠٠٤)، فقه اللغة، الطبعة الثالثة، مطبعة نهضة مصر- القاهرة.
٣٥- ف-بالمر (١٩٨٥)، علم الدلالة، ترجمة: مجيد عبدالحليم الماشطة، مطبعة جامعة المستنصرية- بغداد.

٣٦- سيبويه (١٩٨٨)، الكتاب، تحقيق: عبدالسلام هارون، الطبعة الثالثة، مطبعة مكتبة الخانجي- القاهرة.

### ج- سەرچاوەی ئینگلیزی:

37-Charles W. Kreidler (1998), Introducing English Semantics, First Published, London.

38-David Crystal (2008), A dictionary of Linguistics and Phonetics- Sixth Edition, Blackwell Publishing.

39-John Algeo, Thomas Pyles (1970), English: an introduction to language, Harcourt, Brace & World, University of Michigan.

40-R. R. K. Hartman & F. C. Stork (1972), Dictionary of language and linguistics, New York.

41-Simeon Potter (1960), Language in the Modern World, London.

42-Veronika Richtarcikova (pdf), Semantics of English, National University of loja.

43-Victoria Fromkin & Robert Rodman (1978), An introduction to language, 2nd ed. New York.

**پەراوێزەکان:**

(١) پیرەمێرد ناوی تەواوی (تۆفیق کوڕی مەحموود کوڕی هەمزە ئاغای مەسرەفە)، لە ساڵی ١٨٦٧ لە شاری سلێمانی لەدایك بووە، شاعیرو نووسەر و ڕۆژنامەنووسێکی ناوداری کورد بووە، لە ساڵی ١٨٩٨ دەچێتە ئەستەنبوڵ و لەوێ کۆلێژی یاسا دەخوێنێت و لە حکومەتی دەوڵەتی عوسمانیدا لەچەند پلەی میری و سیاسیی گرنگ دادەمەزرێت، بەڵام لە دوای شۆڕشی شێخ سەعیدی پیران و تێکچوونی بارودۆخ لە ساڵی ١٩٢٥ دەگەڕێتەوە سلێمانی و تا دوا ساتەکانی ژیانی لەوێ دەمێنێتەوە و خەریکی کاری وێژەیی و ڕۆژنامەوانی دەبێت. هەندێك لەو خزمەتانەی لە بواری ڕۆژنامەوانی بریتیین لە: دامەزراندنی ڕۆژنامەکانی (ڕەسملی کاتب و ڕۆژنامەی کورد تەعاون و تەرەقی غەزەتەسی و ڕۆژنامەی ژین و گۆڤاری ژین). لە (١٩)ی حوزەیرانی ساڵی ١٩٥٠ لە سلێمانی کۆچی دوایی دەکات و لە (گردی مامەیارە) بە خاك دەسپێردرێ.

(٢) بڕوانە (فەرهەنگی کوردستان)ی گیوی موکریانی، ل ٢١٢.

## ملخص البحث

## المشترک اللفظي في أمثال (پیرەمێرد)

م.م. مسعود بكر أحمد
قسم كيمياء الصحية – كلية علوم الصحية
جامعة هولير الطبية

تهتم الدراسة بالمشترك اللفظي عموما، وتلقي الضوء على ظاهرة المشترك اللفظي من ناحية الدلالية في اللغة الكوردية وفي أمثال الشعري لپيرەميرد خاصة، وتضم الدراسة مقدمة ومبحثين.

المبحث الأول: الذي تحت عنوان [نظرة إلى المشترك اللفظي] يتكون من ثلاثة محاور. المحور الأول، يتحدث عن الجوانب المهمة في مجال المشترك اللفظي في اللغة. المحور الثاني يبحث عن مستويات المشترك اللفظي، أنواع مشترك اللفظي ومصادر إنشاء المشترك اللفظي. المحور الثالث، يبحث عن كيفية التفريق بين المشترك اللفظي وتعدد المعاني، وكيفية التفريق بين كلمات المشترك اللفظي وتعدد المعاني حسب المعاجم.

المبحث الثاني: والذي بعنوان [المشترك اللفظي في أمثال پيرەمێرد]، هذا المبحث عبارة عن دراسة تطبيقية لإظهار المشترك اللفظي وأنواعها في أمثال الشعرية للشاعر پيرەمێرد.

وختمت الدراسة بنتائج البحث وقائمة المصادر.

# Abstract
# Homonymy in Peramerd’s Proverbs Poetry

**Assistant Lecturer. Masud Bakir Ahmed**
Hawler Medical University- College of Health Sciences
Clinical Biochemistry Department

This research is entitled (Homonymy in Peramerd’s Proverbs Poetry). The study is concerned the oppositeness and Synonymy in Kurdish language and sheds light on connotation and meaning in addition to the ranges of connotation. The work consists of an introduction and two chapters:

Chapter One: includes three sections: Section one is named A Look at the homonymy, talks about definition of homonymy and important aspects of connotation. Section two deals with the meaning and the homonymy of the word, levels of homonymy, types of homonymy, and other objects of homonymy. Section three contains of quality insolate between homonymy and polysemy words, and insolate homonymy and polysemy words according to dictionary.

Chapter Two: talks about the main subject in this research it is Homonymy in the Proverbs Peramerd’s Poetry. This chapter is a practical study that shows homonymy and its types in the poetry and poems of the Kurdish poet Peramerd’s Proverbs.

The whole study ends with a conclusion followed by outcome research and the bibliography.

# ڕۆڵی سیاسی و سەربازیی مەلیک (جەواد کوڕی مەمدود شەمسەدین کوڕی مەلیک عادل) لە دەوڵەتی ئەیوبیدا (٦٣٥ک/١٢٣٧ز-٦٤١ک/١٢٤٣ز)

**م. ی. سامان نامق تۆفیق**
قوتابخانەی ڕەوەزی تێکەڵاو/
وەزارەتی پەروەردە/
بەڕێوەبەرایەتی پەروەردەی دەشتی هەولێر

**م. نەوزاد خالد رەئووف**
بەشی مێژوو/
کۆلیژی زانستە مرۆڤایەتییەکان/
زانکۆی ڕاپەڕین

**پێشەکی**

دەوڵەتی ئەیوبی وەک دەوڵەتێکی بە هێزی ئیسلامی لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بە دیار کەوتووە کە توانیوێتی بۆ ماوەی نزیکەی (٨٠) ساڵ دەوڵەتێکی بە هێز لە هەریەک لە (مصر) و (الشام) و (حیجاز) و (الیمن) و (برقة) لە لیبیا دروست بکات، بێگومان دوای مردنی سوڵتان (صلاح الدین) ئەیوبی لە ساڵی (٥٨٩ک/١١٩٣ز) ئەم دەوڵەتە وەک خۆی بە بەهێزی نەمایەوە، بەڵکو چەند نەوەیەکیان دەسەڵاتیان لە دەوڵەتی ئەیوبی وەرگرت، بە هۆی خەریکبوونی مەلیکەکانی ئەیوبی بەکاروباری سەربازی و سیاسییەوە زۆرجاران کێشە و شەڕو ئاژاوە کەوتۆتە نێوانیان بە تایبەتی لە قۆناغەکانی کۆتایی دەوڵەتی ئەیوبی، مەلیک (الجواد) یش وەک هەر مەلیکێکی تری ئەیوبی توانی دەسەڵاتی خۆی لە هەریەک لە شارەکانی (دمشق) و (سنجار) و (عانة) بچەسپێنێ، بەڵام بە هۆی لاوازی لە بەڕێوەبردنی ئەم شارانە وایکردووە کە خەڵکی نارەزابێت لە بەرامبەر بە حکومڕانیی ئەو، هەروەها بە هۆی لاوازی لە بواری سیاسی وای کردووە زۆر بەخێرایی دەسەڵاتی ئەو شارانە لە دەست بدات، جگە لەوەش خۆشەویستی بۆ پارە و سەروەت و سامان خاڵێکی لاوازی تری ئەم مەلیکە ئەیوبییە بووە،

توێژینەوەكەمان لە بابەتی ڕۆڵی سیاسی و سەربازی مەلیک (الجواد) ی كوڕی (ممدود شمس الدین) ی كوڕی مەلیک (العادل) ی كوڕی (نجم الدین) ئەیوبی لە دەوڵەتی ئەیوبیدا (٦٣٥ک/١٢٣٧ز-٦٤١ک/١٢٤٣ز) بابەتێكی گرنگ و پڕبایەخە، چونكە توێژەران كەمتر باسی ڕۆڵی ئەم میرە ئەیوبییەیان كردووە، هەروەها توێژینەوەی سەربەخۆیان لەم بارەیەوە ئەنجام نەداوە ئەمەش پاڵنەرێكی سەرەكی بووە بۆ ئەوەی ئەم بابەتە هەڵبژێرین و لێكۆڵینەوەی لە بارەیەوە ئەنجام بدەین. ئێمە لەم توێژینەوەیەدا هەوڵی ئەوەمان داوە بە شێوەیەكی زانستی بە پشتبەستن بە سەرچاوە زانستییەكان، هەروەها زانیارییە مێژووییەكان بخەینە بەر تیشكی شیكردنەوە و لێكدانەوەی زانستییانە، جگە لەوەش بەراودكردنی سەرچاوە مێژووییەكان لە چەندین شوێندا ئاماژەمان پێداوە.

ئەم توێژینەوەیە لە پێشەكییەک و سێ تەوەرە پێكهاتووە لە تەوەرەی یەكەم بە شێوەیەكی باش توانیومانە تیشک بخەینە سەر ڕەچەڵەكی مەلیک (الجواد) كە دەگەڕێتەوە بۆ بنەماڵەی ئەیوبی، وەک دەزانین بنەماڵەی ئەیوبی لە هۆزی ڕەوادی كوردین ئەم بابەتە لە چەندین توێژینەوە ئاماژەی پێكراوە و ڕوونكراوەتەوە بۆیە ئێمە نامانەوێ بچینەوە سەر ئەم بابەتە، هەروەها هەر لەم تەوەرەیە ئاماژە بە خێزان و منداڵی مەلیک (الجواد) كراوە، هەروەها خەسڵەتەكانی ئەم مەلیكە باسكراوە. تەوەرەی دووەم باسی هەوڵەكانی مەلیک (الجواد) بۆ گەیشتن بە دەسەڵات دەكەین، تەوەرەكە بەشێوەیەكی باش ئاماژەمان كردووە بە هەوڵەكانی ئەم مەلیكە بۆگەیشتن بەدەسەڵات بە تایبەتی دوای مردنی مەلیک (الكامل)ی مامی. لە تەوەرەی سێیەم باسی پەیوەندییەكانی مەلیک (الجواد) دەكەین پاش گەیشتن بە دەسەڵات، لەم تەوەرەیەدا ئاماژە بەوە كراوە كە توانی دەسەڵاتی سیاسیی سەربەخۆی خۆی لەسەر چەند شارێک بە دەست بهێنێ . جگە لەوەش هەر لەم تەوەرەیە ئاماژەمان كردووە بە پەیوەندییەكانی مەلیک (الجواد) بە مەلیكەكان و دەسەڵاتدارەكانی دەرەوەی بنەماڵەی ئەیوبی لە كۆتاییدا ئەنجام و لیستی سەرچاوەكان و پاشكۆیەک و پوختەی توێژینەوەكە بە زمانی عەرەبی و ئینگلیزی خراوەتە ڕوو.

## تەوەرەی یەکەم

### ناو و ڕەچەڵەکی و خێزان و منداڵەکانی و خەسڵەتەکانی مەلیک (الجواد)

### یەکەم/ ناوی تەواوی

مەلیک (الجواد) ناوی تەواوی مەلیک (الجواد یونس مظفرالدین) ی کوڕی (شمس الدین ممدود) ی کوڕی مەلیک (العادل) ی کوڕی (نجم الدین) ئەیوب.

### دووەم/ ڕەچەڵەکی:

وەک دەزانین ڕەچەڵەکی ئەیوبییەکان دەگەڕێتەوە بۆ هـۆزی ڕەوادی کـوردی . (ابن الاثیر،١٩٩٧، ٣٤٢/٩) ڕەچەڵەکی مەلیک (الجـواد) یـش دەگەڕێـتەوە بـۆ بنەمـاڵەی ئەیوبی ، سـەرچاوەکان هـیچ زانیـارییەک سـەبارەت بە سـاڵ و شـوێنی لەدایکبـوونی مەلیـک (الجـواد) ئامـاژە پـێ نەداوە، سـەبارەت بە بـاپیری کە مەلیـک (العـادل) ی ئەیوبییە کە دەکاتە برای سەلاحەددینی ئەیوبی مەلیک (العـادل) خـاوەنی (١٧) کـوڕ بووە (ابن العماد، ١٩٨٦، ١١٧/٧)، شایانی باسە (شمس الدین ممـدود) کە دەکـاتە بـاوکی مەلیک (الجواد) کـوڕی گەورەی مەلیـک (العـادل ) بـووە (ابـن کثیـر، ١٩٩٧، ٢٧٠/١٧) هەروەها هێشتا مەليك (العادل) لە ژیاندا بووە باوکی مەلیک (الجواد) کـۆچی دوایـی دەکات (النویری،٢٠٠٤، ٥٤/٢٩- ٥٥؛ الصفدی ٢٠٠٠، ١٦٩/٢).

ئەگەر تەماشای ژیـانی سـەرەتایی مەلیـک (الجـواد) بکەیـن لەگەڵ هەنـدێ لە مامەکانی گەورە بـووە کە بەشـێکی زۆریـان مەلیکـی دەوڵەتـی ئەیـوبی بـوونە، جـگە لەوەش مەلیـک (الکامـل)ی مـامی ئەرکـی پارێزگـاریکردنی گرتـۆتە ئەسـتۆ کەواتە مەلیک (الجواد) سەرەتای دەرکەوتنی وەک سەرکردەیەک لەلای مـامی (الکامـل)ی بووە لە وڵاتی (مصر) (ابن واصل،١٩٧٢، ٤/ ٢٢٦) شایانی باسە سەرچاوەکان ئاماژەیان بـە هیچ زانیارییەك نەداوە سەبارەت بە ساڵی کۆچی باوکی.

### سێیەم/ خێزان و منداڵەکانی:

دایکیشـی لە خاچییەکـان بـووە (النـویری، ٢٠٠٤، ١٦١/٢٩) سـەبارەت بە ژنهێنـانی کچی مەلیـک (الاشرف)ی مـامی هێنـاوە بە نـاوی (ملکـة) خـاتون (ابـن واصـل،١٩٧٢، ٢٠٣/٥؛ توفیـق،٢٠١٥،ل١٣٨) لە باسـەکانی پەیوەنـدیی مەلیـک (الجـواد) بە مەلیـک

(الاشرف )ی مامی بە شێوەیەکی تەواوەتی باسی ئەم ژنخوازیەی دەکەین سەبارەت بە منداڵی سەرچاوەکان تەنها ئاماژە بە کچەکەی دەکەن بەناوی (نسب) خاتوون کە ناوبانگی بەخێر و چاکە دەرکردووە لە شاری (دیمشق) لە ساڵی (٦٩٧ک/١٢٩٧ز) کۆچی دوایی دەکات لە نزیک باوکی لە شوێنێک بەناوی (القاسیون) دەنێژرێت (العینی،١٩٨٧، ٣٨١/٣)

**چوارەم/ خەسڵەتەکانی:**

مەلیک (الجواد) وەک هەندێ لە مرۆڤەکان کۆمەڵێ خەسڵەتی باش و خراپی لە یەک کاتدا تێدا کۆبۆتەوە، بۆ نموونە دەست بڵاو بووە و خۆشەویستی بۆ پیاوچاکان هەبووە ، زوڵم و زۆرداریشی کردووە (الذهبي، ١٩٨٥، ١٨٤/٢٣) لەچوارچێوەی ئەو زوڵم و زۆرداریەی کە کردوویەتی وای لێکردووە خەڵکی بەگشتی خۆشیان نەوێ و ڕق و قینیان بەرامبەر هەبێ قسەی نەشیاویان بەرانبەر کردووە. (ابن کثیر ،١٩٩٧ ، ٢٧١/١٧) هەروەها سوارچاک و ئازا و چاونەترس بووە (ابن واصل،١٩٥٧، ٣ /٢٧٤) میژوونووس (ابن العماد الحنبلي) دەڵێ ڕاستە کەسێکی سوار چاک بووە، بەڵام نەشیاوە بۆ مەلیکایەتی و حوکمکردن، کەسێکی لاواز بووە لە بەڕێوەبردن و ئەزموونی کەم بووە لە حوکمڕانیکردن و ئارەزووی مەلیکایەتی نەکردووە (ابن العماد الحنبلي، ١٩٨٦، ٣٦٨/٧؛ فلح،٢٠١٣،ص١٤).

هەروەها کەسێکی چاکەکار و هەژارانی خۆش ویستووە (الصفدی،٢٠٠٠، ١٨٧/٢٩) هەروەها هەندێ لە سەرچاوەکانی تر ئاماژە بەوە دەکەن کە زۆر حەزی بە ڕاوکردن بووە جگە لەوەش باس لەوە دەکەن کە خۆشەویستی بۆ ئاژەڵی ڕاوکردنی وەک باز و سەگی ڕاو زیاتر بووە لە مەلیکایەتی (الزرکلي، ١٩٧٦،٨/٢٦٤؛ حیاوي، ٢٠٠٤،ص٤٩) هەروەها حەزی لە خۆشی و ڕابواردن بووە (العرینی،١٩٦٧،ص١٣٥) لە دواتردا باسی ئەوە دەکەین بەهۆی ئارەزووی زۆری ڕاوکردنەوە دەچێتە دەرەوەی شاری (سنجار) (بدرالدین لؤلؤ) ش حاکمی (موصل) بە هەلی دەزانێ دەست بەسەر شارەکەدا دەگرێ (الذهبی ،١٩٩٣م،١٤/٢٢)

### تەوەرەی دووەم

### هەوڵەکانی مەلیک (الجواد) بۆ گەیشتن بە دەسەڵات

### یەکەم/ پەیوەندیی مەلیک (الجواد) لەگەڵ مەلیک (الکامل)ی مامی

کاتێک (شمس الدین ممدود) کە دەکاتە باوکی مەلیک (الجواد) کۆچی دوایی دەکات مەلیک (الکامل) (الجواد)ی برازای دەباتە خزمەتی خۆی و لە لای خۆی دەیهێڵێتەوە هەروەها ناوچەی (البحیرة)ی لە وڵاتی (مصر) دەداتێ تاکو بەڕێوەی ببات (ابن واصل،١٩٧٢، ٢٢٦/٤) ئەمەش بووە هۆی ئەوەی ببێتە یەکێک لە ئەمیرەکانی مەلیک (الکامل)ی مامی (ابن العماد الحنبلي، ١٩٨٦، ٣٦٨/٧) مەلیک (الجواد) لە ساڵی (٦٢٠ک/١٢٢٣ز) لە وڵاتی (مصر) لە لای مەلیک (الکامل) دەچێتە حەجکردن لەگەڵ مەلیک (الفائز)ی مامی (المقریزی ١٩٩٧، ٣٣٥/١).

لە ساڵی (٦٢٢ک/ ١٢٢٥ز) مەلیک (الجواد) لەڕێگای دەریاوە ڕادەکات بۆلای مەلیک (المعظم)ی مامی لە (دیمشق) (ابن نظیف الحموي، د.ت، ص١١٣) مەلیک (معظم)ی مامی پێشوازییەکی گەرمی لێ دەکات و زۆر بەباشی لەگەڵی دەجووڵێتەوە (الذهبی١٩٩٣، ٤٠٠/١٤) هۆکاری بەجێهێشتنی مامی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی مەلیک (الکامل) ی مامی بەشێوەیەک بیری دەکردەوە کە هەندێ لە ئەمیرەکانی مەیلیان بەلای براکەی مەلیک (المعظم) دا هەیە بۆیە ژمارەیەکی لێ گرتن و کردنیە بەندیخانەوە ڕێگاشی لە هەندێکیان گرت کە بگەن بە براکەی (ابن نظیف الحموی، د.ت، ص١١٣) لە ساڵی (٦٢٤ک/١٢٢٦ز) مەلیک (الجواد) دەگەڕێتەوە بۆ لای مەلیک (الکامل)ی مامی لە (مصر) ئەمەش پاش ئەوەی هەردوو مامەکەی ڕازی بوون بە گەڕانەوەی، بەڵام ئەم ڕووداوە بووە هۆی ئەوەی پلە و پایەی لاواز بکات (ابن نظیف الحموی، د.ت، ص١٣٥) سەرچاوەکان ئاماژە بەوە دەکەن کە مەليك (الجواد) وەك سەرکردەیەك لەگەڵ مامی بەشداری چەندین شەڕی کردووە ئەوەتا لە ساڵی (٦٢٧ک/١٢٢٩ز) لە پاڵ مەلیک (الکامل)ی مامی بەشداری لە هاوپەیمانیەتی ئەیوبییەکان کردووە کاتێک هەموویان یەکیان گرت بۆ هێرشکردنە سەر خەوارزمییەکان کاتێک شاری (خلاط)یان داگیر کردبوو، هەروەها مەلیک (الاشرف)ی مامیشی بەشداربووە توانییان سەرکەون و شارەکەیان لێ وەرگرنەوە بۆ

زیاتر زانیاری دەربارەی ئەم شەڕە تەماشای (سبط ابن الجوزی ،٢٠١٣، ٢٢/ ٣٠٣-٣٠٥ ) بکە.

مەلیک (الكامل) لە ساڵی (٦٢٩ک/١٢٣١ز) توانی دەسەڵاتی خۆی بەسەر ناوچەکانی ڕۆژهەڵاتی دەوڵەتی ئەیوبی بسەپێنێ کە خۆی دەبینییەوە لە شارەکانی (آمد) و(حران) و ( سنجار) و (راس العين) و (الرها) و (سروج) و (الرقة) (إبن واصل، ١٩٧٢ ،١٢٣/٥) مەلیک (الكامل) هەڵدەستی بە دانانی مەلیک (الجواد) بە بەڕێوەبەری شاری (الرقة) ئەویش زۆر بە خراپی و زۆرداری شارەکەی بەڕێوە بردووە، هەروەها زوڵمێکی زۆری لە خەڵکی شارەکە کردووە بۆیە دادوەری شارەکە کە ناوی (القاضي شهاب الدين) بوو دەچێتە لای مەلیک (الكامل) لە (الرحبة) ئەویش پێشوازییەکی گەرمی لێدەکات، دادوەر (القاضي شهاب الدين) سکاڵای خۆی لەلا دەکات، باسی ئەوە دەکات کە مەلیک (الجواد) زۆر بە خراپی شارەکە بەڕێوە دەبات و زوڵم و زۆرداری لە خەڵکی دەکات، هەروەها باسی ئەوەی بۆ کرد کە تەنها ٥٠٠ کەس لە شارەکە ماونەتەوە بەهۆی مەلیک (الجواد)ەوە، جگە لەوەش داوای لێکرد تاکو نووسراوێ بکات بۆ گەڕانەوەی خەڵکی شارەکە بۆ سەر ماڵ و موڵکی خۆیان کە شارەکەیان بە جێهێشتبوو ( ابن نظيف الحموى ، د.ت، ص ٢٤٤).

باسی مەلیک ( الجواد) لەسەر شانۆی ڕووداوەکان نامێنێ تاکو ساڵی (٦٣٥ک/١٢٣٧ز) دیارە هەر لە خزمەتی مامی (الكامل)دا بووە لە وڵاتی (مصر)، هەر لەو ساڵەدا مەلیک (الاشرف)ی مامی کۆچی دوایی دەکات لە (دیمشق) ئەویش لەگەڵ (الكامل)ی مامی بەڕێ دەکەون بۆ (دیمشق) بۆ ئەوەی بچنە شارەکەوە دەست بەسەر شارەکەدا بگرن، چونکە هەتاکو ئەوکات مەلیک (الاشرف)ی مامی کە خاوەنی شارەکە بووە، بەڵام پێش مەلیک (الكامل) برایەکی تری بەناوی (الصالح اسماعيل) دەستی بەسەر شارەکەدا گرتبوو ئەوانیش هەڵسان بە گەمارۆدانی شارەکە و بەمەبەستی گرتنی دواجار (الصالح اسماعيل) بەناچاری بەهۆی ئەو گەمارۆدانە (دیمشق) بەجێ دەهێڵێ ڕوو دەکاتە (بعلبک)، مەلیک (الكامل) بەهاوەڵی مەلیک (الجواد) دەچنە شارەکەو دەستی بەسەردا دەگرن (الذهبی، د.ت ، ٢٢٢/٣) بەڵام، هەر لەساڵی (٦٣٥ک/١٢٣٧ز) مەلیک (الكامل) لە دیمشق کۆچی دوایی دەکات

(المنصوری، ١٩٩٣،ص٧) ئەمەش تەنها پاش دوو مانگ لە حکومکردنی شارەکە نەخۆش دەکەوێ و کۆچی دوایی دەکات و مەلیک (الجواد) جێگای دەگرێتەوە (الذهبی،د.ت ،٢٢٢/٣؛ شەرەفخانی بدلیسی، ٢٠٠٦،ل١٢٢).

**دووەم/ پەیوەندیی مەلیک (الجواد) لەگەڵ مەلیک (الاشرف) ی مامی:**

مەلیک (الجواد) ی کوڕی (ممدود) ی کوڕی مەلیک (العادل) هەوڵی ئەوەی دا لەدوای مردنی مەلیک (الکامل) لە ساڵی (٦٣٥ک/١٢٣٧ز) دەست بەسەر (دمشق) دا بگری، هەرچەندە لە سەرەتادا وەک جێگری مەلیک (العادل) ی کوڕی مەلیک (الکامل) حوکمی کردووە لە (دمشق)، بەڵام دواتر دەست دەگرێ بەسەر کۆگاکانی ئەو شارە و پارە و پوول دابەش دەکات بەسەر خەڵکی شارەکە، هەروەها دەسەڵاتی ئەمیر و سەربازەکانی کەم کردەوە لەم پێودانگەدا ئامانجی بووە سەربەخۆیی دەسەڵاتەکەی بە دەست بێنێ (إبن واصل، ١٩٧٢ ،١٩١/٥-١٩٢) لە وتاری ڕۆژی هەینیدا ناوی لەپاڵ ناوی مەلیک (العادل) دا بردووە (إبن واصل، ١٩٧٢ ،٥ /١٩٥ ؛ منذر الحایک، ٢٠١١، ص٢٣٤).

دیارە پەیوەندیی مەلیک (الجواد) لەگەڵ مامی (الاشرف) زیاتر لە ڕێگای ژنخوازی سیاسی بوو دوای ئەوەی هەستا بەخواستنی کچی مەلیک (الاشرف) ی مامی دوای مردنی بۆ ئەوەی دەسەڵاتی سیاسی و ئابووریی خۆی بەهێز بکات (إبن واصل،١٩٧٢ ،٥ /١٤٥) مەلیک (الاشرف) هیچ کوڕێکی نەبووە تەنها ئەم کچەی لەدوای خۆی بەجێهێشت (ابو الفداء، د.ت ،١٦٠/٣ ؛إبن الوردی، ١٩٩٦، ١٦١/٢) ئەم کچەی خاوەن سەروەت و سامانێکی زۆر بووە، بە بەڵگەی ئەوەی باوکی پێش مردنی وەسیەتی کردبوو هەموو سەروەت و سامانی لە گەوهەر و (دار السعادة)، ئەم (دارالسعادة) پێدەچێت کۆشکێکی گەورە و بەناوبانگ بووبێت لە (دمشق) بە بەڵگەی ئەوەی لە سەرچاوە مێژووییەکاندا زۆر ناوی هاتووە. زۆر جار شوێنی کۆبوونەوەی ئەمیر و کاربەدەستەکانی وڵات بووە، بدرێت بە کچەکەی (الیونینی، ١٩٩٢ ،٨/٤) جگە لەوانەش (بستان النیرب)ی پێبدرێ (الحنبلي،١٩٨٧، ص٣٦١؛ الطائی،٢٠٠٩، ص٥٤) کە زەوییەکی کشتوکاڵییە لە گوندێکی بەناوبانگی سەر بە

(دمشق) (الحموي،١٩٩٥، ٣٣٠/٥) لەدواتردا مەلیک (صالح اسماعیل) ی کوڕی مەلیک (العادل) دەست دەگرێ بەسەر (دمشق) دا لە ساڵی (٦٣٧ک/١٢٣٩ز) دا بۆ جاری دووەم. مەلیک (الجواد) یش لەم ساڵەدا لە (ملكة) خاتون جیا دەبێتەوە و هەرچەند داوایان لێکرد کە کاری وا نەکات بەڵام کردی (إبن واصل، ١٩٧٢، ٥ /١٤٥؛ الذهبی، ١٩٩٣م،١٤/ ١٩٥).

دواتر مەلیک (صالح اسماعیل)ی مامی بۆ کوڕەکەی مەلیک (المنصور) خواستی (الذهبی، ١٩٨٥، ١٢٦/٢٣) ئەم (مەلیک المنصور )ە ناوی تەواوی (محمد) ی کوڕی (اسماعیل) ی کوڕی (ابی بکر) ی کوڕی (ایوب) ە، لە ساڵی (٦٨٨ک/١٢٨٩ز) کۆچی دوایی کردووە (الحنبلي، ١٩٨٧، ص٣٨ ؛ الزبیدي، ١٩٨٣، ص ٨١) ، (ملكة) خاتونیش لە ساڵی (٦٩٤ک/١٢٩٤ز) کۆچی دوایی دەکات. (إبن الجزری، ١٩٩٨م، ص٢٧٢ ؛ الذهبی، ١٩٩٣، ٧٨٧/١٥).

**سێیەم/ پەیوەندیی مەلیک (الجواد) لەگەڵ مەلیک (الناصر داود) کوڕی (المعظم) ی ئامۆزای**

پێش مردنی مەلیک (الكامل) لە ساڵی (٦٣٥ک/١٢٣٧ز) کە کوڕە بچووکەکەی کە ناوی مەلیک (العادل) کردبووە جێنشینی خۆی کە ئەوکات لە وڵاتی (مصر) حکومڕانی دەکرد، کوڕە گەورەکەشی کە ناوی (الصالح نجم الدین ) لە ناوچەی (الجزیرة) حکومڕانی دەکرد ( المقریزی،١٤١٨ هـ ،٤١١/٣-٤١٢؛ ابن تغری بردی، مورد اللطافة ،د.ت،١٥/٢).

پاش مردنی مەلیک (الكامل) ئەمیرەکانی کۆبوونەوە لە شاری (دیمشق) لە نێوانیان (سیف الدین بن قلیج) و (عزالدین ایبک) و (الركن الدین الهیجاوی) و (عمادالدین بن شیخ الشیوخ) و (فخرالدین بن شیخ الشیوخ) ئەو دووانەی کۆتایی برا بوون (سبط ابن الجوزی،٢٠١٣ ،٢٢/ ٣٤٨) هەندێک لەو ئەمیرانە ئەمیری شاری (حلب) بوون دوای هاتنی مەلیک (الكامل) بۆ (دیمشق) پەیوەندییان پێوە کردبوو (ابن واصل،١٩٧٢، ٥/ ١٧١) دەستیان بە ڕاوێژو گفتوگۆکردن کرد بۆ دانانی کەسێ بۆ بەڕێوەبردنی شاری (دیمشق)، لە سەرەتادا نەگەیشتنە دیاریکردنی کەسێک بۆ

بەڕێـوەبردنی شـارەکە، ئەو کـات مەلیـک (النـاصر داود) دوای ئـەوەی پەیوەنـدی بە مەلیک (الکامل) مامی کردبوو لە خانوویەک دەژیا بە ناوی (دار سامة) لە (دیمشق)، یەکێك لە ئەمیرەکانی بەناوی (عزالدین ایبک) ئامۆژگـاری کـردو پێـی وت پێویسـتە بەشـێك لـەو سـەروەت و سـامانەی کە هەتـە دابەشـی بکـەی بەسـەر سـەرکردە و سەربازەکانت کە بـۆ مـاوەیەکی زۆرە پشـتگیریت دەکەن، تـاکو پاڵپشـتیت بـکەن بـۆ دەست بەسەرداگرتنی (دیمشق) کە پێشتر هی باوکت بووە ( سبط ابن الجوزی،٢٠١٣،٢٢/ ٣٤٨).

جارێکی تر ئەمیرەکان کۆبوونەوەیان کرد لە قەڵای (دیمشـق) لە کۆبـوونەوەکە (عمادالدین بن شیخ الشیوخ) زیاتر مەیلـی بەلای مەلیـک (الجـواد) بـوو تـاکو ببێـتە مەلیکـی (دیمشـق)، هۆکـاری ئەم لایەنگریەشـی دەگەڕێـتەوە بـۆ ڕووداوێکـی کـۆن کاتێـك کۆبـوونەوەیەک دەبێـت کـە مەمالیکەکـان لە کـۆڕ و کۆبـوونەوەی مەلیـک (الکامل) دانیشتوون، کە (عمادالدین بن شیخ الشیوخ) بەشدار بووە مەلیـک (النـاصر داود) هەندێ قسە دەکات لە بەرژەوەندیی (عمادالدین بن شیخ الشیوخ) نـابێ زیـانی پێدەگەیەنێ ئەم ڕووداوەی هەر لەدڵیدا دەمینـێ بـۆیە حەز بە مەلیـک (النـاصر داود) ناکات، هەرچەندە براکەی (فخرالدین بن شیخ الشیوخ) مەیلـی زیـاتر بە لای مەلیـک (الناصر داود)، بەڵام (عمادالدین بن شیخ الشیوخ) ئاماژە بە مەلیک (الجواد) دەکـات دواتـر هەمـوویـان لەسـەر دانـانی مەلیـک (الجـواد) بـۆ بەڕێـوەبردنی (دیمشـق) ڕێکـدەکەون، هەروەهـا ئەمیـر (الـرکن الـدین الهیجاوی)یـان نـارد بـۆ لای مەلیـک (الناصر داود) داوایان لێکرد کە پێویستە (دیمشق) بەجێ بهێڵـێ ئەویـش لە کۆتاییـدا لە دەرگای (الفرج)ی شارەکەوە چووە (القابون) ( سبط الجوزی،٢٠١٣ ،٢٢/ ٣٤٨).

مەلیک (الناصر داود) بۆ مـاوەی یەک ڕۆژ لە (القـابون) مـایەوە، بەڵام مەلیـک (الجـواد) هەوڵـی ئەوەی دابـوو کە دەسـتگیری بکـات بـۆیە بە ناچـاری ڕوودەکـاتە شوێنێک بەناوی (قصر ام حکیم) هەوڵەکان چڕ دەکـرێنەوە بـۆ دەسـتگیر کردنـی بە تـــایبەتی لەلایەن مەمالیکەکـــانی (الاشرفـــی) ، بەڵام هەمـــوو ئەم هەوڵانە دواجـــار سەرکەوتوو نابن هەروەها مەلیک (الناصر داود) دەگاتە (غزة) (سبط ابن الجـوزی،٢٠١٣ ،٢٢/ ٣٤٨-٣٤٩).

مێژوونووسی دەوڵەتی ئەیوبی (ابن واصل) ڕای جیاوازی هەیە سەبارەت بە دیاریکردنی مەلیک (الجواد) بۆ بەڕێوەبردنی (دیمشق)، مەلیک (الناصر داود) بۆچوونی وابوو کاتێک مامی (الکامل) شاری (دیمشق) دەگرێ دەیدات بەو بەپێی ڕێکەوتنێک لە نێوانیان هەبوو، پاش مردنی مەلیک (الکامل) گەورە میرەکانی دەوڵەت کۆبوونەوە بۆ دیاریکردنی کەسێک بۆ بەڕێوەبردنی (دیمشق) پێیان وابوو ئەو کەسە دەبێت لە بنەماڵەی مەلیک بێت و شارەکە بپارێزێ، هەروەها وتیان ئەگەر مەلیک (الناصر داود) بکەین بە دەسەڵاتداری شارەکە ئەوا دەست بەسەر شارەکەدا دەگرێ بەوپێیەی دەڵێ شارەکە هی باوکم بووە، بۆیە مەلیک (الجواد) یان دەستنیشان کرد و کردیان بە نوێنەری مەلیک (العادل) بۆ بەڕێوەبردنی (دیمشق) (ابن واصل، ١٩٧٢ ،٥ /١٧٢) ئێمە زیاتر لەگەڵ بیر و بۆچوونی مێژوونووس (سبط ابن الجوزی) لەسەر دیاریکردنی مەلیک (الجواد) بۆ بەڕێوەبردنی (دیمشق) چونکە ئەو زیاتر لە ڕووداوەکەوە نزیکە هەروەها بە شێوازی وردتر ڕووداوەکەی باس کردووە.

دوای دیاریکردنی مەلیک (الجواد) بۆ بەڕێوەبردنی شارەکە هەر لە ساڵی (٦٣٥ک/١٢٣٧ز) دەستی بەسەر کۆگاکانی شارەکەدا گرت و سەروەت و سامانەکەی دەرهێنا کە خۆی دەبینییەوە لە (شەش هەزار هەزار) دینار، هەروەها (پێنج هەزار) لە پارچە جلوبەرگ، ئەم سەروەت و سامانە زۆرە دەرفەتێکی زۆر باشی بۆ ڕەخساند تاکو خۆی و سوپاکەی پێ بەهێز بکات، بەڵام بەشێکی زۆری ئەم سەروەت و سامانەی لە قومار و مەی خواردنەوە و شتی بێ کەڵک بە فیڕۆدا و دابەشی کرد (سبط ابن الجوزی،٢٠١٣ ،٢٢/ ٣٤٨).

مەلیک (الجواد) لەبەر ئەوەی نوێنەری مەلیک (العادل)ی ئامۆزای بوو لە شارەکە، بەڵام لەڕاستیدا دەسەڵاتی تەواوەتی لەژێر دەستی خۆی بوو هەر بە ڕووکەش نوێنەری مەلیک (العادل) بوو هەرچەندە بەشێک لە سوپاکەی لە (دیمشق) دەگەڕێنەوە بۆ لای مەلیک (العادل) لە (مصر)، بەڵام هەندێ ئەمیری بەهێزی هەر لەلا مایەوە بۆ پاراستنی شارەکە لەوانە (عمادالدین بن شیخ الشیوخ) و (عمادالدین بن قلج) بەشێک لە سوپای (مصر) و لەگەڵ هەندێ لە مەمالیکەکانی (الاشرفي) کە زۆر بەهێز بوون لەوانە (عزالدین ایبک الاسمر الاشرفی)(ابن واصل ،١٩٧٢، ٥ /١٧٣) دوای

ئەوەی مەلیک (الناصر داود) گەیشتە (غزة) بەهاوکاری ئەمیر (مجدالدین عمر) – کە دەکاتە برای (الفقیە عیسی الهکاري)- دەستی گرت بەسەر تەواوی کەنارەکانی (الشام)(النویري ،٢٠٠٤، ١٥٠/٢٩).

هەوڵەکانی دەست پێکرد بۆ ئەوەی موڵکەکانی باوکی مەلیک (المعظم) بەدەست بهێنێتەوە بۆیە دەستی کرد بەکۆکردنەوەی سەربازەکانی، کاتێک مەلیک (الجواد) بەمەی زانی هەستی کرد دەسەڵاتی لە (دیمشق) لە مەترسیدایە چونکە وەکو باسمان کرد (دیمشق) یش پێشتر موڵکی باوکی بووە، بۆیە ڕاستەوخۆ سوپاکەی جووڵاند بە ئاراستەی مەلیک (الناصر داود) تاکو شەڕی لەگەڵدا بکات تەواوی سوپاکەی کە پێکهاتبوو لە سوپای (مصر) بەسەرکردایەتی ئەمیر (عمادالدین بن شیخ الشیوخ) و سوپای (دیمشق) و مەمالیکەکانی (الاشرفي)، مەلیک (الناصر داود) کاتێک ئەمەی بیست ئەویش بەخۆی و سوپاکەیەوە ڕووی کردە مەلیک (الجواد) هەردوو سوپاکە بەیەک گەیشتن لە شوێنێک بەناوی (ظهرحمار) کە دەکەوێتە نێوان (نابلس) و (جنین) (ابن واصل ،١٩٧٢، ١٩٢/٥) شەڕێکی گەورە لە نێوانیان ڕوویدا مەلیک (الجواد) بەهۆی سوپاکەی سەرکەوتنێکی گەورەی بەدەست هێنا، هەروەها دەستی گرت بەسەر تەواوی سەروەت و سامان و کەلوپەلەکانی مەلیک (الناصر داود) تەنانەت دەستی گرت بەسەر ئەسپ و خێوەتەکەی و کەلوپەلە گرانبەهاکانیشی (النویري، ٢٠٠٤، ١٤٩/٢٩؛ ابن تغری بردی، المنهل الصافي ، د.ت،٢٩٧/٥).

بەجۆرێ کەلوپەلەکانی لە ٧٠٠ حوشتر بارکرد بۆ ئەوەی بیگەڕێنێتەوە بۆ (دیمشق)، هەروەها دەستی بەسەر زێڕو گەوهەرێکی یەکجار زۆردا گرت کە بەژمارە نەدەهات بەهۆی ئەم شەڕەوە زۆر دەوڵەمەند بوو مێژوونووسان بە جۆرێ باسی دەوڵەمەندبوونەکەی دەکەن دەڵێن تاهەتایە دەوڵەمەند بوو، مەلیک (الناصر داود) بەجۆرێ هەژار بوو کە بووە بە هەژارترین مەلیک، (عمادالدین بن شیخ الشیوخ) دەستی بەسەر توورەگەیەکی بچووکدا گرت کە (١٢) پارچە گەوهەری زۆر گرانبەهای تێدا بوو لە لە کڕیندا نە دەهات مەلیک (الجواد) داوای لێکرد ئەویش پێیدا (الیونیني،١٩٩٢، ١٣٩/١) ئەم سەروەت و سامانەی مەلیک (الناصر داود) دەگەڕێتەوە بۆ خوشکەکەی (دار المرشد) کاتێک باوکی ئەم سەروەت و سامانەی

بــۆ ئامــادە کردبــوو بــۆ ئەوەی شــوو بکــات بە (جــلال الــدین خــوارزم ) شــای خەوارزمییەکـان مەلیـک (النـاصر داود)یـش دەسـتی بەسـەردا گرتبـوو بـۆئەوەی بـۆ بەرژەوەندیی خۆی بەکاری بهێنێ (سبط ابن الجوزی،٢٠١٣، ٢٢/ ٣٤٩) مەلیـک (الجـواد) چـووە شـاری (نـابلس) لە مـاڵی مـامی (المعظـم) دابەزی ئەوەی تێـدا بـوو دەسـتی بەسەردا گـرت، هەروەهـا والـی دانـا بـۆ بەڕێـوەبردنی شـاری (نـابلس) و (القـدس) و شوێنەکانی تر (الیونینی، ١٩٩٢، ١٣٩/١).

مەلیک (الجواد) بەهۆی ئەم شەڕەوە زۆر بەهێـز بـوو (العمـری،١٤٢٣هــ، ٣٠٩/٢٧؛ إبــن ســبط، ١٩٩٣، ص٣١٦؛ طقــوش،٢٠٠٨، ص٣٥٤) مەلیــک (النــاصر داود) لەدوای شکستەکەی بەناچاری و بەبێ سـەروەت و سـامانەکەی لەگەڵ پاشـماوەی سـوپاکەی ڕووی کردەوە (الکرک) لەوێ مایەوە (ابـن تغـری بـردی، النجـوم الزاهـرة ،٣٠٦/٦) مەلیـک (الجواد) دوای ئەوەی دەستی کرد بە ڕێکخستنەوەی کاروباری (القدس) ئامۆزاکەی (العادل) هەواڵی سەرکەوتنەکەی پێگەیشت، بەڵام پێی سەرسام نەبـوو (الیـونینی، ١٩٩٢ ،١٣٩/١) چونکە لەوە دەترسا کە دەسەڵاتی فـراوان بێـت و دەسـت بەسـەر نـاوچەکەدا بگرێ بۆیە دوای لێکرد کە بە خێرایی بگەڕێتەوە بـۆ (دیمشـق) جـگە لەوەش فرمـانی پێکرد هەموو ئەو ناوچانەی دەستی بەسەرداگرتووە بیگەڕێنێتەوە بـۆ مەلیـک (النـاصر داود) (الذهبی ،١٩٩٣م،١٤/٤٠٠؛ الهسنیانی،٢٠٠٧/ص٦٥ ).

مەلیــک(الجواد)یش نــاوچەکەی بەجێهێشــت و گەڕایەوە بــۆ (دیمشــق) لەو ڕۆژی گەڕانەوەی شار زۆر بەجوانی بۆ هاتنەوەی ڕازاندرایەوە کە هەرگیز بەو شـێوەیە نەبینرابـوو، بەهـۆی ئەم سـەرکەوتنەی تـاکو ڕادەیەکـی زۆر سـەربەخۆیی دەسـەڵاتی پەیداکرد تەنها لە وتاری ڕۆژی هەینی ناوی مەلیک (العادل) لە پـێش نـاوی خـۆیەوە هاتووە، شاعیران هۆنراوەیان بەسەردا وتووە بۆ نموونە بەهـۆی سـەرکەوتنی لە شـەڕی (ظهر حمار) شاعیرێک بەناوی (الجمال بن عبد) ئەم هۆنراوەی بەسەردا هەڵداوە:

یا فقیها قد ضل سبیل الرشاد     لیس یغنی الجدال یوم الجلاد

کیف ینجی ظهر الحمار هزیما     من جواد یکر فوق جواد

( الذهبی ،١٩٩٣، ٤٠٠/١٤).

(عمادالدین بن شیخ الشیوخ) کە یەکێک بووە لە سەرکردەکانی مەلیک (الجواد) لە دوای شەڕەکە مەلیک (الجواد) ی بەجێهێشت بەخۆی و سوپاکەی و مەنجەنیقەکانی مەلیک (الناصر داود) کە دەستی بەسەردا گرتبوو چوو بۆ (مصر) (المقریزی، ١٩٩٧، ٣٨٢/١).

**چوارەم/ پەیوەندیی مەلیک (الجواد) لەگەڵ مەلیک (المجاهد)ی ئەیوبیی خاوەنی شاری (حمص) :**

هەر لە ساڵی (٦٣٥ک/١٢٣٧ز) دوای سەرکەوتنی مەلیک (الجواد) بەسەر مەلیک (الناصر داود) مەلیک (المجاهد) خاوەنی شاری (حمص) گەیشتە (دیمشق) لە ماڵەکەی دابەزی کە نزیک مزگەوت بوو، چاوەڕوانی هاتنەوەی مەلیک (الجواد) بوو، وەک پێشتر باسمان کرد شار لە پێشوازی هاتنەوەی مەلیک (الجواد) ڕازێندرابۆوە، کاتێکیش مەلیک (الجواد) گەیشتەوە شار مەلیک (المجاهد) دەرچوو بۆ پێشوازیکردنی، هەروەها لە خزمەتی مایەوە لە (دیمشق) تاکو ساڵی (٦٣٦ک/١٢٣٨ز)( ابن واصل،١٩٧٢، ٥/ ١٩٥-١٩٧).

مەلیک (المجاهد) لە (دیمشق) داوایەک لە مەلیک (الجواد) دەکات ئەویش دەستگیرکردنی کەسێک بوو بەناوی (صفی الدین مرزوق) -کە پێشتر وەزیری مەلیک (الاشرف) ی بووە- هۆکاری داواکاریەکەشی دەگەڕێتەوە بۆ ئەو دوژمنایەتیە زۆرەی کە بۆی هەبووە لەو کاتەی کە وەزیر بووە، مەلیک (الجواد) یش بەهۆی ئەو پەیوەندییە خۆشەی کە هەیبوو لەگەڵ مەلیک (المجاهد) هیچ کات لە داوایەکی لەو شێوەیەی دەرنەچووە بۆیە هەوڵەکانی دەست پێکرد بۆ دەستگیرکردنی (صفی الدین مرزوق) (النویری،٢٠٠٤، ١٥٦/٢٩).

(صفی الدین مرزوق) هەستی بە پیلانەکەی نێوانیان کرد بۆیە تابووتێکی مردووی هێنا و هەرچی لە پارەو پوولی هەبوو لە ناوی داینا و شاردیەوە وای نیشاندا کە کەسێکی خۆشەویستی کۆچی دوایی کردووە دەیەوێ لە ماڵێک کە نزیک قوتابخانەی (النوریة) بوو بینێژێ و بەخاکی بسپێرێ، تابووتەکەی لەسەر ملی خزمەتکار و پیاوەکانی دانا و گواستیەوە بۆ مزگەوت و خەڵکی نوێژی مردوویان

لەسەری کرد و تازیەی بۆ دانا، دواتر (صفی الدین مرزوق) دەستگیر دەکرێ لەلایەن مەلیک (الجواد) وە دەستیش دەگرێ بەسەر هەموو ئەو کەلوپەلانەی کە هەیبوو جگە لە پارەو پوولی ناو تابووتەکە، دواتر بەهۆی شەڕی نێوان خزمەتکارەکانی دەبێتە هۆی ئاشکراکردنی تابووتەکە کاتێک خزمەتکارێکی گەورەی لە یەکێک لەخزمەتکارە بچووکەکانی دەدات ئەویش دەچێتە لای مەلیک (الجواد) لەگەڵی دادەنیشێ هەموو شتێکی دەربارەی تابووتەکە پێ دەڵێت، مەلیک (الجواد)یش دادوەر و شاهێد و ئەمیر (جاندار)و چەند کەسێکی تر دەنێرێ تاکو گۆڕەکە هەڵدەنەوە، دوای کردنەوەی تابووتەکە دەست دەگرن بەسەر ئەو خشڵانەی کە تێیدا بوو کە بەهاکەی بەشێکیان ٢٠٠ هەزار دینار و ئەوانی تریش بەهایان نزیکەی شەست هەزار دینار بووە (النویری،٢٠٠٤، ١٥٦/٢٩) هەندێ لە سەرچاوەی تر باس لە دەست بەسەرداگرتنی چوارسەد هەزار دینار دەکەن (سبط ابن الجوزی، ٢٠١٣، ٢٢/ ٣٥٧) تەنها پێش بە یەک ڕۆژ (صفی الدین مرزوق) سوێندی بەسەری مەلیک (الجواد) خواردبوو کە هیچ پارەیەکی نییە هەر دوای دۆزینەوەی پارەکە (صفی الدین مرزوق)ی ڕادەستی مەلیک (المجاهد) کرد، ئەویش لە قەڵای شاری (حمص) بەندی دەکات کە بۆ ماوەی چەندین ساڵ ڕووناکی نەبینیوە هەندێک دەڵێن بۆماوەی دوانزە ساڵ بەندکراوە تاکو کۆچی دوایی کردووە (النویری،٢٠٠٤، ١٥٦/٢٩)، (ابن کثیر) دەڵێت بۆماوەی سێ ساڵ بەندکراوە هەروەها باسی ئەوە دەکات لە کاتی خۆی (صفی الدین مرزوق) چەندین چاکەی بۆ مەلیک (الجواد) هەبووە (ابن کثیر، ١٩٩٧، ٢٤٢/١٧) هەرچەندە ماوەی حکومڕانی مەلیک (الجواد) لە (دیمشق) زۆر کەم بووە، بەڵام وەکو پێشتر باسمان کرد مەلیک (المجاهد) دێتە لای دەمینێتەوە لە (دیمشق).

**تەوەرەی سێیەم/ پەیوەندییەکانی مەلیک (الجواد) پاش گەیشتن بە دەسەڵات**

**یەکەم/ پەیوەندیی مەلیک (الجواد) لەگەڵ مەلیک (العادل) کوڕی مەلیک (الکامل) ی ئامۆزای:**

وەکو پێشر ئاماژەمان پێدا مەلیک (الجواد) وەک جێگری مەلیک (العادل) لە شاری (دیمشق) حکومڕانی دەکرد (العلیمی، د.ت،٤٠٧/١؛ العصامی، ١٩٩٨، ١٦/٤) مەلیک

(العادل) دەترسا لە فراوانبـوونی دەسـەڵاتی مەلیـک (الجـواد) لە نـاوچەکە بەتـایبەتی دوای سەرکەوتنی بەسەر مەلیـک (النـاصر داود) لە (القـدس) و دەوروبەری (الـذهبی ،١٩٩٣م،١٤/٤٠٠).

هەروەهـا لەپێشـتر باسـی ئەوەمـان کـرد بەشـێکی زۆری ئەو سـوپایەی کە لە (دیمشق) بوون کە لەلای مەلیک (الجواد) بوون گەڕانەوە بۆ (مصر) بەتـایبەتی دوای سـەرکەوتنی بەسـەر مەلیـک (النـاصر داود) لە نێـو ئەوانەدا (عمادالـدین بـن شـیخ الشیوخ) بوو، مەلیـک (الجـواد)یش تـوانی تـاکو ڕادەیەکـی بـاش دەسـەڵاتی خـۆی سەربەخۆ بکات لە شارەکە چـونکە لە پـاڵ نـاوی مەلیـک (العـادل) لە وتـاری ڕۆژی هەینی ناوی مەلیک (الجواد) یش هاتووە کە ئەوکـات وتـاری ڕۆژی هەینـی لەلایەن (شیخ کمال الدین بن طلحة) دەوترایەوە کە زانـایەکی گەورە بـوو (ابـن واصـل،١٩٧٢، ٥/ ١٩٥) بەجۆرێ پـارە و سـەروەت و سـامانی باشـی خەرج کـرد بـۆ ئەوەی دەسـەڵاتی وەک مەلیک بسەپێنێ بەسەر شاری (دیمشق)، هەروەها وتار بێژی شارەکەشی ناچـار کرد کە ناوی لە دوای ناوی مەلیک (العادل) بهێنێ (المقریزی، ١٩٩٧م، ١/٣٨٢).

هەر لە سـاڵی (٦٣٦ک/١٢٣٨ز) مەلیـک (العـادل) هەوڵەکـانی چڕکـردەوە بـۆ لابردنی مەلیک (الجـواد) لەسـەر دەسـەڵات تـاکو بەتەواوەتـی نـاوچەکە بخـاتە ژێـر دەسـەڵاتی خـۆی، بـۆ ئەم مەبەسـتە هەڵسـا بە کۆبـوونەوەیەک لەگەڵ هەر چـوار کوڕەکەی (شیخ الشیوخ) کە (عمادالدین) و (فخرالدین) و (معـین الـدین) و (کـمال الدین) بوون پێی وتن ((ئێوە بوون کە مەلیک(الجواد)تان کردە مەلیکی (دیمشـق) لە کاتێکدا باوکی من مەلیك ( الکامل) توانیبووی بیگرێ هەتاکو مردیش هەرئـەو شـارە بەشـێک بـووە لە موڵکەکـانی بـاوکم، ئێـوە بـوون شـارەکەتان بە پـارەو پـوولی نـاو کۆگاکـانەوە ڕادەسـتی ئەو کـرد ئەویـش دەسـتی بەسـەر شـار و کۆگاکـانەوە گـرت، هەروەها ئەوە بزانن دەرهێنان و گەڕانەوەی شارەکە لە ژێـر دەسـتی (الجـواد) دەبێـت ئێوە بیکەن)) (ابن واصل،١٩٧٢، ٥/ ١٩٨-١٩٩).

کاتێک ئەمیر (عمادالدین ابن شیخ الشیوخ) مەلیک (الجـواد) ی بەجێهێشـت و گەڕایەوە بۆ (مصر) لە لایەن مەلیک (العادل) سەرزەنشت کرا بەوەی شـارەکەی بـۆ مەلیک (الجواد) بەجێهێشتووە دەستی بەسەر تەواوی کۆگاکـانی شـارەکەوە گرتـووە،

هەروەهـا پێـی ڕاگەیانـد کە دەبێـت بگەڕێـتەوە (دیمشـق) و مەلیـک (الجـواد) لە مەلیکـایەتی شـارەکە لابەرێ ئەویـش ئامـادەیی خـۆی نیشـاندا کە بگەڕێـتەوە بـۆ (دیمشق) بۆ ئەوەی مەلیک (الجواد) ڕازی بکات واز لە (دیمشق) بهێنـێ، بڕیاریانـدا کە هەندێ جێگای تری بدەنێ لە وڵاتی (مصر) وەک (اسکندرية) و چەند شوێنێکی تر، بەڵام لێرەدا (فخرالدين)ی برای دێتە وەڵام، پێی دەڵـێ کە نەچێـت بـۆ (دیمشـق) هەروەها دەڵێـت مـن لە مەلیـک (الجـواد) دەترسـم. (عمادالـدين) وەڵامـی دەداتەوە دەڵێ لە کاتی خۆی من پاڵپشتیم کردو کردم بە مەلیکی (دیمشق) لە قسەم دەرنـاچێ، براکەی دووبارە پێیدەڵێتەوە کە کـاتی خـۆی تـۆ لەگەڵـی بـووی ئەو ئەمیـر بـوو بەڵام ئێستا کە دەچیـتە لای ئەو مەلیـک و سـوڵتانە، پێشـی دەڵێـی کە شـارەکەی ڕادەسـت بکات بەرامبەر بەوە ئێوە شاری (اسکندرية) ی بدەنێ، هەروەها دەڵێت چۆن دەکرێ ئێوە داوایەکی ئەوهای لێبکەن کە واز لە مەلیکایەتی بهێنێ، هەروەهـا پێشـنیازی ئەوە بـۆ (عمادالـدين) بـرای دەکـات دەڵـێ ئەگەر هەر ئەو کـارە دەکەیـت سـەرەتا بـڕۆ بۆ (الطبرية) لەوێ نامەیەکی بۆ بنووسە کاتێک مەلیک (الجواد) وەڵامی دایەوە تـۆش وەڵامەکەی هەڵبسەنگێنە پاشان بۆ مەلیک (العادل) بنووسـە کە ئایـا بە پێشـنیازەکەیان ڕازییە یاخود نا بەڵام، (عمادالدين) گوێی بە پێشنیازەکانی براکەی نەدا و ڕووی کردە (دیمشق) (النويری،٢٠٠٤، ١٥٦/٢٩؛ الذهبی، ١٩٩٣م،١٩/١٤) (عمادالدين) گەیشتە شـارەکە وەک نوێنەری مەلیک (العادل) مەلیک (الجواد)یش پێشوازییەکی گەرمـی لێکـرد و بردیە قەڵای شارەکە و هەندێ لە ماڵ و قوماش و ئەسپی پێداو ئەویش دابەشی کـردە سـەر هاوڕێکـانی. هـاتنی (عمادالـدين) هاوکـات بـووە لەگەڵ ئامـادەبوونی مەلیـک (المجاهد) خاوەنی (حمص) گە پێشتر ئاماژەمان پێدا(النويری،٢٠٠٤، ١٥٦/٢٩).

(عمادالـدين بـن شـيخ الشـيوخ) داوای لە مەلیـک (الجـواد) کـرد کە شـاری (دیمشق) ی ڕادەستی مەلیک (العادل) بکاتەوە، هەروەها پێشی ڕاگەیاند ئەگەر بێـت و شارەکە ڕادەست نەکات ئەوا مەلیک (العادل) سوپای بۆ دەنێرێ بە زۆر شـارەکەی لـێ وەردەگـرێتەوە، هەروەهـا تـۆش دەخـاتە بەنـدیخانەوە لەبەر ئەوەی سـەرپێچی فەرمانەکانـت کـردووە (ابـن واصـل،١٩٧٢، ١٩٩/٥؛ الهسـنيانی،٢٠٠٧/ص ٧١) لەوکـاتەی کە فرمـانەکەی مەلیـک (العـادل)ی پـێ ڕاگەیانـد ژمـارەیەکی زۆر لە کاربەدەسـت و

نووسەران و کەسانی پلە و پـایەی بڵنـد لەوێ ئامـادەبوون (عمادالـدین) بە ئەوانیشـی ڕاگەیاند کە مەلیک (العادل) فرمانی لابردنی مەلیـک (الجـواد)ی دەرکـردووە نابێـت هیچ پارەو پوولێکی بدەنێ یاخود گوێ لە بڕیار و قسەکانی بگیرێ (ابـن العمیـد، د.ت، ص٢٣-٢٤؛ المقریزی، ١٩٩٧، ٣٩٠/١) هەروەها بە مەلیک (الجواد)ی ڕاگەیاند ئەگەر بێت و پێش ئەوەی سوپای مەلیک (العـادل) لە (مصـر)ەوە بەرەو (دیمشـق) بێـت بـۆ تـۆ باشترە شارەکە ڕادەست بکەی ئەویش لەبری ئەم کارەت پاداشتت دەداتەوە بەپێدانی هەندێک ناوچە لە (مصر)، هەروەها وەک ئامۆژگارییەکی کرد کە ئەمە بۆ تۆ باشترە، بەڵام مەلیک (الجواد) وەڵامێکی ڕوون و ئاشکرای نەدایەوە زۆر باشیش دەیزانـی کە لە ڕووی سوپاوە توانای نییە ڕووبەڕووی مەلیک (العادل) ببێتەوە (ابـن واصـل،١٩٧٢م،٥/ ١٩٩).

مەلیک (الجواد) هەوڵەکانی دەست پێکرد بۆ ئەوەی دەسـەڵاتی خـۆی بەسـەر (دیمشق) بهێڵێتەوە بۆ ئەم مەبەستە داوای لە (ضـیفة خـاتون)ي پـووری کـە خـاوەنی شاری (حلب) بوو کرد تاکو یارمەتی بدات بۆ بەرەنگاربوونەوەی مـەلیك (العـادل)ی ئامۆزای، دیارە هەوڵەکەی لەم لایەنەوە سەرکەوتنی بەدەست نەهێناوە چونکە پووری هیچ یارمەتییەکی پێشکەش نەکردووە لە لایەکی تـر مەلیـک (الجـواد) جـارێکی تـر لەگەڵ (عمادالـدین) کۆبـوونەوە پێـی ڕاگەیانـد کە (( ئێـوە دەتـانەوێ ئەم شـارەم لێوەرگرنەوە (اسکندریة)م بدەنێ بێگومان مەلیـک (العـادل) پێویسـتی بە جێگرێـک هەیە بـۆ ئەوەی (دیمشـق) بەڕێـوەبەرێ بـا ئەو جێگـرەش منـبم، وەک هەڕەشـە کردنێکیش وتی ئەگەر بێت و ئێوە هەر داکۆکی بکەن لەوەی ئەم شارەم لێوەرگرنەوە ئەوا من داوا لە برا گەورەکەی مەلیک (العادل) دەکەم- کە مەبەستی مەلیک (الصـالح نجم الدین) - ڕێکەوتنـی لەگەڵ دەکەم کە بێـت و مـن (دیمشـق)ی ڕادەسـت دەکەم ئەویش (سنجار)م پێدەدات)) (عمادالدین)یش وەڵامـی دەداتەوە ئەگەر بێـت و ئەم کـارە بـکەی ئەوا مەلیـک (العـادل) لەگەڵ مەلیـک (الصـالح نجـم الـدین) ی بـرای ڕێکەوتن دەکات و ئەوکات تۆ هیچ شوێنێکت بۆ نامێنێتەوە، مەلیک (الجواد) هەڵسا تەواوی ڕووداوەکەی بـۆ مەلیـک (المجاهـد) گێـڕایەوە ئەویـش دەترسـا، بۆیـە وتـی ئەگەر بێت و ئەو دوو بـرایە ڕێکەوتـن بـکەن ئەوا هـیچ جێگـایەکمان بـۆ نـامێنێتەوە،

پاشان مەلیک (المجاهد) چوو بۆ لای (عمادالدین ) تاکو ڕازی بکات پێی ڕاگەیاند لە بەرژەوەندیی تۆیە کە نامەیەک بنێری بۆ مەلیک (العادل) تاکو لە پێشنیازەکەی پاشگەز ببێتەوە (عمادالدین) یش بە جۆرێ وەڵامی دایەوە هۆی تووڕە بوونی مەلیک (المجاهد)، هەر ئەمەش وای کرد مەلیک (المجاهد) لەگەڵ مەلیک (الجواد) ڕێکەون لەسەر کوشتنی (عمادالدین) مەلیک (المجاهد) گەڕایەوە بۆ شاری (حمص) (النویری،٢٠٠٤م، ١٥٧/٢٩؛ الذهبی، ١٩٩٣م،١٩/١٤).

مەلیك (الجواد) پەنای بردە لای (الاسماعیلیة)كان كە گرووپێكی شیعە بوون ناوەكەیان دەگەڕێتەوە بۆ (اسماعیل) ی كوڕە گەورەی (جعفر الصادق) لە دواتر ئەم گرووپە دەستیان كرد بە كاری تیرۆركردن كە دەیانویست ئامانجەكانیان لە ڕێگەیەوە بهێننە دی بۆ ئەم مەبەستە دەیان قەڵای سەختیان لەو بەشێكی زۆری جیهانی ئیسلامی دروست كرد لەو شوێنانەوە دەستیان كرد بەكاری تیرۆركردن (م.ت.هوتسما، ١٩٩٨، ٧٥٧/٣-٧٥٨) دواجار مەلیك (الجواد) توانی لەگەڵیان ڕێكەوێت بەپارە تاكو (عمادالدین) بكوژن ئەوانیش دوو كەس لە خۆبەخشەكانی خۆیان نارد لە پێش دەرگای مزگەوت لە (عمادالدین)یان دا و كوژتیان لە ١٦ جمادی یەكەم، هەروەها دەنگ و باس وا بڵاوكرایەوە كە ئەو دوو كەسە هاتوون بۆ كوژتنی مەلیک (الجواد) گوایە (عمادالدین) زۆر لە مەلیک (الجواد) چووە بۆیە وایان زانیوە كە ئەوە هەوە بۆیە لێیان داوە و كوژتوویانە دیارە ئەم پروپاگەندەیەش لەلایەن مەلیک (الجواد) بڵاوكرایەوە بۆ ئەوەی تاوانی كوژتنەكەی نەخەنە ئەستۆی ئەو بەم شێوەیە مەلیک (العادل)یان لە شێوازی كوژتنەكەی ئاگادار كردەوە (المقریزی، ١٩٩٧، ٣٩٠/١) مێژوونووسان هەندێكیان ڕای جیاوازیان هەیە لە بارەی شێوازی كوژتنەكەی ، بەڵام هەموویان كۆكن لەسەر ئەوەی كە دەستی مەلیک (الجواد) هەبووە لە كوشتنەكەی (ابن كثیر،١٩٩٣، ص٨٣٧) مەلیک (الجواد) دەستی گرت بەسەر تەواوی پارەو پوولەكانی (عمادالدین) كە پێی بوو، هەروەها لە هەمان كات نووسراوێكی كرد تێدا ئاماژەی بەوە كردبوو گوایە (عمادالدین) خاوەنی هیچ سەروەت و سامانێک نەبووە (النویری،٢٠٠٤، ١٥٨/٢٩) پاشان تەرمەكەی ئامادەكرد و لە كاتی ناشتنەكەی خەڵكێكی زۆر ئامادەبوون (الذهبی، ١٩٩٣ ،١٩/١٤؛ ابی شامة،٢٠٠٢/ص١٦٨) مەلیک (العادل) لە

هەوڵەکانی بەردەوام بوو بۆ ئەوەی (دیمشق) لە مەلیک (الجواد) وەربگرێتەوە ئەوە بوو دەستی کرد بە کۆبوونەوەی لەگەڵ ئەمیرەکانی تاکو هێرش بکاتە سەر (دیمشق) لە هەمان کات نوێنەرێکی نارد بۆ لای مەلیک (الجواد) کە هەڵگری نامەیەک بوو کە تێدا نووسرابوو لەبەرامبەر دەست هەڵگرتنت لە (دیمشق) چەند ناوچەیەکت پێدەبەخشم، لەوانە قەڵای (الشوبک) و ناوچەکانی سەر بەو قەڵایە و شاری (اسکندرية) و ناوچەکانی سەر بە (البحيرة) و (القيلوب) و دە گوند لە ناوچەی (الجيزة) لە (مصر) هەروەها خۆتیش لە قەڵای (الجبل) نیشتەجێ بە و ڕاوێژت پێدەکەم لە کاروباری وڵات، بەڵام (عمادالدين قلج) کە جێگری مەلیک (الجواد) نەیهێشت بەو پێشنیازانە ڕازی بێت، هەروەها پێی ڕاگەیاند کاتێک تۆ (دیمشق) ڕادەست دەکەیت و دەچیتە وڵاتی (مصر) مەلیک (العادل) تۆ دەستگیر دەکات دەتداتە دەست کوڕەکانی (عمادالدين بن شيخ الشيوخ) کە تۆ دەستت هەبووە لە کوشتنی ئەوانیش دەتکوژنەوە وەک تۆڵەسەندنەوەیەک، بەم شێوەیە جێگرەکەی ڕێگر بوو لە بەردەم ڕادەست کردنی (دیمشق) بە مەلیک (العادل) سوپای بەڕێ کرد بۆ (دیمشق) سوپاکەی گەیشتە (بلبيس) (المقريزي،١٩٩٧، ٣٩٠/١ ؛ السقاف https://www.dorar.net/history/event2536).

## دووەم/ پەیوەندیی مەلیک (الجواد) لەگەڵ مەلیک (الصالح نجم الدين) کوڕی مەلیک (الكامل)ی ئامۆزای:

مەلیک (الجواد) لە (دیمشق) زانی کە ناتوانێ ڕووبەڕووی سوپاکەی مەلیک (العادل) ببێتەوە بۆیە هەڵسا بە خێرایی دووکەسی بەناوەکانی (ابن العديم العقيلي) و (ابن طلحة) کەسایەتی دووەم و وتاربێژی مزگەوتی گەورەی (دیمشق) بوو ئەوانی نارد بۆ لای مەلیک (الصالح نجم الدين) کە خاوەنی (حصن كيفا) و (ديار بكر) ناوچەکانی ڕۆژهەڵاتی دەوڵەتی ئەیوبی بوو بەگشتی (ابن واصل،١٩٧٢، ٢٠٠/٥؛ المقريزي،١٩٩٧، ٣٩٠/١) داوای لێکرد کە ڕێکەوتنی لەگەڵ بکا ت بە پێدانی (سنجار) و (الرقة) و (عانة) بەرامبەر بە (دیمشق) (إبن العديم، د.ت،٣٤٥٣/٧؛ ابن خلكان،١٩٩٤ ،٨٤/٥؛ الهسنياني،٢٠٠٦، ص١١).

ئەویش ڕازیبوونی خۆی نیشاندا و بەخێرایی بەرەو (دیمشق) کەوتە ڕێ سەبارەت بە ڕێکەوتنەکە (النویری) باس لەوە دەکات کە سەرەتا مەلیک (الصالح نجم الدین) پێشنیازی کردووە بۆ ڕێکەوتن، بەڵام ئێمە پێمان وایە کە ڕای (ابن واصل) ڕاستتر بێ چونکە لە ڕووداوە مێژووییەکانی دەوڵەتی ئەیوبی زیاتر نزیک بووە، هەروەها زانیارییەکانی زیاتر لەگەڵ ڕووداوەکان دەگونجێ هەرچەندە (النویری) ڕایەکەی (ابن واصل)ی باس کردووە، بەڵام زۆر دڵنیا نەبووە بۆیە وشەی (وقیل)ی بەکار هێناوە واتا زۆر دڵنیا نەبووە (ابن واصل، ١٩٧٢ ،٥/٢٠٠؛النویری،٢٠٠٤، ١٥٨/٢٩) پاش ڕێکەوتنەکە مەلیک (الجواد) ڕاستەوخۆ وتاری ڕۆژی هەینی بەناوی مەلیک (العادل) ڕاگرت و دەستی کرد بە خوێندنەوەی وتار بەناوی (الصالح نجم الدین)، هەروەها پارەش (سکە)ی بەناوی ئەوەوە دەرکرد هەموو ئەمانە نیشانەن بۆ ئەوەی مەلیک (الجواد) بە تەواوی خۆی ڕادەستی مەلیک (الصالح نجم الدین) کردووە (ابن واصل،١٩٧٢ ،٥ /٢٠٢؛ الهسنیانی،٢٠٠٧/ ص٧٥) هەندێ لە سەرچاوەی تر باس لەوە دەکەن کە مەلیک (الجواد) بەرامبەر بە (دیمشق) جگە لە (سنجار) و (الرقة) و (عانة) شاری (نصیبین)یشی وەرگرتووە (النویری، ٢٠٠٤، ١٥٨/٢٩) کاتێک مەلیک (الصالح نجم الدین) گەیشتە (دیمشق) لەگەڵ مەلیک (المظفر) خاوەنی شاری (حماه)، شاری بۆ ڕازانرایەوە مەلیک (الجواد) یش چووە پێشوازیکردنی (ابن واصل،١٩٧٢ ،٥ /٢٠٣).

هەروەها مەلیک (الجواد) هەموو ڕۆژێ یەکێک لە هۆڵەکانی شارەکەی دەڕازاندەوە بە ڕایەخ و کەلوپەلی جوان خواردنی لێ ئامادە دەکردو بانگێشتی مەلیک (الصالح نجم الدین)ی دەکرد و پاشان تەواوی هۆڵەکەی ڕادەست دەکرد بە تەواوی کەلوپەلەکانی ناوی، دووبارە هۆڵێکی تری ئامادە دەکرد بە هەمان شێوە ڕادەستی دەکرد، دواترین پێشوازیکردنی لە هۆڵێک بوو بەناوی (المسرة) (النویری، ٢٠٠٤، ١٥٨/٢٩) مەلیک (الصالح نجم الدین) چووە قەڵای شارەکە مەلیک (الجواد)یش لە خانوویەک مایەوە بەناوی (دار فرخشاه)، زۆر بەسەر ڕێکەوتنامەکەی نێوانیان تێپەڕی نەکرد مەلیک (الجواد) پاشگەز بۆوە لە ڕێکەوتنەکە

بەوەی (دیمشق) ڕادەست بە مەلیک (الصالح نجم الدین) بکات بەرامبەر بە (سنجار) و شوێنەکانی تر (ابن تغری بردی،النجوم الزاهرة ،د.ت،٣٠٦/٦).

مەلیک (الجواد) دەستی کرد بە کۆکردنەوەی سەربازەکانی بۆ ئەوەی ڕووبەڕووی مەلیک (الصالح نجم الدین) ئامۆزای ببێتەوە، بەرامبەر بەوە مەلیک (الصالح نجم الدین) دەستەوەستان ڕانەوەستا بەڵکو ئەویش دەستی کرد بە کۆکردنەوەی سەربازەکانی لە قەڵای (دیمشق) هەوڵی ئەوەی دا کە پەلاماری مەلیک (الجواد) بدات و خانووەکەی کە (دار فرخشاه) بوو بسووتێنێ، لەم کاتەدا خەریک بوو شەڕێکی خوێناوی لە نێوان هەردوو ئامۆزا ڕووبدات، بەڵام کەسایەتییەک بەناوی (ابن جربر) توانی ئاشتی لە نێوانیان بەرقەرار بکات و دووبەرەکی نێوانیان دابمرکێنێتەوە (سبط ابن الجوزی ٢٠١٣، ٢٢/ ٣٥٨؛ الدواداری، ١٩٧٢، ٣٣٢/٧).

(ابن واصل) هەندێک بیر و بۆچوونی جیاوازە لە (سبط ابن الجوزی) لەبارەی ناکۆکیی نێوان هەردوولا کە تەواوی ڕووداوەکە بەم شێوەیە باس دەکات دەڵێ مەلیک (الجواد) بۆیە پاشگەز بۆتەوە لە ڕێکەوتنامەکە لەگەڵ (الصالح نجم الدین) چونکە ترسی لەوە هەبوو کە (الصالح نجم الدین) ڕێکەوتنەکە وەکو خۆی جێبەجێ نەکات، ئەم ترسەشی لەوەوە لا گەڵاڵە بووە کە پێی وابووە مەلیک (الصالح نجم الدین) هەنگاوی خۆی ناوە دەستی گەیشتۆتە (دیمشق)، توانیوێتی خۆی و سەربازەکانی تێدا نیشتەجێ بکات، بەڵام مەلیک (الجواد) هەتاکو ئەو کات هیچ شتێکی دەست نەکەوتبوو بەپێی ڕێکەوتنەکە بۆ ئەم مەبەستە هەڵسا بە کۆکردنەوەی سوپاکەی لە ماڵێک بەناوی (دار السعادة) بۆ ئەوەی دووبارە شاری (دیمشق) بخاتەوە ژێر دەسەڵاتی خۆی، مەلیک (الصالح نجم الدین)یش هاتە دەرەوە بۆ شەڕکردن زۆری نەمابوو ڕووداوێکی گەورە لە نێوانیان ڕووبدات بەڵام، مەلیک (المظفر)ی خاوەنی (حماه) هاتە نێوانیان توانی ئەو ئاگرەی نێوانیان بکوژێنێتەوە، چووە لای مەلیک (الجواد) لەگەڵی کۆبۆوە دڵنیای کردەوە لە مەلیک (الصالح نجم الدین) بەندەکانی ڕێکەوتنەکە جێبەجێ دەکات، بەمەش مەلیک (الجواد) دڵنیابۆوە لە جێبەجێکردنی ڕێکەوتنەکە وەکو خۆی (ابن واصل، ١٩٧٢، ٥/ ٢٠٤) وەک دەبینین هەردوو مێژوونووسەکە بە جۆرێکی جیاواز باسی ناکۆکیی نێوانیانی کردووە، بەڵام

ئەوەی هەردووکیان لەسەری کۆکن لەسەر ئەوەی کە ناکۆکییەکی توند لە نێوان هەردوولا هەبووە کە خەریک بووە بگاتە ئاستی پێکدادانی نێوانیان .

لە کاتی دەرچوونی مەلیک (الجواد) لە شاری (دیمشق) خەڵکی لە دەرگای شارەکە کۆبوونەوە دەستیان کرد بە قسە پێ وتنی (سبط ابن الجوزی،٢٠١٣، ٢٢/ ٣٥٨؛ الصلابی، ٢٠٠٨، ص٢٨٠) هۆکاری ئەم قسە پێوتنەشی دەگەڕێتەوە بۆ خراپ بەڕێوەبردنی شارەکە لە لایەن مەلیک (الجواد)ەوە (ابن تغری بردی، النجوم الزاهرة، د.ت،٣٠٦/٦) هەروەها بە لاوازی بەدیارکەوت بەتایبەتی دوای دەستگرتن بەسەر کۆگاکانی شارەکە (الیافعی، ١٩٩٧، ٧٣/٤)

تەنانەت یەکێک لە پیاوەکانی کە ناوی (الناصح) بوو کە پارەیەکی زۆری لە خەڵکی وەرگرتبوو، جگە لەوەش هەندێک لە خەڵکی شارەکەشی کردبووە بەندیخانەوە باس لەوە دەکەن کە ٦٠٠ هەزار درهەمی لە خەڵکی وەرگرتووە مەلیک (الصاح نجم الدین) داوای لە مەلیک (الجواد) کردووە کە ئەو پارەی خەڵکی بگەڕێنێتەوە، بەڵام مەلیک (الجواد) شارەکەی بەجێهێشت و بەبێ ئەوەی هیچ پارەیەک بۆ خەڵکی بگەڕێنێتەوە، (النویری، ٢٠٠٤، ١٥٩/٢٩) سەبارەت بە (الناصح) چووە شاری (حماه) لەوێ نیشتەجێ بوو، دوای ئەوەی مەلیک (الصالح نجم الدین) وڵاتی (مصر)ی لە مەلیک (العادل)ی برای وەرگرت خستیە ژێر دەسەڵاتی خۆیەوە (الناصح) چووە (مصر) تاکو خزمەتی مەلیک (الصالح نجم الدین) بکات، وەک دەزانین (الناصح) لە خزمەتی مەلیک (الجواد) بووە لە (دیمشق)، هەروەها پێشتر ئاماژەمان بەوە کرد کە مەلیک (الجواد) هەستا بە کوشتنی (عمادالدین بن شیخ الشیوخ) دەستیشی گرت بەسەر کەلوپەلەکانی ئەوکات جلێکی (سوور)ی بەناوبانگی هەبووە مەلیک (الجواد) دەستی بەسەردا گرتووە پێشکەشی ئەو (الناصح)ەی کردووە. دوای ئەوەی ڕوو لە وڵاتی (مصر) دەکات براکەی (عمادالدین) جلوبەرگی براکەی لەبەر (الناصح) دەناسێتەوە دەچێتە لای مەلیک (الصالح نجم الدین) پێیدەڵێت ئەو (الناصح)ە سەروەت و سامانێکی زۆری لە سەردەمی مەلیک (الجواد) کۆکردۆتەوە هەروەها باسی جلوبەرگەکانی براکەی بۆ کرد کە لەبەر (الناصح) دایە مەلیک (الصالح نجم الدین)یش گرتی فڕێی دایە ناو بیرێکەوە هەر لەوێدا مرد بە

خراپترین شێوە (سبط ابن الجوزی،٢٠١٣، ٢٢/ ٣٥٨) مەلیک (الجواد) بەپێی ڕێکەوتنەکە شاری (دیمشق) ی بەجێهێشت دوای ئەوەی بۆ ماوەی ١٠ مانگ و چەند ڕۆژێ حوکمی شارەکەی کرد (ابن واصل،١٩٧٢، ٥/ ٢٠٤).

**سێیەم/ پەیوەندیی مەلیک (الجواد) لەگەڵ مەلیک (بدرالدین لؤلؤ) خاوەنی (موصل):**

هەر لەهەمان ساڵی (٦٣٦ک/١٢٣٨ز) کاتێک مەلیک (الجواد) لە ڕێگادا بوو بۆ (سنجار) و (دیمشق) ی بەجێهێشت و گەیشتە (ضمیر) شوێنێ کە لە نزیک (دیمشق)، هەروەها دەڵێن گوندێکە و قەڵایەکە کەوتۆتە کۆتایی سنووری (دیمشق) کە بۆ (السماوة) دەچێ (الحموي، ١٩٩٥، ٣/٤٦٣) لەو شوێنەدا مەلیک (الجواد) کابرایەکی دەشتەکی بینی گومانی کەوتە سەری دەستگیری دەکات گومانەکەی مەلیک (الجواد) لە جێگای خۆی بوو چونکە کابرای دەشتەکی هەڵگری نامەیەکی نهێنی بوو کە هی مەلیک (الصالح نجم الدین) بوو ناردبووی بۆ خەوارزمییەکان، تێدا داوای لە خەوارزمییەکان کردبوو هەرکاتێک مەلیک (الجواد) دەگاتە (حمص) ئێوە هێرشی بکەنە سەری هەرچی سەروەت و سامانی هەیە لێی وەرگرن و خۆشی دەستگیر بکەن و بینێرنەوە بۆ من، پاش ئاشکرابوونی پیلانەکە ڕاستەوخۆ مەلیک (الجواد) ڕێگای (سماوة) دەگرێتەبەر کە دەکەوێتە نێوان (کوفة) و (الشام) بۆ ئەوەی بگاتە (عانة) (الحموی،١٩٩٥، ٣/٢٤٥).

پاش گەیشتنی بە (عانة) چەند ڕۆژێ تێیدا مایەوە، بەڵام هەواڵی بۆ هات کە مەلیک (بدرالدین لؤلؤ) حاکمی (موصل) ئەو بۆشاییە سیاسییەی لە (سنجار) قۆستۆتەوە و گەمارۆی شارەکەی داوە تاکو دەستی بەسەردا بگرێ مەلیک (الجواد) یش بەخۆی و دووسەد سەربازەوە لە (عانة)وە بەڕێ کەوت بەرەو (سنجار) کاتێکیش نزیک بۆوە کۆبوونەوەی لەگەڵ ئەمیرەکانی خۆی کرد و پیلانێکی سەربازی دانا ئەویش بە لێدانی دەهۆڵی شەڕکردن و دابەشکردنی سەربازەکانی بەسەر چەند گرووپێک داواشی لێیان کرد تێکڕا هەموویان پێکەوە دەهۆڵ لێبدەن و ئاگر هەڵکەن، کەسێکیشیان نارد بۆ شارەکە لە شەودا تاکو بزانن سوپای (بدرالدین

لؤلؤ) چەندە، چونکە وا تێگەیشتن کە سوپایەکی زۆری لەگەڵدایە، (بدرالدین لؤلؤ) کاتێک هەواڵی هاتنی مەلیک (الجواد)ی بیست ڕاستەوخۆ گەمارۆی سەر شارەکەی هەڵگرت و گەڕایەوە شاری (موصل)، مەلیک (الجواد) بۆ ڕۆژی دواتر چووە شارەکە بۆ ماوەی یەک ساڵ حوکمی شارەکەی کرد (النویری، ٢٠٠٤، ٢٩/١٦٠) ،(بدرالدین لؤلؤ) حاکمی (موصل)یش هەرگیز دەستبەرداری ئەو بیرۆکە و حەزو ئارەزووەی نەبۆوە کە واز لە (سنجار) بهێنێ بەڵکو بەردەوام لەهەوڵ و تێکۆشاندا بوو، تاکو بیخاتە ژێر ڕکێفی خۆی بۆ ئەوەی دەسەڵاتی بەتەواوەتی بەسەر ناوچەکەدا هەبێت، هەروەها بۆ داهاتووی حوکمی ئەم کارەی پێویست بوو، بۆیە چەندین ڕێگای گرتە بەر تاکو داگیری بکات و بیخاتە ژێر دەستی خۆی (الهسنیانی، ٢٠٠٥، ص٩٨).

مێژوونووس (ابن شداد) زۆر بەوردی زانیارییەکانی سەبارەت بە هەوڵەکانی (بدرالدین لؤلؤ) بۆ دەستگرتن بەسەر (سنجار) تۆمار کردووە هەندێ بیرو بۆچوونی جیاوازە لە مێژوو نووسەکانی تر سەبارەت بە لابردنی گەمارۆکەی (بدرالدین لؤلؤ) لەسەر (سنجار)، دەڵێت لەو کاتەدا مەلیک (الجواد) بەخێرایی پەیوەندی بە خەوارزمییەکان کردووە، هەروەها پارە و سەروەت و سامانی پێدان تاکو یارمەتی بدەن لە دوورکردنەوەی مەترسی (بدرالدین لؤلؤ) لەسەر شارەکە خۆشی ڕووی کردە شاری (سنجار)، کاتێکیش (بدرالدین لؤلؤ) بەمەی زانی کە نزیک بوونەتەوە ئەویش بەخێرایی گەڕایەوە (موصل) وازی لە گەمارۆدانەکە هێنا (إبن شداد، ١٩٧٨م، ٣/ ق١، ٢٠٣).

مەلیک (الجواد) دەستی بەسەر (سنجار)دا گرت بەهاوکاریی خەوارزمییەکان، لە ڕاستیدا (بدرالدین لؤلؤ) ترسی ئەوەی هەبوو کە مەلیک (الجواد) بەهاوکاریی خەوارزمییەکان هێرش بکەنە سەر (موصل) و داگیری بکات، بۆیە نەرمونیانی پیشاندا بەرامبەری، لەگەڵ ئەوەشدا کاری ژێربەژێری دەکرد تاکو دەست بەسەر (سنجار)دا بگرێ، بۆ ئەم مەبەستە نێردراوی ناردە لای خەلیفە (المستنصر ـ بالله) کە لە ماوەی (٦٢٣-٦٤٠ هـ /١٢٢٦-١٢٤٢م) خەلیفە بووە لە (بغداد) پێی ڕاگەیاند کە مەلیک (الجواد) نیازی وایە شارەکە ڕادەستی خەوارزمییەکان بکات بۆیە داوای ڕێگەپێدانی کرد لە دەست بەسەرداگرتنی شارەکەدا (إبن شداد، ١٩٧٨، ٣/ ق١، ٢٠٣)، وەک دەزانین

خەلیفە لەو سەردەمەدا هیچ دەسەڵاتێکی بەهێزی نەبووە تاکو یارمەتی بدات، بەڵام مەبەستی ئەو زیاتر ڕێپێدانی بووە لە ڕووی شەرعەوە، ئەوە بوو ئەویش ڕێگای پێدا، ئەم ناکۆکییانەی نێوانیان وای کرد هەردوولایان دەرگای فرتوفێڵی سیاسی لەیەکتر بکەنەوە (توفیق،٢٠١٥، ل١٦٣).

سەرەتا مەلیک (الجواد) دەستی بە فێڵی سیاسی کرد هەڵسا نێردراوی نارده لای (بدرالدین لؤلؤ) دیاری پێشکەش کرد، هەروەها پێی ڕاگەیاند کە کچێکی هەیە دەیەوێ بیداتە یەکێک لە کوڕەکانی تاکو لەڕێگای ژنخوازییەکی سیاسی پەیوەندیی نێوانیان ئاسایی بکەنەوە، لە هەمان کاتدا مەلیک (الجواد) لەو کاتەدا هیچ کچێکی نەبووە تاکو بیانداتێ ئەم کارەش تەنها بۆ ئەوە بوو تاکو فێڵی لێ بکات (بدرالدین لؤلؤ)یش کاتێک لێکۆڵینەوەی کرد زانی هیچ کچێکی نییە لەو کاتەدا، بەڵام لەگەڵ ئەوەدا ئەویش کەوتە پیلانی خۆی، وا خۆی نیشاندا کە ئاگاداری ئەوە نییە، بۆیە نێردراوی ناردە لای بەدیاری و قوماشەوە تاکو داوای کچەکەی بکات، مەلیک (الجواد)یش دواتر هەواڵی نارد بۆ (بدرالدین لؤلؤ) کە کوڕەکەی بنێرێ بۆ (سنجار) تاکو کچەکەی خۆی بداتێ خۆشی لەو کاتەدا ڕۆیشت بۆ (عانة)، لە هەمان کاتدا مەلیک (الجواد) جێگری خۆی لە شارەکە ئاگادار کردبۆوە هەرکاتێک کوڕەکەی هاتە ناو شارەکە ئەوا دەستگیری بکەن تاکو دواتر وەک کارتێکی فشار بەکاری بهێنێ کە ئەوکات (بدرالدین لؤلؤ)یش بەرامبەر بەگرتنی کوڕەکەی نەرمی دەنوێنێ، بەڵام (بدرالدین لؤلؤ) لەژێرەوە کاری خۆی کردبوو لەگەڵ کەسایەتییەک بەناوی (جنقر) لە شارەکە ڕێکەوتبوو بە پارە و سەروەت و سامان، کە هاوکاری بکات لەگرتنی شارەکە، هەروەها ژمارەیەک سەربازی خۆی لەگەڵ کوڕەکەی نارد تاکو کە دەرگای شارەکە کرایەوە ڕاستەوخۆ پەلاماری شارەکە بدەن والیی شارەکە بگرن، ئەمەش ڕوویدا کاتێک والیی شارەکە دەرگای کردەوە بەو نیازەی کە کوڕی (بدرالدین لؤلؤ) بگرێ، بەڵام کۆمەڵێ سەرباز هاتن و ئەویان گرت شارەکەش کەوتە ژێر دەسەڵاتی (بدرالدین لؤلؤ) لەژێر دەسەڵاتی مایەوە تاکو کۆچی دوایی کرد لە ساڵی (٦٥٧ک/١٢٥٨ز) لەدوای خۆشی کوڕەکەی دەسەڵاتی گرتە دەست (إبن شداد، ١٩٧٨م، ٣/ ق١، ص٢٠٤-٢٠٦ ؛ الهسنياني، ٢٠٠٥، ص٩٨-٩٩).

ئەگەر لە سەرچاوەکان وردبینەوە ئەوا بیر و بۆچوونی جیاواز دەبینین سەبارەت بە گرتنی شارەکە لەلایەن (بدرالدین لؤلؤ) کە دەڵێن (بدرالدین لؤلؤ) توانی شاری (سنجار) لە مەلیک (الجواد) وەرگرێت بە هاوکاریی خەڵکی شارەکە، هەروەها باسی ئەوە دەکات کە مەلیک (الجواد) زۆر بە خراپی حوکمی شارەکەی کردووە، دیارە هەر ئەم هۆکارە وای کردووە خەڵکی شارەکە یارمەتی و هاوکاریی مەلیک (بدرالدین لؤلؤ) بکەن بۆ ئەوەی دەست بەسەر شارەکەدا بگرێ، کاتێکیش مەلیک (الجواد) دەچێتە ڕاوکردن ئەوانیش داوایان لە مەلیک (بدرالدین لؤلؤ) کرد کە بێتە شارەکە و دەرگای شارەکەی بۆ دەکەنەوە و شارەکە دەگرێ. مەلیک (الجواد) یش بە ناچاری ڕوو دەکاتە (عانة) (مؤلف مجهول،٢٠١٠ ،ص٤٢٩؛ الذهبی ،١٩٩٣، ٢٢/١٤).

هەروەها مێژوونووسی تر هەیە وەک (الملک الاشرف الغساني ) کە باس لەوە دەکات کە لەساڵی (٦٣٧ک/١٢٣٩ز) مەلیک (الجواد) خۆی نامە دەنووسێ بۆ مەلیک (بدرالدین لؤلؤ) داوای لێدەکات نوێنەر بنێرێ بۆ ئەوەی شاری (سنجار) بە ئاشتی ڕادەست بکات، ئەویش کوڕەکەی خۆی بە ناوی (اسماعیل) دەنێرێ، بەڵام مەلیک (الجواد) هەڵدەستێ کوڕەکەی دەستگیر دەکات و لە بری ئازادکردنی داوای پارە لە (بدرالدین لؤلؤ) دەکات ئەویش بە ناچاری پارەی بۆ دەنێرێ، هەروەها دوای لێ دەکات کە شارەکەی ڕادەست بکات بەڵام مەلیک (الجواد) دەڵێ دەبێت بۆ ئەم کارە مۆڵەت لە دیوانی شارەکە وەرگرم دیارە شارەکە لەو سەردەمدا دیوانی هەبووە، دواتر مەلیک (الجواد) یەکێک لە ئەمیرەکانی خۆی دەکات بە جێگری خۆی لە شارەکە و خۆشی دەڕوات بۆ شاری (بغداد)، (اسماعیل) کوڕی (بدرالدین لؤلؤ)یش لە شارەکە بەجێ دەهێڵێ ئەمەش یەکێک بوو لە هەڵە گەورەکانی مەلیک (الجواد)، چونکە (اسماعیل) ژێر بە ژێر لەگەڵ ژمارەیەک لە سەرباز و کۆمەڵێک لە خەڵکی شارەکە ڕێک دەکەون دەست دەکەن بە بەرەنگاربوونەوەی جێگری مەلیک (الجواد) لە شارەکە، شەڕ لە نێوانیان دروست دەبێت (اسماعیل) دەتوانێ بچێتە ناو قەڵای شارەکە و دەست بەسەر تەواوی (سنجار)دا بگرێ (الغساني، ١٩٧٥، ص ٤٩٠) وەک دەبینین سەبارەت بە گرتنی شاری (سنجار) لەلایەن مەلیک (بدرالدین لؤلؤ) بیر و بۆچوونی جیاواز هەیە لە نێوان مێژوونووسان، بەڵام ئێمە زیاتر بیرو بۆچوونی

(ابن شـداد)مان لە هەموویـان زیـاتر لا پەسـەندە چـونکە هاوسـەردەمی ڕووداوەکـان ژیاوە.

**چوارەم/ پەیوەندیی مەلیک (الجواد) لەگەڵ خەلیفەی عەباسی لە (بغداد):**

لە ساڵی (٦٣٧ک/١٢٤١ز) مەلیـک (الجـواد) دوای ئەوەی شـاری (سـنجار)ی لەدەسـت دەدات دەچێـتەوە بـۆ (عانـة) (سـبط ابـن الجـوزی،٢٠١٣، ٢٢/ ٣٦٧) دواتـرش ڕوودەکاتە شاری (بغـداد) خەلـیفەش ڕێزێکـی زۆری دەگـرێ (الکتبی،١٩٧٤، ٤/ ٣٩٦) پێدەچێ هۆکاری ڕێزگرتنەکەی خەلیفەش بۆ مەلیک (الجواد) بگەڕێـتەوە بـۆ ئەوەی کە یەکێـک بـووە لە مەلیکەکـانی دەوڵەتـی ئەیـوبی. سـەبارەت بە چـوونی مەلیـک (الجواد) بۆلای خەلیفە بۆ ئەوە بووە تاکو داوای لێ بکـات کە شـاری (سـنجار)ی بـۆ بگەڕێنێتەوە، بەڵام خەلیفە هیچ شتێکی بۆ ناکات. (الاتروشی، ٢٠١٣، ص١٧) بـۆ مـاوەی شەش مانگ لە خزمەتی خەلیفە مایەوە خەلیفەش بڕی چوار هەزار دیناری پێشکەش دەکات، پاشان داوای لێدەکات کە شاری (بغداد) بەجێبهێڵێ (النویری، ٢٠٠٤، ٢٩/١٦٠) سـەبارەت بە فەرمـان پێکردنـی خەلـیفە بـۆ ئەوەی شـاری (بغـداد) بەجێبهێڵـێ سـەرچاوەکان هـیچ هۆکارێکیـان ئامـاژە پێـنەداوە کە بـۆچی خەلـیفە ئەو داوایەی لێکردووە.

مەلیک (الجواد) بەناچـاری شـاری (بغـداد) بەجێـدەهێڵێ دەگەڕێـتەوە شـاری (عانة) دواتـر خەلـیفە داوای لێـدەکات شـاری (عانـة)ی پـێ بفرۆشـێ ئەویـش ڕازی دەبێت بە ١٢٠ هەزار درهەم پێی دەفرۆشێ بەم شێوەیە مەلیک (الجواد) ئەم شارەشی لە دەستدا، دواتر مەلیک (الجـواد) سـەروەت و سـامانەکەی لە دەسـت دەدات دوای ئەوەی دەست دەگیرێ بەسەریدا لە ناوەڕاستی (الجزیرة) لە نزیک (الفرات) (النویری، ٢٠٠٤، ٢٩/١٦٠).

**پێنجەم/ پەیوەندیی مەلیک (الجواد) لەگەڵ خەوارزمییەکان:**

سەرەتای پەیوەندیی مەلیک (الجواد) دەگەڕێتەوە بـۆ سـاڵی (٦٣٦ک/١٢٣٨ز) لەکاتی گۆڕینەوەی (دیمشق) بە (سنجار) و (عانة) و (الرقة) کە پێشر باسـی ئەوەمـان کـرد کاتێـک لە (دیمشـق) دەرچـوو سـەرەتا ویسـتی ڕووبکـاتە (الرقـة) بەڵام،

خەوارزمییەکان ڕێگر بوونە لەبەردەم چوونی بۆ شارەکە بۆیە ڕووی ئاراستەی گۆڕی بۆ (سنجار) و (عانة) (ابن العديم، ١٩٩٦،ص٤٩٩).

خەوارزمییەکان وەک هێزێکی بەهێز و کاریگەر لە ناوچەی (الشام) بەدیار کەوتن کە زیاتر بەدوای سەروەت و سامانەوە بوون وەک دەبینین کاتێک (بدرالدین لؤلؤ) ی حاکمی (موصل) گەمارۆی سەرشاری (سنجار)ی دابوو مەلیک (الجواد) لە شاری (عانة) دەبیت و داوای هاوکاری لە خەوارزمییەکان دەکات بۆ هێرشکردنە سەر (بدرالدين لؤلؤ) بەرامبەر بە پێدانی بەسەروەت و سامان کاتێکیش (بدرالدین لؤلؤ) بە ڕێکەوتنەکەی زانی دەستی لە گەمارۆی سەر شارەکە هەڵگرت و مەلیک (الجواد)یش بە هاوکاریی خەوارزمییەکان چووە شارەکەوە (إبن شداد، ١٩٧٨، ٣/ ق١، ٢٠٣) دوای فرۆشتنی (عانة) بەخەلیفە مەلیک (الجواد) هیچ جێگایەکی بە دەستەوە نەمایەوە (الرقة)یش لە ژێر دەسەڵاتی خەوارزمییەکان بوو (ابن واصل،١٩٧٢، ٥/ ٢٨١-٢٨٢) بۆیە بە ناچاری ڕووی کردە شاری (حران) کە ئەو شارەش لەژێر دەسەڵاتی خەوارزمییەکان بوو چووە شارەکەوە لەلای ئەوان مایەوە بۆ ماوەی یەک ساڵ لەو ماوەیەدا بەشداری کرد لە هێرشی خەوارزمییەکان بۆ سەر شاری (حلب)، لە ساڵی (٦٣٨ک/١٢٤٠ز) مەلیک (الجواد) و مەلیک (المنصور) کوڕی مەلیک (مجاهد) خاوەنی (حمص)-کە لەدوای باوکی دەسەڵاتی شارەکەی وەرگرتبوو- لەگەڵ خەوارزمییەکان ڕێکەوتن بۆ ئەوەی هێرش بکەنە سەر شاری (حلب) کە سوپاکەیان بە نزیکەی ٥٠٠٠ هەزار سەرباز مەزندە دەکرا سوپای شاری (حلب) یش لە دەوروبەری ١٥٠٠ سەرباز دەبوون کە هاتنە دەرەوەی (حلب) تاکو ڕووبەڕووی هاوپەیمانیی خەوارزمییەکان مەلیک (الجواد) و مەلیک (المنصور) ببنەوە، شەڕێکی گەورە لە نێوانیان ڕوویدا لە ئەنجامدا سوپای خەوارزمییەکان و هاوپەیمانەکانی سەرکەوتن لە شەڕەکەدا سوپای (حلب)یەکان زۆر بەخراپی تێکشکان، هەروەها ژمارەیەکی زۆری ئەمیرەکانیان بە دیل گیران دەستیان بەسەر تەواوی کەلوپەلەکانیان گرت دواتر سەرچاوەی ئاوی شاری (حلب)یان گرت بە مەبەستی خۆ بەدەستەوەدانی شارەکە و دوای دەست بەسەراگرتنی شارەکە دەستیان کرد بە کوشتنی خەڵکی زۆر بە شێوازێکی دڕندانە پاشان سوپاکەی خەوارزمییەکان و مەلیک

(الجواد) و مەلیک (المنصور) ڕوویان کردە شاری (منبج) دەستیان کرد بە کوشتن و تالآنکردنی سەروەت و سامانی خەڵکی شارەکە، کە ژمارەیەکی بەرچاوی خەڵکی شارەکە کوژران و تەنانەت دەستدرێژییان کردە سەر ئافرەتانی شارەکە دواتر خەوارزمییەکان گەڕانەوە بۆ شاری (حران) (الذهبی،١٩٩٣، ٢٧/١٤؛النویری،٢٠٠٤، ١٨٢/٢٩؛ صبره،١٩٨٧، ص٢٧٩-٢٨٠) بۆ زیاتر زانیاری لەسەر کارە خراپەکانی خەوارزمییەکان و مەلیک (الجواد) ومەلیک (المنصور) تەماشای (ابن العدیم، ١٩٩٦، ص٥٠٣-٥٠٤)بکە.

**شەشەم/ پەیوەندیی مەلیک (الجواد) لەگەڵ خاچییەکان:**

مەلیک (الجواد) وازی لە خەوارزمییەکان هێنا ڕوو دەکاتە (غزة) بە ئامانجی ئەوەی بچێتە لای مەلیک (الصالح نجم الدین)ی ئامۆزای کە ئەو کات توانیبووی (مصر) لە برا بچووکەکەی (العادل) وەربگرێ، کاتێک گەیشتە (غزة) هەواڵی بۆ ئامۆزاکەی نارد تاکو مۆڵەتی بدات بچێتە (مصر)ەوە مەلیک (الصالح نجم الدین) ترسا لەوەی سەربازەکانی خراپەکاری لە وڵاتی (مصر) بنێنەوە، دیارە ئەم بیرو بۆچوونەشی لە ئەنجامی خراپەکارییەکانی مەلیک (الجواد) و سەربازەکانی لا گەڵاڵە بووە کە بەشدارییان لە کوشتارەکان و خراپەکارییەکانی (حلب) و (منبج)دا کردووە (ابن واصل،١٩٧٢م،٥ /٢٩٦-٢٩٧).

مەلیک (الصالح نجم الدین) بڕیاری دا کە مەلیک (الجواد) دەستگیر بکات، مەلیک (الجواد)یش بە ناچاری ڕووی کردە لای ئامۆزاکەی تری بەناوی (الناصر داود) کە خاوەنی (الکرک) بوو هەرچەندە پێشتر شەڕو ئاژاوەیان لە نێواندا هەبووە، مەلیک (الصالح نجم الدین)یش سوپایەکی بەسەرۆکایەتی (کمال الدین ابن شیخ الشیوخ) -کە برای (عمادالدین ابن شیخ الشیوخ) بوو-لە وڵاتی (مصر)ەوە بەڕێ کرد تاکو هێرش بکاتە سەر مەلیک (الناصر داود) و مەلیک (الجواد)یش دەستگیر بکات، کاتێک سوپاکە گەیشتە (غزة) مەلیک (الناصر داود)یش سوپایەکی بە هاوکاریی مەلیک (الجواد) ئامادە کرد (الذهبی،١٩٩٣م،٢٩/١٤)

لە ساڵی (٦٣٩ک-١٢٤١ز) هەردوو سوپاکە لە شوێنێک بەیەک گەیشتن بەناوی (بیت قورنک) کە گوندێکی نزیکە لە گوندەکانی (نابلس) (النویری، ٢٠٠٤، ١٦١/٢٩) لە

ئەنجامـدا مەلیـک (الجـواد) لـە شـەڕەکەدا سـەرکەوتنێکی گەورەی بەسـەر سـوپای (الصالح نجم الدين) هێنا تەنانەت توانی سەرکردەی سوپاکەش کە (کمال الدين ابـن شـيخ الشـيوخ) دەسـتگیر بکـات، بە دیلکـراوی ڕادەسـتی مەلیـک (النـاصر داود)ی بکـات ئەویــش دەســت دەکــات بە سەرزەنشــتکردن و هەڕەشــەلێکردنی مەلیــک (الجــواد)یش داوای لێــدەکات کە واز لە سەرزەنشــتیکردنی بهێنــێ (الــذهبی،١٩٩٣، ٢٩/١٤).

پاش ماوەیەکی کەم مەلیک (الناصر داود) وای پـێ بـاش دەبێـت کە مەلیـک (الجواد) دەستگیر بکات پێدەچێ هۆکاری بڕیارەکەی بۆ شەڕی (ظهـرحمار) کە لەو شەڕەدا تووشی شکستێکی گەورە هاتبوو لەسەر دەستی مەلیک (الجواد) شـەڕەکەش پێشتر بەشێوەیەکی دوور و درێژ باسیمان کرد کە تێدا مەلیک (النـاصر داود) هەمـوو سەروەت و سامانەکەی لە دەست دا، بـۆیە مەلیـک (الجـواد) دەسـتگیری دەکـات لە ســەرەتادا بڕیــار دەدات کە بیکــوژێ بەڵام، لە دواتــردا بڕیــارەکەی دەگــۆڕێ بــۆ دوورخستنەوەی بینێرێ بۆ شاری (بغداد) بۆلای خەلیفە (النويری، ٢٠٠٤، ١٦١/٢٩).

مەلیــک (النــاصر داود) دوای ئەوەی بڕیــاری دوور خســتنەوەی مەلیــک (الجواد)ی دا بە بەنـدکراوی نـاردی بـۆ شـاری (بغـداد)، بەڵام لەڕێگـادا لە شـوێنێک بەناوی (الازرق) ڕووبارێکە لە نێوان (بهستا) و قەڵای (منصور) لـە نزیـك وڵاتـی ڕۆم بەلای شاری (حلب)دا (الحموی، ١٩٩٥، ٣١٧/٥) ڕادەوەسـتن تـاکو پشـوویەک بـدەن و بحەسـێنەوە مەلیـک (الجـواد) دەرفەتێکـی بـۆ دەڕەخسـێ ڕادەکـات هەوڵـدەدات پەیوەندی بە مامی مەلیک (الصالح اسماعيل) بکـات لە (دیمشـق) کە ئەوکـات ئـەو شارە لە ژێر دەسـەڵاتی مـامی (الصـالح اسـماعیل) بـوو (مؤلـف مجهـول،٢٠١٠/ص٤٣٣؛ النويری، ٢٠٠٤، ١٦١/٢٩) بەڵام دیارە ترسی لە مـامی هەبـووە بـۆیە نەیتوانیـوە پەیوەنـدی پێوە بکات بە ناچاری ڕووی ئاراسـتەی کـردە لای خاچپیەکـان، پەیوەنـدیی مەلیـک (الجواد) بە خاچپیەکان دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی مەلیـک (الکامـل)ی مـامی چـونکە لەو سەردەمەدا بەشـێک لەو نامـانەی کە مـامی نـاردبووی بـۆ خاچپیەکـان لە ڕێگـای مەلیک (الجواد)ی برازایەوە نووسراوە (القلقشندي ،د.ت،١٢٦/٧) هەروەهـا دایکیشـی لە خاچپیەکان بووە (النويری، ٢٠٠٤، ١٦١/٢٩) مەلیک (الجواد) هەوڵەکانی دەسـت پێکـرد

بۆ ئەوەی پەیوەندیی بە خاچییەکانەوە بکات کە لە کەنارەکانی (صیدا) و (بیروت) بوون، دەچێتە لایان و ئەوانیش ڕێزێکی زۆری دەگرن، چوونی مەلیك (الجواد) بۆ لای خاچییەکان هاوکات بوو لە دەستپێکردنی هێرشی خاچییەکان بۆ سەر گوندی (قلسوة) کە گوندێکە سەر بە شاری (نابلس) کە تێیدا هەزار موسڵمان کوژرا مەلیك (الجواد) شاهیدی ئەم ڕووداوە بووە بە بێ ئەوەی تەنها بە وشەیەکیش بەرگرییان لێ بکات، (الذهبي،١٩٩٣، ٤٠٠/١٤)، دواتر کۆدەبێتەوە لەگەڵ مەلیکەکانی خاچییەکان لە شوێنێک بەناوی (قیسارية) (النويري، ٢٠٠٤، ١٦١/٢٩).

کاتێک مەلیک (الصالح نجم الدين) بەوەی زانی کە مەلیک (الجواد) پەیوەندیی بە خاچییەکان کردووە و ویستی پیلانێک دابنێ تاکو دەستگیری بکات. پیلانەکەش بەشێوەیەک بوو گوایە دەیەوێ پەیوەندی بە خاچییەکان بکات، مەلیک (الجواد)یش کاری ئەو هاوپەیمانییە ڕێک بخات دیارە وای نیشان داوە کە پێویستی بە خاچییەکانە بۆ بەکارهێنانیان لە یەکلاییکردنەوەی ململانێ و کێشە ناوخۆیەکانی دەوڵەتی ئەیوبی وەک بەکارهێنانی خاچییەکان دژ بە مامەکەی کە مەلیک (الصالح اسماعيل)ە کە دەستی بەسەر (دیمشق)دا گرتبوو، سەرەتا مەلیک (الصالح نجم الدين) نووسراوێکی بۆ مەلیک (الجواد) نووسی بەڵێنی زۆری پێدا، داوای لێکرد کە دەیەوێ لەگەڵ خاچییەکان هاوپەیمانی بکات، هەروەها پێی ڕاگەیاند کە خاچییەکان چییان بیەوێ بەرامبەر هاوپەیمانیەتی لەگەڵی پێیان دەدات، مەلیک (الجواد)یش توانی خاچییەکان ڕازی بکات بۆ ئەوەی کۆبوونەوە لەگەڵ مەلیک (الصالح نجم الدين) لەلایەک و لەلایەکی تر داوای لە (الصالح نجم الدين) کە نوێنەری بنێرێ تاکو دەست بە کۆبوونەوە بکەن، هەروەها خۆشی دەستی کرد بە کۆڕ و کۆبوونەوە لەگەڵ گەورەی خاچییەکان، دوای ئەوەی مەلیک (الصالح نجم الدين) زانی تاکو ڕادەیەکی باش پیلانەکەی سەرکەوتوو بووە نوێنەرێکی خۆی نارد بۆ (غزة) بەناوی (ركن الدين الهيجاوي) لە هەمان کات نامەی نارد بۆ مەلیک (الجواد) داوای لێکرد کە بچێ بۆ لای نوێنەرەکەی لە (غزة)، داواشی لە نوێنەرەکەی (ركن الدين الهيجاوي) کرد کاتێک مەلیک (الجواد) دێت بۆ لای ڕاستەوخۆ دەستگیری بکات بینێرێ بۆ (مصر)، هۆکاری پیلانگێڕییەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ئەو شکستەی کە پێشتر

لەسەر دەستی مەلیک (الجواد) بەری کەوتبوو کە باسمان کرد پیلانەکەی لە کۆتاییدا شکستی هێنا، چونکە (رکن الدین الهیجاوی) نەک هەر مەلیک (الجواد)ی دەستگیر نەکرد بەڵکو تەواوی پیلانەکەی بۆ ئاشکرا کرد (النویری، ٢٠٠٤، ١٦١/٢٩) مەلیک (الجواد) چووە (عکا) پەیوەندی کردەوە بە خاچییەکان (ابن خلدون، ٤١١/١٩٨٨،٥) (رکن الدین الهیجاوی)یش پەیوەندی کرد بە (الصالح اسماعیل) لە (دیمشق) کە نەیاری (الصالح نجم الدین) بوو. (النویری، ٢٠٠٤، ١٦١/٢٩).

**حەوتەم/ پەیوەندیی مەلیک (الجواد) لەگەڵ (الصالح اسماعیل)ی مامی:**

مەلیک (الصالح اسماعیل) نامەیەکی بۆ مەلیک (الجواد) نارد دەستی کرد بە سەرزەنشتکردنی بەهۆی ئەوەی پەیوەندی بە خاچییەکانەوە کردووە داواشی لێکرد بە زووترین کات بگەڕێتەوە بۆ (دیمشق)، لە هەمان کات نامەیەکی تری نووسی بۆ خاچییەکان داوای لێکردن کە پاڵپشتی و یارمەتی بدەن لە دژی (الصالح نجم الدین)ی برازای لە (مصر)، هەروەها پێشی ڕاگەیاندن ئەگەر بێت و (مصر) بەدەست بهێنێ ئەوا لە بەرامبەردا ناوچە کەناریەکانی ولاتی (الشام)تان پێدەبەخشم هەر ئەوەندەش نا بەڵکو هەموو ئەو ناوچانەتان بۆ دەگەڕێنمەوە کە کاتی خۆی سوڵتان سەلاحەدینی ئەیوبی کە فەتحی کردووە بەرامبەر بەوە یارمەتیم بدەن لە دەست بەسەرداگرتنی (مصر)دا، خاچییەکان سەبارەت بەم داواکارییە ڕاویژیان بە مەلیک (الجواد) کرد ئەویش لەوەڵامدا پێی ڕاگەیاندن کە زۆر ئاگاداری (الصالح اسماعیل) بن هەروەها ناڕازی بوونی خۆی نیشاندا لەسەر ئەم کارە (النویری، ٢٠٠٤، ١٦١/٢٩-١٦٢).

مەلیک (الصالح اسماعیل) هەستا بەدانانی پیلانێک بۆ دەستگیرکردنی مەلیک (الجواد) ئەویش بەناردنی یەکێک لە ئەمیرەکانی خۆی بەناوی (ناصرالدین ابن یغمور) بۆ لای مەلیک (الجواد) پێی ڕاگەیاند کاتێک دەگاتە لای مەلیک (الجواد) دەستگیری بکات، کاتێک (ناصرالدین ابن یغمور) دەگاتە لای مەلیک (الجواد) پێی دەڵێت با پێکەوە ڕێک بکەوین بۆ لابردنی مەلیک (صالح اسماعیل) لە دەسەلاتداری (دیمشق) توانی بەو پیلانە ڕازی بکات بەمەش سەرکەوتن لە دەستگیرکردنی مەلیک (الجواد) (الذهبی، ١٩٩٣، ٤٠٠/١٤؛ الصفدی، ٢٠٠٠، ١٨٧/٢٩) لە

ماڵێک دەستگیری دەکات دەیهێنێت بۆ (دیمشق) (النویری، ٢٠٠٤، ١٦٢/٢٩) هەندێ سەرچاوەکانی تر باس لەوە دەکەن کە مەلیک (الصالح اسماعیل) لە ڕێگای پێدانی پارەو سەروەت و سامانەوە توانی خاچییەکان ڕازی بکات مەلیک (الجواد)ی ڕادەست بکەن (العمري ،١٤٢٣هـ، ٢٦٥/٤؛ محمد کرد علی ،١٩٨٣، ٣١٩/٢٧-٣٢٠) مەلیک (الصالح اسماعیل) هەڵدەستێ بە بەندکردنی مەلیک (الجواد) لە قەڵای (عزتا)، قەڵایەکە نزیك شاری (دیمشق) لەسەر ڕووباری (بردی) (الیونیني،١٩٩٢، ٤٣٢/٣) لەلایەکی تر خاچییەکان زۆر بەتوندی داوای گەڕانەوەی مەلیک (الجواد)یان لە مەلیک (الصالح اسماعیل) دەکرد (الذهبی، ١٩٩٣ ،٤٠٠/١٤؛ زکار، د.ت، ص٨١٤) بەڵام مەلیک (الجواد) هەر لە بەندیخانە لە ساڵی (٦٤١ک/١٢٤٣ز) کۆچی دوایی دەکات کە گومانی زۆر لەسەر کوشتنەکەی هەیە مەلیک (الصالح اسماعیل)یش وای نیشانداوە کە خۆی کۆچی دوایی کردووە بەڵام، خزم و کەسەکانی دەڵێن خنکێندراوە (النویری، ٢٠٠٤ ، ١٦٢/٢٩) هەروەها هەر سەبارەت بە خنکاندنەکەی باس لەوە دەکەن کاتێک مەلیک (الصالح اسماعیل)ی مامی خنکاندوویەتی بەجێی هێشتووە وای زانیوە کە مردووە، بەڵام لەوکاتەدا ئافرەتێک بەوێدا تێپەڕ دەبێت تەماشای دەکات دەبینێت کە مەلیک (الجواد) هێشتا زیندووە بۆیە بە خێرایی هەواڵیان دەداتێ کە ئەو پیاوە نەمردووە و زیندووە مەلیک (الصالح اسماعیل)ی مامی دەگەڕێتەوە لای و ئەم جارەیان دەست دەکاتەوە بە خنکاندنەوەی تاکو بە تەواوی کۆچی دوایی دەکات (المقریزی، ١٩٩٧، ٤٧١/١). لە شوێنێک بە ناوی (قاسیون) بە خاک دەسپێررێ (الذهبی، ١٩٨٥ ،١٨٥/٢٣ ؛ النعیمی،١٩٩٠، ١/ص٤٤٦).

**ئەنجام**

لەم توێژینەوەیە چەندین ئەنجامامان بۆ دەرکەوت کە لەم خاڵانەی خوارەوە دەیانخەینە ڕوو:

١- مەلیک (الجواد) بە هۆی دەست بڵاوی و خۆشەویستی زۆری بۆ سەروەت و سامان وای کردووە کە بەڕێوەبردنی ئەو شارانەی کە لە ژێر دەسەڵاتیدا بووە پشتگوێی بخات و نەتوانێ بە شێوەیەکی باش و دادپەروەرانە حوکمی شارەکانی (دیمشق) و (عانة) و (سنجار) بکات.

٢- پەنابردنە بەر شەڕو ململانێ بۆ یەکلاییکردنەوەی زۆربەی کێشەکانی لەگەڵ مەلیك و میرەکانی دراوسێی ئەمەش بووە هۆی لاوازکردنی لە ڕووی سەربازی و سیاسییەوە، وەك دەبینین پاش وەرگرتنی دەسەڵاتی شاری (دیمشق) ڕاستەوخۆ کەوتە شەڕەوە لەگەڵ ئامۆزاکەی مەلیك (ناصر داود) ڕاستە لە شەڕی یەکەمدا بووە هۆی بەهێزبوونی، بەڵام لە دواتردا پاش ئەوەی هەموو شارەکانی لەدەست دا بەهۆی نەبوونی هیچ دۆستێك بەناچاری پەنا دەباتە بەر (ناصر داود)، ئەویش پاش بەکارهێنانی بۆ بەرژەوەندیی خۆی مەلیك (الجواد) دەستگیر دەکات" هەروەها شەڕو ململانێی لەگەڵ (بدرالدين لؤلؤ) و مەلیك (الصالح نجم الدين) و مەلیك (العادل) بە هەمان شێوە بووە هۆی لاوازکردنی.

٣- پەنابرنە بەر بێگانە و دوژمنانی دەوڵەت بۆ یەکلاییکردنەوەی کێشە ناوخۆیەکان، یەکێک بووە لە خاڵە لاوازەکانی مەلیکەکانی دەوڵەتی ئەیوبی، بەتایبەتی ئەو مەلیکانەی دوای مەلیک (العادل)ی برای سەلاحەدین هاتن، نموونە زۆرن وەک مەلیک (الجواد) پەنای بردۆتە لای خەوارزمییەکان دواتریش خاچییەکان.

٤- مەلیک (الجواد) زیاتر گرنگی بە خۆشگوزەرانیی خۆی دەدا وەک زۆر گرنگیدانی بە ڕاوکردن ئەمەش وای کردبوو ئاگاداری کێشەی خەڵکی و بەڕێوەبردنی شارەکان نەبێت، هەروەها وەک خاڵێکی لاواز لە لایەن دوژمنانیەوە سوودی لێ وەرگیراوە، وەک دەرچوونی بۆ ڕاوکردن لە شاری (سنجار) بووە هۆی لەدەستدانی

شارەکە، چونکە (بدرالدين لؤلؤ) ئەم هەلەی قۆستەوە و تـوانی  لە ئەنجـامی نەبـوونی ئەو لە شارەکە دەست بەسەریدا بگرێ.

٥ - دانانی خەڵکی خراپ لە بەڕێوەبردنی شـارەکان خـاڵێکی لاوازی تـری ئەم مەلـیکە ئەیـوبییە کـوردییە بـووە، وەک دانـانی کەسـێک بەنـاوی (الناصـح) لە بەڕێـوەبردنی شـاری (دیمشـق) کە دەسـتی بەسـەر پـارە و پـوولێکی زۆری خەڵکیـدا گرت و بۆ بەرژوەندیی خۆی بەکاری هێنا، هەرروەها خۆشی دەستی بەسـەر سـەرووەت و سامانێکی زۆردا گرت ئەمەش بووە هـۆی ئەوەی لەو کـاتەی کە شـاری (دیمشـق) بەجێ دەهێڵێ خەڵکی شار لە دەرگـای شـارەکە کـۆ ببـنەوە قسـە و جـوێنی نـاشرینی پێبڵێن.

٦- لاوازیی مەلیك (الجـواد) لـە ڕووی سیاسـی هۆکـارێکی سـەرەکی بـووە بـۆ ئەوەی دەسەڵاتی بەرەو لاوازی بڕوات، وەك دەبینین کاتێك لەگەڵ (بدرالـدين لؤلـؤ) خاوەنی (موصـل) دەکەوێتـە ململانێـی سیاسـییەوە لەسـەر شـاری (سـنجار)، بـەهۆی گرتنەبەری سیاسەتی لاواز زۆر بەئاسانی شارەکەی لەدەست دا.

**لیستی سەرچاوەکان**

**یەکەم/ سەرچاوە ڕەسەنەکان بە زمانی عەرەبی:**

**إبن الاثير**، ابو الحسن عزالدين علي بن ابي الكرم محمد بن محمد بن عبدالكريم بن عبدالواحد الشيباني الجزري (٦٣٠ هـ /١٢٣٣ م)

١- ١٩٩٧م، الكامل في التاريخ، تحقيق: عمر عبدالسلام تدمرى، دار الكتاب العربى، ط ١، بيروت.

**بدر الدين العينى**، محمود بن احمد بن موسى الحنفي (٨٥٥ هـ /١٤٥١م)

٢- ١٩٨٧م، عقد الجمان في تاريخ اهل الزمان، تحقيق: محمد محمدامين، الهيئة المصرية العامة للكتاب، القاهرة.

**بيبرس المنصوري الدوادار**، الامير ركن الدين (٧٢٥ هـ /١٣٢٥ م)

٣- ١٩٩٣م، مختار الاخبار تاريخ دولة الايوبية ودولة المماليک البحرية، تحقيق: عبدالحميد صالح حمدان، دار مصرية اللبنانية، ط ١، القاهرة.

**إبن تغرى بردى**، جمال الدين ابو المحاسن يوسف (٨٧٤ هـ / ١٤٧٠م)

٤- د. ت، المنهل الصافي والمستوفي بعد الوافي، تحقيق: محمد محمدامين، الهيئة المصرية العامة للكتاب، القاهرة.

٥- د. ت، مورد اللطافة من ولي السلطنة والخلافة، تحقيق: نبيل محمد عبدالعزيز، دار الكتب المصرية، القاهرة.

٦- د. ت، النجوم الزاهرة في ملوک مصر والقاهرة، دار الكتب، القاهرة.

**إبن الجزري**، شمس الدين أبى عبدالله محمد بن إبراهيم بن أبى بكر (٧٣٨ هـ/١٣٣٥م)

٧- ١٩٩٨م، تاريخ حوادث الزمان وانبائه و وفيات الاكابر والاعيان من أبنائه (المعروف بتاريخ إبن الجزري)، تحقيق: عمر عبدالسلام تدمري، المكتبة العصريه، ط ١، بيروت.

**ياقوت الحموي**، شهاب الدين بن عبدالله الرومي (٦٢٦ هـ / ١٢٢٩ م)

٨- ١٩٩٥م، معجم البلدان، دار الصادر، ط٣، بيروت.

**إبن نظيف الحموي**، ابو الفضائل محمد بن علي (٦٤٤ هـ / ١٢٤٦ م)

٩- د. ت، تلخيص الكشف والبيان في حوادث الزمان المعروف (بالتاريخ المنصوري)، تحقيق: ابو العبد دودو، مطبعة الحجاز، دمشق.

**الحنبلي**، احمد بن إبراهيم (٨٧٦ هـ / ١٤٧١م)

١٠- ١٩٧٨م، شفاء القلوب فى مناقب بني ايوب، تحقيق : ناظم رشيد شێخۆ، دار الحرية، بغداد.

**إبن خلدون**، عبد الرحمن بن محمد بن محمد (٨٠٨ هـ / ١٤٠٦م)

